# چل چیرۆك

## پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆمانی دەگێڕێتەوە

لەگەڵ سەدان
پەندو ئامۆژگاریەکانیان و
بە دراماکردنی چیرۆکەکان



نووسینی
عمر توفیق الخطاط

# چل چیرۆك

## پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆمانی دەگێڕێتەوە

## لەگەڵ سەدان

## پەندو ئامۆژگاریەکانیان و

## بە دراماکردنی چیرۆکەکان

نووسینی

عمر توفیق الخطاط

## پێشەکی

الحمد لله الذي خالق كل شيء وبارئها، والصلاة والسلام على محمد نبيُّ الأمة ومُعَلمها، وعلى آله الطّيبين وصحبه المخلصين الميامين ومن تبع هداه وخطا خطاهُ الى يوم الدين..

لە سەرەتای ئەم کتێبەوە کە نوسیومە ئاماژە بە سێ شت دەکەم کە زۆر گرنگە خوێنەرانی ئەم کتێبە لێی ئاگادار بن پێش ئەوەی بچنە ناو گوڵزاری چیرۆکەکانیەوە:

یەکەم: بۆ ئەم کتێبەم نووسی؟ ئەم پرسیارە وەڵامی زۆر هەڵدەگرێت، لەوانە: نەبوونی نوسینێکی ئا لەم چەشنە لە زمانی کوردیماندا و بە پێنووسی مامۆستایان و خوێندەوارانی کورد نووسرابێت.

هەروەها دەبووایە یەکێك لەم بابەتەی بنووسیایە کە خۆی توانای چیرك نووسینی هەبێت و لە بواری هونەری دراما دا کاری کردبێت یان لە بواری دەرهێناندا شارەزایی هەبێت و کاری کردبێت.

دەی سوپاس بۆ خوا من لە سەرەتای نەوەدەکانەوە چیرۆکی تەلەفزیۆنی و ڕادیۆیی و شانۆگەری و فیلمی سینەماییم نووسیووە و لە ساڵی ١٩٩٣دا لە شاری هەڵەبجەی شەهید شانۆگەری ((چارەسەری تاوان)) لە هۆڵی احمد مختار پێشکەش کرا کە لە نووسین و دەرهێنانی خۆم بوو..

دووەم: چۆنیەتی نووسینی ئەم کتێبەم چۆنە؟ ئەم کتێبە بیرۆکەکەی چەند ساڵێکە لە مێشکمدایە و ئاواتم ئەوە بووە خوای گەورە یارمەتیم بدات و بتوانم بە شێوەیەکی هونەری جوان دای بڕێژم.

سەرەتا هەر چیرۆکێك (صحیح) نەبووایە و (بخاری و مسلم) ڕیوایەتیان نەکردبێت نەمهێناوە مەگەر هەندێك حاڵەت کە شێخ ئەلبانی بە صحیح دایناببێت.

فەرموودەکـــەم بـــە عەرەبیەکـــەی وەك خـــۆی داناوەتـــەوە پاشـــان ڕاســـتەوخۆ وەرمگێڕاوەتەوە سەر زمانی کوردیەکی پاراو بە زمانی هەڵبجەیی ڕەسـەن کـە لـە زمـانی ستانداری نووسینی کوردیەوە نزیکە.

پاشان هەستاوم ئەو چیرۆکەم داڕشتۆتەوەو پاڵەوانەکانی ناو چیرۆکەکەم ناونـاوەو بـە درێـژی حیـوارم بـۆ دانـاونو ئەوپـەڕی هـەوڵم داوە شـتێك زیـاد نەکـەم بـۆی کـە نەچـێتە عەقڵەوە یان پێچەوانەی فەرموودەیەکی صحیح یان ئایەتە پیرۆزەکانی قورئان بێت.

من هەستاوم بە شێوەیەکی دوورو درێژ چیرۆکەکەم داڕشتۆتەوە ئەمەش بۆ ئەوەی کـە خوێنەر بە تەواوی لەو چیرۆکە تێ بگاتو چێژی لێ وەربگرێـتو ئەگـەر خـوای گـەورەیش کۆمەڵی لاوی هونەرمەندی بۆ ڕەخساند، تا بتوانن بە ئاسانی نمایـشی بکـەنو پێـشکەشی ئەم بەرە ئیسلامیەی کوردستانی بکەن ئەوە زۆر باشە..

خەڵکی بە گشتی حەزیان لە چیرۆکە.. چیرۆك لە ناو بـیرو هۆشـدا دەمێنێتـەوەو پـاش چەند ساڵێك مرۆڤ دەتوانێت وەك خۆی بیگێڕێتەوە بەڵام وتـارو کـۆڕە جۆراوجۆرەکـان لـە بیر دەچنەوە..

من ئەمەم بە چاوی خۆم دەبینی لە ساڵەکانی سەرەتای نەوەدەکانی سەدەی پێشوودا ڕابوونی ئیسلامی بە هەموو تەوژمەکانیانەوە چـالاکی جۆراوجۆریـان پێـشکەش دەکـرد لـە کۆڕگرتنو شانۆگەریو ئاهەنگو کۆنسێرتو بۆنەکانو کۆڕی شیعریو چیرۆك.

لە بیرمە کۆڕمان دەگرت لە هۆڵی احمد مختـار لـە هەڵبجـە (٥٠) تـا (١٠٠) کـەس زیـاتر ئامادە نەدەبوو..

بەڵام هەر کە شانۆگەریەکمان پێشکەش دەکرد هۆڵەکە پڕ دەبوو تا وای لێ دەهـات لـە بەردەمی تەختی شانۆکەشدا فەرشمان دادەخست چونکە کورسییەکان پڕ دەبوونو جێگە نەدەما..

ئەمە شتێکی سروشتییە کە مرۆڤەکان حەزیان لە چیرۆکەو چیرۆك کاریان تێدەکات..

بۆیە قورئانی پیرۆز پانتاییەکی زۆری ئایەتەکانی تەرخان کردووە بۆ چیرۆکی پێغەمبەران‌و ئوممەتەکانی پێش ئیسلام تا هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) دەرسی لێ وەربگرن‌و بیکەنە سەرمەشق لە ژیانی ڕۆژانەیاندا..

من لە ساڵی ٩٧ـ٩٨دا کتێبی چیرۆکە قورئانیەکانم نووسی‌و بە درێژی کردم بە دراماو ئامادەبوو بۆ نمایشکردن بەڵام لە زروفێکی ناڕەحەتدا هەمووی سوتێنراو یەکێك لە غەمەکانی من فەوتانی ئەو بەرهەمە بوو..

بۆیە وا ئەمجارە حەزم کرد ئەو چیرۆکانە کۆ بکەمەوەو بە درێژی دای بڕێژم کە پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) زۆر بە کورتی بۆ هاوەڵانی گێڕاوەتەوەو ئەمەش بۆ پێغەمبەر (ﷺ) شتێکی زۆر جوانە چونکە خاوەنی (جوامع الكلم) ووە.. پێغەمبەرمان (ﷺ) چیرۆك خوان نەبوە حەکەواتی‌و حیکایەتخوان نەبوە..

بەڵکو پیاوێکی مەزن بوەو پەیامی خوای دەگەیاندە مرۆڤەکان بۆیە نەیدەپەرژا دابنیشێت‌و بە درێژایی ڕۆژ چیرۆکی دوورودرێژ بۆ هاوەڵان باس بکات‌و کاتەکانی بە گەیاندنی پەیامی ئیسلامی مەزنەوە بەسەر دەبرد..

لە کەناڵی سپێدەی ئاسمانیدا زنجیرە درامای ((گەردنم ئازاد بکە)) نمایش کرا کە چیرۆکەکە لە تورکیەوە دۆبلاژ کراوە، و باسی گەنجێك دەکات کاتی خۆی تاوانی زۆری کردوەو ئێستا گەڕاوەتەوە بۆ لای خواو تەوبەی کردووە.

دەیەوێت یەك یەك ئەو کەسانە ببینێت کە تاوانی بەرامبەر کردوون بۆ ئەوەی داوای گەردن ئازادییان لێ بکات.

ئەم درامایە کاری کردبوە سەر برایەکی موسڵمان کە کاتی خۆی مۆبایلێکی لە هاوڕێیەکی دزیبو.. کە (مرادیڵمان)ی دیبو.. ئەویش بیری مۆبایلەکەی کەوتبویەوە.. بۆیە (٢٠٠٠٠) هەزاری خستبوە ناو زەرفێکی نامەو لەگەڵ نامەیەکدا ناردیەوە بۆ هاوڕێکەی‌و نوسیبوی من مۆبایلەکەی تۆم بردو ئەو کاتە پارەم پێویست بو ئەوە پارەکەیەتی‌و گەردنم ئازاد بکە..

سێیەم: لەگەڵ هەموو چیرۆکێکدا هەستاوم بە نوسینی کۆمەڵێك پەندو ئامۆژگاریو وانە کە خوێنەر زیاتر سود لە چیرۆکەکان وەردەگرێت.

هەموو چیرۆکێك کە نوسیومە.. لە خۆمم پرسیوە: ئایا پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆچی ئەم چیرۆکەی باس کردوە؟ مەبەستی بوە چ پەیامێك بگەیەنێتو چ وانەیەك فێری هاوەڵە شیرینەکانی بکات.. ئیتر خوای گەورە مێشكو فیکرمی دەکردەوەو کۆمەڵێکی زۆر پەندو وانەم لێ وەردەگرت..

داواکارم لە خوێنەرانی خۆشەویستم کە هەر چیرۆکێك دەخوێننەوە، بە دوایدا ئەو پەندو ئامۆژگاریانە فەرامۆش نەکەنو بیخوێننەوەو چونکە ئەو خاڵانە هەنگوینە گوشراوەکەیەتیو چیرۆکەکانی زیاتر مانابەخشتر دەکاتو چێژیان پێ دەدات.

لە کۆتاییدا داواکارم لە خوای گەورە ئەم کارەم لێ وەربگرێتو بیکاتە جێگەی ڕەزامەندی سەرجەم خوێنەرانو ببێتە هۆکارێکی باشو کاریگەر لە ژیانیانداو باشانیش بیگێڕنەوە لەناو کۆڕو کۆمەڵدا چونکە چونکە ئەم چیرۆکانە داڕێژراوی خەیاڵ نینو ڕاستینو لە مێژودا ڕوی داوە کەسێکیش دەیگێڕتەوە کە سەرداری پێغەمبەرانە محمد (ﷺ)و خوای باڵادەستیش لە ڕێگای نیگاوە خستویەتیە دڵیەوەو ئەویش بۆ ئومەتەکەی گێڕاوەتەوە.

لە کۆتاییدا ئەمەوێت ئەوە بڵێم بە خوێنەرانی ئەم چیرۆکانە کە هەموویان فیکرەکانیان لە پێغەمبەری خواوەیە (ﷺ) لە ڕێگەی نیگاوەو داڕشتنەوەی بە شێوەیەکی ئەدەبیو هونەری لە لایەن منەوەیەو منیش ئەوپەڕی هەوڵم داوە لە تەفسیرو ماناکردنەکانی زانایانی ئیسلامەوە سود وەربگرم بۆ درێژکردنەوەی چیرۆکەکانو هەندێك ڕوداویشی خۆم لە داڕشتنی خەیاڵی خۆمەوەو مەبەستم ئەوە بوە کە چیرۆکەکە بچێتە قاڵبی نواندنەوە.

منیش تا لە ژیاندام ئاواتم ئەوەیە کۆمەڵێك ئەکتەری بە توانا هەستن بە نمایشکردنی لە چەند زنجیرە چیرۆکێکداو ئەو کاتە خۆیشم ئامادەم لە دەرهێنانەکەیدا هاوکاریان بکەمو ئەگەر پێویستیش بکات خۆیشم ڕۆڵی تێدا دەبینم زۆر بە شانازیەوە.

من ئامۆژگاریم بۆ وتاربێژو کۆڕگرەکان‌و ئەوانەشی بەرنامەی تەلەفزیۆنی هەیە با پشت ببەستن بە گێڕانەوەی چیرۆك.. چونکە چیرۆك وەك نوسینی سەر بەرد لە ناو دڵدا هەڵدەکۆڵرێت‌و لە بیر ناچێتەوە..

خوای (عز وجل)یش لەم بارەیەوە بە پێغەمبەرەکەی دەفەرمووێت: ﴿فَٱقۡصُصِ ٱلۡقَصَصَ لَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ﴾[1] واتە: چیرۆکیان بۆ بگێڕەوەو بەڵکو لە ڕێگەی ئەو چیرۆکانە بیروهۆش بخەنە کارو موسڵمان ببن.

سەیر نەبێت بە لاتەوە کە من بیرم کردۆتەوە لەم لایەنەوە بنوسم‌و چیرۆك دابڕێژم چونکە زۆر بە سودە بۆ بەردەوامی‌و ڕاوەستان لەسەر بیروباوەڕی پاکی ئیسلامەتی‌و ئامۆژگاریشە بۆ یەکەیەکەی موسڵمانان وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَكُلًّا نَّقُصُّ عَلَيۡكَ مِنۡ أَنۢبَآءِ ٱلرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِۦ فُؤَادَكَۚ وَجَآءَكَ فِي هَٰذِهِ ٱلۡحَقُّ وَمَوۡعِظَةٞ وَذِكۡرَىٰ لِلۡمُؤۡمِنِينَ ١٢٠﴾[2].

((والله من وراء القصد))

نوسەر عمر توفیق الخطاط

هەڵەبجەی شەهید

٢٠١١/١/٣

١ الاعراف (١٧٦).

٢ هود (١٢٠).

## القصة الاولى

## نجح الأعمى

عن ابي هريرة (رضي الله عنه) انه سمع النبي (ﷺ) يقول: ((ان ثلاثة من نبي اسرائيل: ابرص واقرع واعمى، اراد الله ان يبتليهم فبعث اليهم مَلَكاً، فاتى الأبرص فقال: ايّ شيء أحب اليك؟

قال: لون حسن، وجلد حسن، ويذهب عني الذي قد قذرني الناس، فَمَسَحهُ، فذهب عنه قذره واعطى لوناً حسناً.

قال: فأيّ المال احب إليك؟ قال: الابل، او قال: البقر -شك- من الراوي- فاعطي الناقة عشراء، فقال: بارك الله لك فيها.

فأتى الأقرع فقال: أي شيء أحب اليك؟ قال: شعر حسن، ويذهب عني هذا الذي قذرني الناس، فمسحه، فذهب عنه واعطي شعراً حسناً، قال: اي المال احب اليك؟ قال: البقر، فاعطي بقرة حاملاً، وقال بارك الله لك فيها.

فأتى الأعمى فقال: اي شيء احب إليك؟ قال: ان يرد الله الي بصري فابصرُ الناس، فمسحه فرد الله إليه بصره وقال: أيّ المال احب اليك؟ قال: الغنم، فاعطي شاةً والداً فانتج هذان وولد هذا.

فكان لهذا وادٍ من الابل، ولها واد من البقر، ولهذا وادٍ من الغنم.

ثم انه آتى الأبرص في صورته وهيئته، فقال: رجل مسكين قد إنقطعت بي الحبال في سفري، فلا بلاغ لي اليوم الاّ بالله ثم بك، اسألك بالله الذي أعطاك اللون الحسن والجلد الحسن والمال، بعيراً ابتلغ به في سفري، فقال: الحقوق كثيرة.

فقال: كأني اعرفك الم تكن ابرص يقذرك الناس، فقيراً، فاعطاك الله؟

فقال: انما ورثت هذا المال كابراً عن كابر، فقال: إن كنتَ كاذباً فصيرك الله الى ما كنت.

واتى الأقرع في صورته وهيئته، فقال: له مثل ما قال لهذا، وردّ عليه مثل مارد هذا، فقال: ان كنت كاذباً فصيرك الله الى ما كنت.

واتى الأعمى في صورته وهيئته، فقال: رجل مسكين وابن سبيل انقطعت بي الحبال، في سفري، فلا بلاغ لي اليوم الاّ بالله ثم بك، اسالك بالذي رد عليك بصرك شاة اتبلغ في سفري فقال: قد كنت أعمى فردّ الله اليّ بصري، فخذ ما شئت ودع ما شئت فوالله ما أجهدك اليوم بشيءٍ اخذته لله عز وجلَّ، فقال: أمسك مالك فانما ابتليتم فقد رضي الله عنك، وسخط على صاحبيك)).[1]

واتە: ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەیفەرموو: لەناو بەنی ئیسرائیلیەکاندا سێ کەس هەبوون یەکێکیان نەخۆشی بەڵەکی لەگەڵدا بوو، دوەمیان کەچەڵ بوو، سێیەمیان نابینا بوو.

خوای گەورە ویستی تاقییان بکاتەوە -تا بزانێت کامیان بە سەبرو ئارامنو شوکری خوای لەسەر دەکەن- سەرەتا چو بۆ سەردانی ئەو کەسەیان کە پێستی شێوابو، هەموو لەشی پەڵەپەڵەی سپی تێ کەوتبو -فریشتەیەکی بۆ ناردن لە شێوەی مرۆڤێکی هەژارداو چو بۆ لای کەسی یەکەمو پێی وت: خۆشترین حەزو ئارەزوت چیە؟ ئەویش وتی: ڕەنگێکی جوانو پێستێکی جوانو ئەو نەخۆشیەم نەمێنێت کە بە هۆیەوە خەڵکی قێزم لێ دەکەنەوە.

فریشتەکە دەستێکی پێدا هێناو بە ویستی خوا -پیاوەکە خۆشی بویەوەو هیچ قێزەونیەکی پێوە نەماو ڕەنگێکی جوانی پێ بەخشرا، پاشان پیاوەکە پێی وت: لە سامانی دنیا زیاتر حەزت لە چییە؟ کابرا وتی: حوشتر (لە ڕیوایەتێکدا) دەڵێ مانگا- حوشترێکی ئاوسی پێ بەخشراو پێی وت: خوای گەورە فەڕو بەرەکەت بخاتە ئەم حوشترەتەوە..

دواتر چو بۆ سەردانی کابرای بێ مو (کەچەڵ)و بە هەمان شێوە بەویشی وت: حەزو ئارەزوت لە ژیاندا چییە؟ ئەویش لە وەڵامدا وتی: قژێکی جوانم هەبێتو ئەم کەچەڵیەم

---

١ فەرموودەکە (متفق علیه)ە، لە ریاض الصالحین، لاپەڕە (٣٠) ژمارە (٦٦) دا هاتووە.

نەمێنێت کە خەڵکی قێزو بێزم لێ دەکەنەوە، فریشتەکە بە هەمان شێوە دەستێکی هێنا بە سەری ئەمیشداو هەر لەوێدا خۆش بویەوەو بو بە خاوەنی قژێکی جوانو کەشخە، — لە خۆشیاندا هەر دەستی پێدا دەهێنا—و پاشان فریشتەکە لێی پرسی: ئەیَ لە ماڵو سامانی دنیا حەزت لە چییە؟ وتی: هیوایەتم ئەوەیە مانگام هەبێتو خوایش (عز وجل) مانگایەکی ئاوسی پێ بەخشیو فریشتەکە دوعایەکی خێرو بەرەکەتی بۆ کردو ڕۆیشت بەجێی هێشت.

دواتر چو بۆ سەردانی پیاوە نابیناکە کە هەردوو چاوی کوێر بوو لێی پرسی: براکەم ئایا تۆ حەزت لە چییە زیاتر لە هەموو شتێك؟ نابیناکە وتی: خوای گەورە ئەم دوو چاوەی پێ ببەخشیمایەتەوەو خەڵکیم پێ ببینیایە، فریشتەکە دەستێکی هێنا بە چاوەکانیداو خوای گەورە هەردوو چاوەکەی چاککردەوەو پاشان لێی پرسی: ئەوا خوا هەردوو چاوی بۆ گێڕایتەوە ئەی پێم بڵێ چ شتێك حەز لێ دەکەیت لە سامانی دنیا داوای بکە؟ کابرا وتی: مەڕ، و مەڕێکی ئاوسی پێ بەخشراو پاشان حوشترەکەو مانگاکەو مەڕەکە بەچکەیان بوو —بە مروری زەمەن— زۆر بونو بون بە ڕانو گاگەل، هەریەکەیان ماڵەکەی بو بە پڕی دۆڵێك.

پاش چەند ساڵێك خوای گەورە لە شێوەی هەمان مرۆڤدا فریشتەکەی ناردەوە بۆ لایانو سەرەتا چوەوە لای کابراکەی کە نەخۆشی پێستی لەگەڵدا بو (لە شێوەی پیاوێکی هەژارو سواڵکەردا) چوە ڕێگەیو پێی وت: پیاوێکی هەژارمو لە سەفەردامو دەستم لە هەمو شتێك بڕاوەو هیچ پەنایەکم نییە جگە لە خواو پاشان دەستگرۆیی تۆ، بۆیە داوات لێ دەکەم تۆو ئەو خوایەی ئەم ڕەنگە جوانو پێستە جوانەی پێ بەخشیوی و کردویتی بە خاوەنی دارایی، یەك حوشترم بدەریَ تا بتوانم لەم سەفەرەمدا سواری بمو بمگەیەنێتە شوێنی خۆم.

کابرای —نەگبەت— بە فیزێکەوە وتی: داوای لێبوردن دەکەم مافداری زۆرم بە سەرەوەیەو ناتوانم حوشترت پێ بدەم.

فریشتەکەش –لە شێوەی پیاوێکی جل شڕی هەژاردا بوو–: سەیرێکی کردو لێی ورد بویەوەو وتی: ئەلێی وێنات دەکەمو ئەتناسمەوە، ئەرێ تۆ ئەو کەسە نەبویت کە نەخۆشی گولیت لەگەڵدا بوو خەڵکی نزیکت نەدەبونەوەو قێزیان لێ دەکریتەوەو داماوێکی هەژار نەبوی خوای گەورە دەوڵەمەندی کردیتو کردیتی بە خاوەنی ئەم هەموە حوشترە؟

بە کەشخەیەکەوە وتی: ئەرێ کابرا تۆ دەڵێی وڕێنە دەکەیت، هەژاری چیو هیچی چی من هەر لە باوباپیرانمەوە دەوڵەمەند بووینو لەوانەوە بۆم ماوەتەوە.

فریشتەکەش هەناسەیەکی بۆ هەڵکێشاو پێی وت: دەی هەر حوشترم مەدەرێو نامەوێ منەتت نەبێت بەڵام ئەگەر درۆ بکەیت خوای گەورە بتکاتەوە بە هەژارو گولەکەی جاران ان شاء الله، ئەمەی وتو لێی داو ڕۆیشت.

خوایش قڕی خستە ناو حوشترەکانو هەمووی لەناو بردو لێی سەندەوەو خۆیشی وەك جاران توشی هەمان نەخۆشی کردەوە.

پاشان بە هەمان شێوە چوو بۆ ماڵی پیاوە کەچەڵەکەی جارانو دەبینێ دەوڵەمەند بوەو حیسابی مانگاو سامانی خۆی نازانێتو قژێکی ڕەشی جوانی خاوی شۆڕ کردۆتەوە بەملاولای شانیداو لەناو خزمەتکارەکانیدا بە کەشخەیەکەوە دانیشتبو.

لێی نزیك بویەوەو سڵاوی لێ کردو هەمان داواکاری پێشوی لەمیش کردەوەو ئەمیش (داماوە) لە تاقیکردنەوەکەدا دەرنەچو هەمان وەڵامی ڕەقو وشکی پیاوی یەکەمی دایەوە.

فریشتەکەی خوایش پێی وت: ئەگەر درۆت کردو وا نەبو ئەوە خوای مەزن وەك جاران کەچەڵت بکاتەوەو داماوو هەژاریشت بکاتەوەو پاش ماوەیەك بەو جۆرەی لێ هاتەوە.

ئەم جارەو بە هەمان جلوبەرگو شێوە هەژارییەوە چو بۆ لای کابرای نابیناکەی جارانو پاش سڵاوکردن بە پاڕانەوەو دەست پان کردنەوەوە پێی وت:

پیاوێکی هەژارو دەست کورتم، ڕێبوارێکمو ڕێگاکەم دورەو دەستم لە هەموو لایەك بچڕاوەو لە دوای خوا ئومێدم تۆی کە دەستگرۆییەکم بکەیتو داوات لێ دەکەم تۆو ئەو

خوایەی کە چاوەکانی چاك کردیتەوە مەڕێکم پیٚ بدە تا بتوانم بە هۆیەوە بگەمەوە ناو کەس‌و کارو شوێنی خۆم.

پیاوەکەش چاوەکانی پڕ بون لە ئاوو فرمێسك پێیاندا هاتە خوارەوە کە ئەو ساتەوەختە تاڵەی هێنایەوە یادی‌و بۆیە پێی وت: ئەی برای هەژارم بە ڕاستی من وەختی خۆی کوێرو نابینا بوم‌و خوای گەورەو میهرەبان بەزەیی پێمدا هاتەوەو چاوەکانی بۆم گەڕاندەوەو سوپاسی بیٚ پایانی دەکەم‌و پێت دەڵێم چەندت پیٚ خۆشە لە مەڕو ماڵات ببەو چەندم بۆ بەجیٚ دێڵی بە ئارەزوی خۆت بەجێی بێڵەو لەبەر خاتری خوای (عز وجل) دەست نادەمە ڕێگات.

فریشتەکە وتی: ماڵی خۆت بۆ خۆت، ئەوە ئێوە هەرسێکتان لە لایەن خوای گەورەوە تاقی کرانەوەو لە ئاکامدا خوا لە تۆ ڕازی بو یانخوا موڵك‌و سامان‌و چاوەکانت پیرۆز بن لێت‌و شادمان بیت ان شاء الله، وبیشزانە کە خوا لە دوو هاوڕێکەی ترت زویر بو، وە وەك خۆیان‌و جارانی لیٚ کردنەوەیٚ گول‌و گەڕو کەچەڵی کردنەوە.

* * *

# چیرۆکی یەکەم

## نابیناکە دەرچو

کەچەڵو گەڕەو کوێرە سێ هاوڕێ بونو زۆربەی کاتەکانیان پێکەوە بەسەردەبرد، کەچەڵو گەڕە زۆر ناشکور بونو هەمیشە حەسودیان دەبرد بە خەڵکیو لە خوای گەورە ناڕازی بون..

کەچەڵ (دەست دەبات سەری دەخورێنێت)و دەڵێت: ئەگەر قژێکی جوانم دەبو بە خوا شام بە سەپان نەدەزانی.. بەڵام بڵێم چی.. سەیر سەیر ئەو کوڕە قژی چەند جوانە.. دەك بە میراتی بێت..

گەڕە: بابە دوعا لە کەس مەکە.. ئەوەتا من دەڵێی پڵنگم.. هەمو گیانم پەڵەپەڵەیەو نازانم خوا بۆچی بەزەیی پێمدا نایەتەوەو لەم گەڕوگولیە ڕزگارم ناکات، چیم کردوە لە دنیا تا موستەحەقی ئەم نەخۆشیە بم..

کەچەڵ/ کڵاوەکەی دەباتو دەیکاتەوە سەریو سەیری کوڕێکی قۆز دەکات کە قژێکی ڕەشو جوانی پێوەیەو بە لایاندا تێدەپەڕێتو دەڵێت:

گەنج: مەرحەبا لێتان.

کەچەڵ: مەرحەبا سەرچاو قژخاو گیان.. دەست دەهێنێت بە قژی لاوەکەداو دەڵێ: باشە خوا چیت لێ کەم دەبویەوە قژێکی ئاوایشت بە من ببەخشیایە، خۆ بە ناشکوری نایلێم..

گەڕ: ئەی سەیری ئەو پێستە ناسکەی بۆ ناکەی کەچەڵ گیان.. منیش ئاوا کەس قێزی نایەت سەیرم بکات.. خوا ئاوا بەشی کردوە بە ساقەی بەشی بم..

گەنج: برایان.. نەخۆشی تاقیکردنەوەی خوایە.. دەبێت سەبرو ئارامی لەسەر بگرنو ناشکوری دەرمەبڕن.. زۆر گوناهێکی گەورەیە..

کەچەڵ: نامەوێ ئامۆژگاریمان بکەیت.. خۆیشمان شتێك لە شەرع دەزانین بەڵام بە خوا تا ماوم لە بەشی خۆم ڕازی نابم هەرچەندە..

گەڕە: ئەم گەنجە ئەگەر توشی بەڵەکی دەبو.. یان کەچەڵ دەبو.. خۆزگە هەر ئاوای دەوت.. کوڕە بە ساقەی سەبر بم.. خوێنو گۆشتم خۆ ئاسن نیم.. تا کەی سەبر..

گەنج: من نازانم ئەگەر خوای گەورە بە نەخۆشی تاقیم بکاتەوە.. ئایا دەردەچم یان نا، بەڵام ئەگەر نەخۆش بکەوم (إنشاء الله) بە ئارام دەبم چونکە خوا ڕقی لە کەس نیەو موسڵمانی زۆر خۆش دەوێت..

کەچەڵ: ئەگەر خۆشی گەرەك بومایە دو تاڵ موی دەکرد بەسەرمەوە..

گەنج: خوای گەورە بە هەژاریو بە نەخۆشی مرۆڤ تاقی دەکاتەوە تا بزانێت تا چ ڕادەیەك لە ژێر باری خوادا بە سەبر دەبنو ئەو کاتە ئەجری ئارامگرانیان دەست دەکەوێتو خوا لێیان ڕازی دەبێت.. دەی من دەڕۆم خوا حاغیز..

لەم کاتەدا گەنجەکە دەڕۆیشت چاوی کەوت بە پیاوێکی کوێر بەرەو ناو شەقامەکە دەڕۆیشتو تەقەی گاچۆنەکەی دەهات.. بە پەلە ڕای کرد بۆ لایو دەستی گرتو پێی وت:

گەنج: مامە گیان ئەملا بگرە بەسەر شوستەکەدا بڕۆ.. بێنە با دەستت بگرم بزانم بۆ کوێ دەچی با بتگەیەنم.

کوێر: زۆر زۆر مەمنونتم.. برای گەنجم.. خوا دەس بە باڵی عومرتەوە بگرێت وا هاوکاری کوێرێکی وەك من دەکەی.. من خوا ئەم نیعمەتەی داوە پێم بە ساقەی بەشی بم.

گەنج: ئەڵڵا.. لەو دڵو دەرونە.. لەو بیروبڕوا قایمەت.. خۆزگەم پێت.. کە کوێری بە نیعمەتی خوا دەزانی.. بەڕاستی تۆ لە تاقیکردنەوەی خوادا دەرچویت انشاء الله.. مژدەت لێ بێت.

کوێر: من چۆن هەزاران نیعمەتی خوام بە سەرەوەیە لە بیری بکەم تەنها لەبەر ئەوەی لە نیعمەتی چاو بێبەشی کردوم؟ ها... نا نا من بە ساقەی پەروەردگارم بم..

گەنج: زۆر جوانە.. بە ڕاستی ئەگەر هەمو کەس ئاوا سەیری خوای خۆیانیان بکردایە هەرگیز ناشکوریان دەرنەدەبڕی... پێت نەوتم بۆ کوێت بەرم؟.

کوێر: بە قوربانت بم.. ئەڕۆم بەرەو خوار بۆ لای دو هاوڕێم کە ئەوانیش هەریەکەو بە دەردێك گرفتارن‌و پێکەوە هەندێ قسەی خۆش دەکەین‌و کات بەسەر دەبەین..

گەنج: (بە پێکەنینەوە) ناشێ بۆ لای کەچەڵ‌و گەڕەکە بڕۆیت؟

کوێ: با با، بۆ لای ئەوان دەچم بەڵام کوڕم بۆ وایان پێ دەڵێی گوناحە خوا وای لێ کردون؟

گەنج: هەرگیز گاڵتەم بە کەس نەکردوە.. بەڵام ئەو دو هاوڕێیەت زۆر ناشکوری دەکەن‌و بە باری خوا ڕازی نین...

کوێر: قەیناکا لێیان مەگرە.. گرفتاران دڵیان ناسك بوەتەوەو تەحەمولیان کەم بۆتەوە عەزیزەکەم بەڵام دەرونیان خاوێنە..

گەنج: خۆزگە مامەگیان ئەوانیش وەك تۆ بە ئارام‌و خۆگربونایە.. ئەوەتان بڕۆ بۆ لایان دانیشە.. دەی خوا حافیز..

کوێر: خوا حافیزت بێت‌و خوا کۆمەکت بکات‌و هاوکاری منت کرد..

کوێر دەڕوات بۆ لای کەچەڵ‌و گەڕەو دادەنیشێت‌و دەڵێت:

کوێر: مەرحەبا لێتان.. برایان..

گەڕە: مەرحەبا سەرچاو ئەوە چی بو دواکەوتی ئێمە لە زوەوە لێرەین‌و چاوەڕوانی تۆشمان دەکرد..

کوێر: ئێوە نازانن.. نابینایی چەند ناڕەحەتەو خاوەنی خۆیشی نیەو دنیا نابینێت..

گەڕ: ئاوایش هەر شکوری خوا دەکەی‌و ناڕازیەك دەرنابڕیت..

کوێر: أستغفر الله.. من نەك چاوم.. دەستو قاچیشم لێ بسەنێتەوە هەر سوپاسی خوا دەکەم.. من چیم بەرامبەر خوایەکی گەورەو بە دەسەڵات..

کەچەڵ: ئەی باشە ئێمە تاوانمان چیە وا ئاوا دوچاری نەخۆشی بوین.. کەچی ئەها (سەیری خەڵکەکە دەکات) ئەو هەموە خەڵکە ساغو سەلامەتن دەڵێی گوێزی کوێرن..

گەڕە: ئەشیەوێت بە بەشی خوا ڕازی بین.. بەڵام بە هەر حاڵ سوپاس بۆ خوا..

پاش ماوەیەك قسەکردنو گفتوگۆ بڵاوەی لێ دەکەنو دەڕۆنەوە..

کوێر: پێش ئەوەی بڕۆینەوە بۆ ماڵ با شتێك هەیە پێتان بڵێم ئەویش ئەوەیە لەوانەیە ئەم دەردو بەڵایە خێری پێوە بێت بۆمان.. بۆ نمونە کێ دەڵێ من چاوم هەبوایە مەغرورێکی لە خوا یاخی نەدەبوم؟ یان ئێوە؟ برایان نەخۆشیو هەژاری نیعمەتی خوان بەڵام کەس هەستی پێ ناکات..

کەچەڵ: ئەم قسەیە لە هیچ کوێ نەکەیت، هەر حەیات دەچێت.. نەخۆشیو هەژاری بەڵان نەك نیعمەت..

کوێر: من پێم وایە ئەگەر دەوڵەمەند بومایە غەڕاو سەرگەردان دەبومو دەستگرۆهی هەژارانمان نەدەکرد..

گەڕە: وا نیە.. خوا ئەکا من چاك دەبمەوەو دەوڵەمەند دەبم هەمیشە یارمەتی نەخۆشو هەژارو کەم دەستەکانم دەکرد..

کەچەڵ: بە خوا منیش بۆ قابیلە خۆمو ئێستام لەبیر بچێت؟!

کوێر: یاخوا وابێت.. بەڵام مەحاڵە مەگەر ڕەحمی خوای لەگەڵدا بێت.

هەمو دەچنەوە بۆ ماڵ.

ڕاوی: خوای گەورە کە زۆر باش لە حاڵو دڵو دەرونی ئەم سیانە ئاگادارەو دەزانێت کامیان لە بارە بۆ دەرچون.. بەڵام بۆ ئەوەی قسەیان نەمێنێت فریشتەیەك لە بەرگی پیاوێکی پیری هەژاردا دەنێرێت بۆ لای هەریەکەیان.

پیاوە گەڕەکە دانیشتوەو هەر خۆی دەخورێنێت.. لەم کاتەدا فریشتەکە دێت بۆ لایو پێی دەڵێت:

فریشتە: سەلامون عەلەیکوم برای بڕوادارم..

گەڕ: وە عەلەیکە سەلام مامە پیرە گیان.. ئەوە چۆن لێم نزیك بویتەوە؟ خۆ هەمو خەڵکی قێزم لێ دەکەنەوە لە تاو گەڕو گولیمو دورم لێ دەگرن تەنانەت منالەکانی خۆیشم..

فریشتە: برای غەمناکم بۆچی وا دڵتەنگی تۆ حەز بە چی دەکەی با لە خوای گەورە بپاڕێمەوە بۆت بەڵکو پێت ببەخشێت -إنشاء الله-..

گەڕ: بە حەزی خۆم بێت حەزم دەکرد منیش وەك تۆ، وەك ئەو خەڵکە لەشم ساغ بوایەو خاوەنی پێستێکی جوانو نەرمو شل بومایە.. ئیتر هیچم لە خوا نەدەویست..

فریشتە دەستەکانی بەرز دەکاتەوە بۆ ئاسمانو هەندێ دوعای بۆ دەکاتو پاشان دەستێك دەهێنێت بەسەر لاشەی پیاوە گەڕەکەداو یەکپارچە خۆش دەبێتەوە!!

گەڕ: ها.. ها.. ئەمە.. منم.. ئەڵڵا.. خۆ پێستم جوانو نەرمو شل بویەوە.. یاخوا بەخێر بێی تۆ فریشتەی ڕەحمەتیو خوات بۆ منی ناردوە.. هەزار سوپاس بۆ خواو بەساقەت بمو زۆر مەمنونتم زۆر...

فریشتە: من کارێکم نەکردوە.. شایانی سوپاس بێ، من تەنها بۆت پاڕامەوەو خوا چاکی کردیتەوە.. چەند جوان بویت عەزیزم..

گەڕە: کورە بە خوا کەچەڵو کوێرەی هاوڕێم بزانن هەر شێت دەبن.. گیاااان..

فریشتە: ئەی گوزەرانت چیە؟ وەزعی مادیت چۆنە؟

گەڕ: وەزعی مادیم چۆنە.. بەم حاڵەوە دەبێت چۆن بێت بە خوا خزمو کەسو دراوسێکان هاوکاریان کردوم ئەگینا لە برسا دەمردین.. بەڵام مادەم چاك بومەتەوە خۆم کاسپی دەکەم..

فریشتە: لەناو ماڵو سامانی دنیا حەز دەکەیت خوای گەورە چیت پێ ببەخشێت؟

گەڕ: حەزم لە حوشترە، تا حەزم لە مانگایە.. هەر کامیان بێت نیعمەتی خوایە..

فریشتە: دەی من حوشترێکی ئاوسم هەیەو ئەمەوێ ببیەخشم پێت.. کردومە بە خێر.

گەڕ: زۆر مەمنونتم.. سوپاست دەکەم. (پاش کەمێك حوشترەکەی بۆ هێناو ئەویش لە خۆشیاندا هەر ماچی دەکردو ڕەشۆکەی بەر نەدەدا..).

بە هەمان شێوە فریشتەکە چو بۆ لای پیاوە کەچەڵەکەو پاش سلاْوکردن پێی وت: ها برای خۆم تۆ لە دنیادا چیت زۆر پێ خۆشە..

کەچەڵ: وەڵلاهی.. ئەوی ڕاستی بێت.. قژێکی جوانم هەبوایەو ئەم برینانەی سەرم خۆش بونایەتەوە کە خەڵکی قێزم لێ دەکاتەوە..

فریشتەکە: دوعای بۆ کردو دەستی هێنا بەسەریداو یەکسەر خۆش بویەوەو قژێکی جوانی خاوی پێوە بو.

فریشتە: ئەی باشە لە ماڵی دنیا حەز دەکەی خوا چیت پێ ببەخشێت..

کەچەڵ: جا توخوا عەیب نیە داوای ماڵی دنیا بکەم.. دوای ئەوەی ئەم قژە جوانەی پێ دامەوە.. (دەستێك دەهێنێت بە قژی خۆیدا)..

فریشتە: حەز دەکەم بیڵێی..

کەچەڵ: مادەم وای لێهات.. دیارە تۆ پیاوێکی چاكو خواناسیو وەلی خوایتو دوعات گیرایە، من زۆر حەزم بە بەخێوکردنی مانگایە..

فریشتەکە وتی من مانگایەکم هەیەو کردومە بە خێرو.. وا دەزانم زۆر بە تۆ دەشێت، ئێستا بۆت دێنم.. بۆی دەهێنێتو پێی دەڵێت:

دەك خوا بەرەکەتی تێ بخات بۆتو زۆر ببن..

ڕاوی: بە هەمان شێوە فریشتەکە لە شێوەی هەمان پیاوی یەکەمدا ڕۆیشت بۆ لای پیاوە کوێرەکە.. دەبینێت بە گۆچانێکەوە بە ڕێگایەکدا دەڕواتو خەریکە لە ڕێگاکە بەرەو کەندەڵانەکە دەڕوات خێرا ڕادەکاتو دەستی دەگرێتو دەیهێنێتەوە سەر ڕێگاکە..

کوێر: دەك بەر ڕەحمەتی خوا بکەویت وا گەیشتیتە فریام.. ئەوە من ئەم ڕێگایەم بۆ لێ تێکچو خۆ من یەکەم جارم نەبو ئەمە ڕێگەی چەند ساڵەمە؟

فریشتە: ئەی چۆن من خێرم بگات؟ ئەگەر تۆ لانەدەیتو من نەتهێنمەوە سەر ڕێگا ڕاستەکە..

کوێر: دەستی فریشتەکە دەگرێتو دەڵێت: (چەند دەستێکی نەرمو شلە دەڵێی تا ئێستا گوناهی پێ نەکراوە.. ڕێبوار ماڵت ئاوا بێت.. خۆ لەم ڕۆژگارەدا خەڵکی بە دەم نابیناوە ناچن..

فریشتە: چۆن دەبێ سوپاسی خوا نەکەن لەسەر ئەوەی کە ئەوانی کوێرو نابینا نەکردوە بە هەر حاڵ من زۆر سۆزو بەزەییم بە تۆدا دێتەوە پێم بڵێ لە دنیا ئاواتت چیە.. بەڵکو من دوعایەکت بۆ بکەمو خوایش قبوڵی بکات -إنشاء الله-؟

کوێر: منێکی کوێر ئاواتم چی بێت؟ هیچ شتێکی ئەم دنیایە خۆش نیە بەبێ چاو.. خۆزگە خوای پەروەردگارم لوتفی لەگەڵدا دەکردمو چاوەکانی پێ دەدامەوەو سەیری خەڵکیم پێ بکردایە.. ئای چەند خۆش بو..

دەزانی برای هاودینم ئێمەی نابینا ئەگەر سەرپشك بکرێین لەنێوان پاشایەتیو چاکبونەوەی چاومان.. بە خوا کەسمان پاشایەتیەکە هەڵنابژێرین..بەڵام خاڵۆ گیان زۆر کەس ئەم دوعایان بۆ کردوم بەڵام...

ڕاوی: فریشتەکە ڕوی کردە ئاسمانو دەستەکانی بەرزکردەوەو داوای کرد لە خوای باڵادەست کە چاوەکانی بۆ بگێڕێتەوەو پاشان دەستی هێنا بەسەر چاوەکانی کوێرەداو کوێرە بینایی بۆ گەڕایەوەو دنیای بینی بۆ یەکەم جار..

لە خۆشیاندا ڕای دەکرد بەو ناوەداو هەر سوژدەی شوکری دەبردو دەیوت خوایە بە قوربانت بم ئەمە منم.. پیاوەکەی ماچ دەکردو باوەشی پێدا دەکردو دەیگوشی بە خۆیەوە دەیوت ئەمە تۆ لە ئاسمانەوە بە دیاری بۆ من نێردراوی هەی پیاوی خواناس مەرج بێت تا مردن من خزمەتکاری تۆ بم..

فریشتە: (بە دەم پێکەنینەوە) خزمەتی من مەکە من چیم کردوە ئەوەی شایانی خزمەتکردنە خوای گەورەو بە دەسەلاتە.. کە دو چاوەکەتی بۆ گێڕایتەوەو تا مردن شوکرانە بژێری ئەو بە براکەم.. من لەبیرکە من کێم؟!.

کوێر: سەد هەزار شوکرو سوپاس بۆ پەروەردگاری گەورەی ئەم جیهانە (الحمد لله رب العالمین).

فریشتەکە پێی وت:

دیارە بە هۆی نابیناییەکەتەوە نەتتوانیوە کاسپی بکەیتو هەژارو دەست کورتیشی لەناو ئاژەلاندا حەز دەکەی چیت هەبێت؟

کوێرە: زمانم لاڵ بێت دوای چاوەکانم داوای شتێکی تر لە پەروەردگارم بکەم، نا نا.. نان نەبێ بیخۆم بەس دنیای ڕۆشن ببینم وا دەزانم پاشای سەر زەویم.

فریشتە: نا نا.. حەز دەکەم ئاواتی شتێك بخوازیت، بەڵکو خوا پێت ببەخشێت..

کوێر: حەزم دەکرد مەڕو بزنم هەبوایەو بەخێوم کردنایە..

فریشتە: دەی من مەڕێكو بزنێکم هەیەو کردومە بە خێرو ئەگەر پێت خۆش بێت هەر ئێستا دەچم بۆت دەهێنم... (پاش کەمێك دەگەڕێتەوە بە مەڕو بزنێکی ئاوسەوە).

کوێرە: خوا خێرت قبوڵ بکاتو دەستەکانت خۆش بن.. سوپاس بۆ خوا بوم بە خاوەنی دو چاوی خۆمو مەڕو بزنی خۆم..

فریشتە: دەی خوا حافیز..

کوێرە: خوات لەگەڵ ئەی میوانە ئازیزەکە..

ڕاوی: ساڵان چونو ساڵان هاتنو حوشترو مانگاو مەڕەکان بەرەکەتیان تێکەوتو زان تا وای لێهات هەریەکەو لە کوێرەو گەڕەو کەچەڵ بونە خاوەنی یەك دۆڵ حوشترو مانگاو مەڕو بزن..

(لێرەدا بە فلاش باك گیاندارەکانیان لە دۆڵەکاندا دەردەکەوێت).

ڕاوی: بەڕێزان.. دوای ئەوەی خوای گەورە شیفای دانو چاك بونەوەو سەروەتو سامانیشی ڕژاند بەسەریاندا.. ئەمجارە هەمان فریشتەی ناردەوە بۆ لایان بە جۆرێك تاقیکردنەوە.. فەرمون با بزانین کامیان لە ژێر تاقیکردنەوەکەی پەروەدگاردا دەردەچنو کامیان پەنا بە خوا دەرناچنو دەکەون..

دیمەنی پیاوە گەڕەکەی جاران دیارە کە بۆتە پیاوێکی سپۆرتو جوانو جلی کەشخەی لەبەردایەو لەناو ڕانە حوشترەکەیدا دێتو دەڕواتو خزمەتکارەکانو شوانەکانی خەریکی دۆشینی حوشترەکانو ئالفیان پێ دەدەن..

مام سەلیم دەستی کوڕەکەی گرتوە بەناو حوشترەکاندا دەڕواتو لە ناکاو کوڕەکەی هاوار دەکات..

کوڕ: ئەوە پیاوێکی هەژارەو هاتوە بۆ خێر با بچم شتێکی بدەمێ داماوە توخوا باوکە گیان ئەو جاریش شتێکم پێدا زۆر جل شڕو گوناحە..

مام سلیم: چی چی چی؟ وەرە، وەرە، بۆ کوێ دەچی.. ئەمە بۆیە هیچم دیار نیە! ئەمە ئێوە دەیدەن بەمو بەو.. وەرە نەچیت..

کوڕ: باوکە گیان.. ئەی تۆ بۆت باس نەکردین کە جاران نەخۆشی پێستت هەبوەو خەڵکی قێزیان لێ دەکردیتەوەو زۆر هەژارو نەداریش بویت؟

مام سلیم: بابا جاران وا بوم.. بەڵام ئەوە جاران بو.. هەر باسیشی مەکە..

کوڕ: ئەی نەتوت پیاوێکی هەژار دوعای بۆ کردو دەستی پێدا هێنام چاك بومەوە..

مام سلیم: با...

کوڕ: دەی کەواتە هەژار تۆی ڕزگار کردو لە خوا پاڕایەوە دەی با بڕۆم یارمەتی ئەو هەژارە بدەم..

مام سلیم: وەرە مەڕۆ..

کوڕ: هەر دەڕۆم..

کوڕ: مامە گیان ئەو تورەکەیە بگرە پڕیەتی لە کەشو دوینەو خواردەمەنی تر..

فریشتە: کوڕم من سواڵکەر نیم.. من ڕێبوارم ڕێگام دورەو پارەم لێ بڕاوەو دەمەوێ باوکت ئەوەندەم پێ بدات بتوانم پێی بگەمەوە شارەکەی خۆم..

کوڕ: (بە سوکی ئای باوکە گیان.. بە تەمایە باوکم خێری پێ بکات) فەرمو فەرمو. وەرە ژورەوە.

مام سلیم: ئەمە چیە کوڕم بۆ هێناتە ژورەوە؟

کوڕ: باوکە گوناحە.. میوان عەزیزی خوایەو کاری بە جەنابت هەیەو لەوانەیە بیشت ناسێت..

مام سلیم: من کەسی ئا لەم جۆرە ناناسم.. ئادەی چڵکن کارەکەت بڵێ بزانم چیە؟

فریشتە: قوربان.. من پیاوێکی هەژارم، لەوانەیە پێشتر منت بینیبێت.. پارەم لێ براوەو دەمەوێت بگەڕێمەوە بۆ شارەکەی خۆم بەڵام پارەم پێ نیەو هیچ چاریشم نیە جگە لە خواو پاشان هاوکاری جەنابتان..

مام سلیم: ئەمە جوانە.. هەر کەسێك پارەی لێ بڕا.. بێتە گیانی ئێمە.. ئێ چەندت دەوێ؟

فریشتە: داوات لێ دەکەم تو ئەو خوایەی کە ئەو پێستو ڕومەتە جوانەی پێداویو کردویتی بە خاوەنی سەروەتو سامان.. تەنها یەك حوشترم پێ بدە با سواری ببمو بگەمەوە شارەکەی خۆم.. چونکە زۆر دورەو بە پێ ناتوانم بیبڕم..

مام سلیم: گوێ بگرە.. من مافی زۆر کەسم لە لایە.. خێری زۆر دەکەم.. ببورە ناتوانم.. نیە..

فریشتە: (سەیرێکی دەکاتو لێی ورد دەبێتەوە)و پێی دەڵێت: وا بزانم دەتناسمەوە ئەرێ پێم بڵێ تۆ فلان کەس نیت کە نەخۆشی گولیت لەگەڵا بو.. بە جۆرێك خەڵکی قێزو بێزیان لێت دەکردەوە؟ هەژارو لاتیش بویتو خوا سەروەتو سامانی پێدایت؟

مام سلیم: ڕەنگی تێك دەچێتو بە زمانی تەتەڵەوە دەڵێت: ئەمە تۆ چی دەڵێی؟! تۆ لەسەر خۆتی سوڵکەر! من ئەو کەسە نیم.. تۆ چاوت ڕەشکەوپێشکەی کردوە..

کوڕ: باوکە تۆ چی دەڵێی؟

مام سلیم: وسبە هەتیو.. من لە باووباپیرمەوە ئەم سامانەم بۆ ماوەتەوە..

فریشتە: دەی من هیچم لێت ناوێت.. بەڵام ئەگەر درۆ دەکەیت خوای گەورە وەك جارانت لێ بکاتەوە..و سەر دادەخاتو دەڕوات..

ڕاوی: بە هەمان شێوە جلوبەرگەوە دەڕواتە بەر دەرگای پیاوە کەچەڵەکەی جاران کە ئێستا بوەتە خاوەنی قژێکی ڕەشی جوان کە پەلکەکانی بەملاو بەولای شانیدا شۆڕ کردبویەوەو بە کەشخەوە هاواری دەکرد.

مام سالار: ئا بزانن ئەوە کێیە لە دەرگا دەدات؟.. خزمەتکارەکەی دەرگا دەکاتەوەو هەژارەکە دێتە ژورەوە..

فریشتە: سڵاو ئەی خاوەن قژی جوانو بریقەدار.. من وا دەزانم کاتی خۆی کەچەڵ بویتو پەروەردگار لوتفی پێ فەرمویتو شیفای بۆ ناردیت..

مام سالار: دەزانی سوڵکەرێکی زۆر بلێو چەنەبازی.. ئا خزمەتکار شتێکی بەرێ با بڕواو بەرۆکمان بەر بدات..

فریشتە: نە سواڵکەرمو، نە زۆر بلێو، نە چەنەبازم گەورەم، بەڵام من ڕێگەم دورەو پارەم لێ بڕاوە بەڵکو مانگایەکم پێ بدەیت بمگەیەنێتەوە شارەکەی خۆم..

مام سالار: سەیر کەن چ تەماعی زلە! مانگایش نەبێ نایەوێت! وا دەزانی لەسەر خەزنە خەوتوم..

فریشتە: ئادەی سەیرم کە.. وا دەزانم تۆ کاتی خۆی کەچەڵ بویتو خەڵکی قێزی لێ دەکردیتەوەو خوای گەورە قژە جوانەکەی بۆ گێڕایتەوەو دەوڵەمەندیشی کردویت وا نیە؟.

مام سالار: پەلکەکانی هەڵدەدات بۆ دواوەو دەڵێت: سەرت دای لە بەرد، من هەر لە دایك بوم قژێکی زیوینم پێوە بوەو پارەو سامانیش ڕەنجەشانە ڕەنجەشان کەللەپوت..

ڕاوی: فریشتەکە سەرێك با دەداتو دەست بەرز دەکاتەوە بۆ لای خواو هاوار دەکاتو دەڵێت: ئەی خوای بە دەسەلاتو پەروەردگاری جیهان من ئیتر هیچم لەم پیاوە ناوێ، بەڵام ئەگەر درۆ دەکات بیکەرەوە بە پیاوە کەچەڵو لۆچیلەکەی جارانو هەژاریشی بکەیتەوە خوایە گیان..

مام سالار: بیکەنە دەرەوە ئەم زمان ڕەشە.. دوعای خێر نازانی...

ڕاوی: دوای ئەوەی هاوڕێ گەرو هاوڕێ کەچەڵەکەمان لە تاقیکردنەوەکەی پەروەردگاردا شکستیان هێناو لەخۆبایی بون... دوعای فریشتەکە لەسەریان گیرا بو قاتو قڕی کەوتە سامانەکەیانو دوچاری نەخۆشیەکەشیان بونەوە دەی با بزانین برای نابینامان هەڵوێستی چۆن دەبێت..

حاجی شاکر: لەناو مەڕو بزنەکانیدا هاتوچۆ دەکاتو بە دەم خۆیەوە دەڵێت: ئەی پەروەردگارم چەند بە ڕەحمو سۆزی بوی لەگەڵم من بە دو چاو ڕازی بوم کەچی منت کردوە بە خاوەنی ئەم دۆڵە ئاژەڵە.. من نازانم چۆن سوپاسگوزارت بم پەروەردگارم..

خزمەتکار: گەورەم پیاوێکی هەژارو جل شڕ لەبەر دەرگایەو چاوەڕوانی ڕوخسەتی جونابتە تا بێتە ژورەوە..

حاجی شاکر: عەزیزەکەم، بلێ با بێتە ژورەوە.. ڕوخسەتی منی بۆ چیە؟ هەرگیز هەژارو داماوان مەوەستێنەو بیانکەرە ژورەوە بۆ لام.. چونکە من زۆرم خۆش دەوێنو کاتی خۆی منیش هەژار بومو بۆ پارویەك نان بە دارا چوم..

خزمەتکار: پێویست بەو قسانە ناکات گەورەم من چاکت دەناسم.. تۆ لە پێناوی هەژاراندا خۆتت بیرچۆتەوە.. هەر ئێستا دەیهێنمە ژورەوە بۆ لاتان.

ڕاوی: هەرکە هەژارەکە دێتە ژورەوە خێرا حاجی پەلاماری دەداتو ئەملاولای ماچ دەکاتو بەخێرهاتنی دەکات.

گەورەم: من شـایانی ئـەو پێـشوازیە نـیم.. مـن هـەژارێکمو پـارەم لێ بـڕاوەو دەمـەوێ بگەڕێمەوە بۆ ناو ماڵو منداڵەکەمو مەسروفی ڕێگام پێ نیە.. ئەگەر بکرێت یەك مەڕم پـێ بدە با بە پارەکەی بتوانم بگەڕێمەوە بۆ شارەکەی خۆم..

حاجی: تۆ زۆر بە پەلەی جارێ لای ئێمە میوان بە.. با پێکەوە نانێـك بخـۆینو هەنـدێ قسەی خۆش بکەین.. دوایی بیر لە چونەوە بکەرەوە..

فریشتە: نا، دوام مەخە.. منداڵم وردەو ئێستا چاوەڕوانمن.. تو ئەو خوایەی کـە کـاتی خۆی کوێر بویتو دو چاوەکەی بۆ گێڕایتـەوەو سـەروەتو سامانیـشی ڕژانـدوە بەسـەرتدا تەنها مەڕێکم بەرێ با خێرا بگەمەوە وڵاتی خۆم خوات لێ ڕازی بێت..

حاجی: ڕاستەکەی.. کـاتی خـۆی نابینـا بـومو خـوا دو چـاوەکەی بـۆ گێڕامـەوەو ئـەم سامانە زۆرەشی پێ بەخشیوم.. بۆیە تکات لێ دەکەم بکەوە نـاو ڕانەکـەم چـەند دەبـەیت گەردنت ئازاد بێت ببیـەو، وەڵڵاهـی دەسـت نادەمـە ڕێگـەتو لـە پێنـاوی خـوادا هـەمویت دەدەمێ..

فریشتە: دەی مەڕەکانت پیرۆزی خۆت بێ..من نامەوێ.. من لە لایەن خـواوە نێـرراومو فریشتەمو مرۆڤ نیم.. هـاتم تـا تـۆو دو هاوڕێکـەت تـاقی بکەمـەوە، بـەڵام مـژدە بێـت تـۆ دەرچویت بەڵام دو هاوڕێکەت کەوتنو خوا لە تۆ ڕازی بو.. بەڵام خەشـمو قینیـشی لـە دو هاوڕێکەت گرت..

حاجی: مەبەستت کەچەڵو گەڕەی کۆنە هاوڕێمە؟

فریشتە: بەڵێ.. بەڵێ.. خوا لێیان زویر بـو دوچـاری نەخۆشـیەکەی کردنـەوەو هـەژارو لاتیش بونەوە..

حاجی: پێم ناخۆش بو.. خۆزگە ئەوانیش دەربچونایە.. بەڵام داوایەکت لێ دەکەم..

فریشتە: فەرمو: بیڵێ.. تۆ خۆشەویستی خوایتو لە تاقیکردنەوەکەیدا دەرچویت..

حاجی: ئەو دو هاوڕێیەم زۆر خۆش دەوێت‌و كاتی خۆی هەرسێكمان نەخۆش‌و كەم ئەندام بوین.. ئایا دەتوانم ئەو دوانە بێنم بۆ لای خۆم‌و هاوكاریان بكەم بۆ چارەسەری نەخۆشیەكەیان‌و دەستگرۆییان بكەم.

فریشتە: ئەوە كردەوەی چاكەیە.. (إنشاء الله) بە چاكە بۆت دەنوسرێت، دەی خواحافیز.

## پەندو ئامۆژگارییەكانی ئەم چیرۆكە:

١ـ دەبێت مرۆڤی موسڵمان لە ژێر باری خواداو لە كاتی نەخۆشیو نەداریو هەژاریدا هەر سوپاسگوزارو شوكرانەبژێر بێت.

٢ـ هەمیشە حەزو ئارەزوو ئاواتی ئەوە بێت رۆژێك خوای گەورە بێت بە دەمیەوەو چاكی بكاتەوەو هەرگیز نائومێد نەبێت لە پەروەردگاری چونكە نائومێدی رەوشتی كافرو بێباوەڕانە: ﴿إِنَّهُۥ لَا يَاْيْـَٔسُ مِن رَّوْحِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلْكَـٰفِرُونَ﴾[١].

٣ـ مرۆڤ هەرچەند بە هەوڵو تێكۆشانو عەقڵو ژیریو جموجۆڵی خۆی وەزعی مادی خۆی چاك بكات هەر بە بەخششی پەروەردگاری بزانێتو بڵێ ئەگەر ئەو چوستو چالاكو ژیری نەكردمایە من عەقڵی كاسبیم لە كوێ بو.

٤ـ ئەو كەسانەی وەزعی داراییان باشە با هەردەم ئامادەباش بن كە خوا لە رێگەی هەژارو سوڵكەرانەوە تاقییان دەكاتەوە لەوانەیە ئەو ئۆتۆمبیلە كەشخەیەی لە ژێرت دایە بۆ ئەوە پێی داوی بزانێت ئەو كەسە داماوەی لە قەراغی جادەو لەبەر هەتاو یان باران وەستاوە تۆ هەڵی دەگریت یان بە خێرایی (با) دەدەیت بە لایداو تۆزی بۆ دەكەیت.

٥ـ بە كاری ئەو فریشتەیەدا وا دیارە تاقیكردنەوە دروستە كە بتەوێت ئاستی دڵسۆزیو لێبڕانو لێهاتنو گوێڕایەڵی كەسانی دەوروبەرت بزانیتو ناچێتە خانەی درۆكردنەوە وەك چۆن فریشتەكە خۆی كرد بە پیاوێكی جل شڕو هەژار.

٦ـ ئەگەر لە نەخۆشی چاك بویتەوە یان لە گرفتێك رزگارت بو، ئەوە یەكەمین كەس كە شایانی سوپاس كردنەوە خوای پەروەردگارتەو خەڵكانی تر هەبوو هۆكارن خوا لە بەرژەوەند تۆدا بەكاری هێناون بەڵام لە سوپاس كردنی ئەوانیش كەمتەرخەمی نەكەیت چونكە: ((من لم یشكر الناس لم یشكر الله))[٢].

---

١ یوسف (٨٧).

٢ سنن الترمذي، باب: ما جاء في الشكر لمن أحسن إليك، رقم الحديث: ٢٠٢٠، ج٣/ص٢٢٨، وهذا حديث صحيح.

٧ـ ئەگەر لە کاتێکیشدا سەروەت‌و سامانت لە باوباپیرتەوە بۆت مابویەوە هەر دەبێت بە هی خوای بزانیت کە باوك‌و باپیرێکی دەوڵەمەندی پێ بەخشیویت لە یادت بێت کە زۆر کەسان هەن باوکیان ئەوەندە هەژارە بە قەرزاری سەری ناوەتەوەو کوڕەکەی بە قەرزاری بەجێ هێشتوە.

٨ـ لەم چیرۆکەدا بەرزترین چڵەپۆپەی بەخشین دەبینین کە پیاوە نابیناکە پێی وت بێ منەت بە چەند دەبەیت لە مەڕەکان بیانبە.

٩ـ مرۆڤی موسڵمان هەر پارەیەکی بەخشی یان هەر خێرو قوربانی‌و صەدەقەیەکی کرد تەنها لەبەر خاتری ڕەزامەندی خوای باڵادەست بێت‌و هیچ نیەت‌و نیازێکی دنیایی تێکەڵ نەکات چونکە خوا کاری هاوبەشی ناوێت.

١٠ـ بۆ ئەو کەسەی کە هەڵدەسشێت بە تاقیکردنەوەی کەسانی دەوروبەری با لە کۆتاییدا مژدەی دەرچونی پێ بدات، بەڵام هەواڵی کەوتن دوابخات بۆ ئەوەی کەسەکە خۆی بۆی دەربکەوێت.

١١ـ دروستە لە ئیسلامدا موسڵمان ئارەزوی شتی دنیایی هەبێت‌و حەز لە کۆشکی گەورەو ئۆتۆمبێلی مۆدیل بەرزو باخ‌و باخات‌و شتی تریش بکات چونکە مرۆڤی دەوڵەمەند (ئەگەر لێی بزانێت) چەندان پلە بە هۆی سامانەوە خۆی لە خوا نزیکتر دەکاتەوەو دەستگرۆیی‌و هاوکاری ئەم‌و ئەویشی پێ دەکات.

١٢ـ دەبێت موسڵمان هەوڵ بدات بە شێوازێکی پاك‌و تەمیزو بۆنی خۆشەوە بچێتە ناو خەڵکی‌و کارێك نەکات خەڵکی قێز لە بۆنی ئارەقی‌و جلی چڵکنی‌و دانی زەردی بکەنەوە.

١٣ـ دەبێت دەوڵەمەندو خوا پێداوان زۆر مەبەستیان بێت دڵی سوالکەرو کەم دەستەکان ڕاگیر بکەن‌و بە شتێکی کەمیش بێت دڵیان خۆش بکەن‌و نەڵێن ((الحقوق کثیرة))و تەنها تۆ نیت بەڵکو هەژاران زۆرن!.

١٤ـ دەبێت ساماندااران چ باخە یان ئۆتۆمبیلە یان کارگە یان پیشە، دڵی هەژاران نەشکێننو نائومێدیان نەکەن چونکە بترسن لەوەی دوعایەکی شەڕ لە سامانەکەیان بکەنو خوایش بێت بە دەمیانەوەو دوعاکەیان قبوڵ بکات.

١٥ـ مرۆڤی خواناس دەبێت بیروباوەڕی لەسەر یەکتاپەرستی بنیات بنێتو دور بێت لە هاوبەش پەداکردن بۆ پەروەردگار، باوەڕی وا بێت تەنها خوا شافییەو نەخۆشان چاك دەکاتەوە وەك پیاوە نابیناکە وتی: ئاواتم ئەوەیە خوا چاوەکانم چاك بکاتەوە بە پێچەوانەی دو هاوڕێ بێ ئاگاو ناحاڵیەکەی کە وتیان ئاواتمان پێستی جوانو قژی کەشخەیە ! و نەیاندایە پاڵ خوای گەورە وەك ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێت) دەیفەرموو: هەر کات نەخۆش کەوتم تەنها پەروەردگارە چاکم دەکاتەوە.

١٦ـ هەڵمەشاخێ بە هەژارو داماوو بێ دەسەلاتانداو جوابی مەکەو مەڵێ نیمە خوا بتداتێو دڵنیا بە ئەوە وەك داو وایەو بۆ تۆ نراوەتەوەو کامێرەی شاراوەشت بە سەرەوەیەو جوان هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکە چونکە فیلمەکەی لە ڕۆژی قیامەتداو لە گەورەترین کەناڵی ئاسمانیەوە لێ دەدرێتو سەرتاسەری مرۆڤایەتی دەیبینن ﴿وَأَمَّا ٱلسَّآئِلَ فَلَا تَنْهَرْ﴾. واتە: پاڵ بە سوڵکەرانەوە مەنێو جوابیان مەکە واتە شتێکیان پێ بدە.

# القصة الثانية

## باسم رب الغلام

عن صهيب (رضي الله عنه) ان رسول الله (ﷺ) قال: كان ملك ممن كان قبلكم، وكان له ساحر، فلما كبر قال للملك: إني قد كبرتُ فابعث إليّ غلاماً أعلمه السحر، فبعث اليه غلاماً يعلمه، وكان في طريقه -إذا سلك- راهب، فَقَعَدَ اليه وسمع كلامه فاعجبه، وكان اذا أتى الساحر مرّ باراهب وقعد اليه، فاذا اتى الساحر ضربه، فشكى ذلك الى الراهب فقال: حبسني الساحر، فبينما هو على ذلك اذا اتى على دابة عظيمة قد حبست الناس، فقال: اليوم أعلم الساحرُ أفضل أم الراهب أفضل؟ فأخذ حجراً فقال: اللهم ان كان أمر الراهب أحبّ اليك من امر الساحر فاقتل هذه الدابة يمضي الناس، فرماها فقتلها ومضى الناس، فأتى الراهب فأخبره، فقال له الراهب: ايّ بنيّ انت اليوم أفضل مني، قد بلغ من أمرك ما أرى، وانك ستبتلى، فان ابتليت فلا تدلَّ عليَّ.

وكان الغلام يبريء الأكمه والأبرص، ويداوي الناس من سائر الادواء، فسمع جليس للملك كان قد عمي، فاتاه بهدايا كثيرة فقال: ما هاهنالك اجمع ان انت شفيتني، فقال: اني لا أشفي أحداً، انما يشفي الله تعالى، فان آمنت بالله تعالى دعوت الله فشفاك، فآمن بالله تعالى فشفاه الله تعالى.

فأتى الملك فجلس إليه كما كان يجلس، فقال له الملك: من ردّ عليك بَصركَ؟ قال: ربّي، قال: اولك ربّ غيري؟ قال: ربي وربك الله، فأخذه فلم يزل يعذبه حتى دلّ على الغلام، فجيء بالغلام، فقال له الملك: اي بنيًّ قد بلغ من سحرك ما تبرئ الأكمه والأبرص وتفعل وتفعل.

فقال: اني لا أشفي احداً انما يشفي الله تعالى، فأخذه فلم يزل يعذبه حتى دلّ على الراهب.

فجيء بالراهب، فقيل له: إرجع عن دينك، فأبى، فدعا بالمنشار فوضع المنشار في مفرق رأسه، فشقه حتى وقع شقاه، ثم جيء بجليس الملك فقيل له: إرجع عن دينك، فأبى، فوضع المنشار في مفرق رأسه، فشقه به حتى وقع شقاه.

ثم جيء بالغلام، فقيل له: إرجع عن دينك فأبى، فدفعه الى نفر من أصحابه فقال: اذهبوا به الى جبل كذا فاصعدوا به الجبل، فاذا بلغتم ذروته فان رجع عن دينه والاّ فاطرحوه فذهبوا به فصعدوا به الجبل فقال: اللهم اكفنيهم بما شئت، فرجف بهم الجبل فسقطوا، وجاء يمشي الى الملك، فقال له الملك: ما فعل اصحابك؟ فقال: كفانيهم الله تعالى.

فدفعه الى نفر من أصحابه فقال: اذهبوا به فاحملوا قرقور وتوسطوا به البحر، فان رجع عن دينه والاّ فاقذوه، فذهبوا به فقال: اللهم اكفنيهم بما شئت، فانكفأت بهم السفينة فغرقوا، وجاء يمشي الى الملك، فقال له الملك: ما فعل أصحابك؟ فقال: كفانيهم الله تعالى، فقال للملك: انك لَستَ بقاتلي حتى تفعل ما آمرك به، قال ما هو؟ قال: تجمَعُ الناسُ في صعيد واحد، وتَصلبني على جذعٍ، ثم خذ سَهماً من كنانتي، ثم ضع السهم في كبد القوس، ثم قل: بسم الله رب الغلام ثم ارمني، فانك إن فعلت ذلك تقتلني.

فجمع الناس في صعيد واحد، وصلبه على جذع، ثم أخذ سهماً من كنانته، ثم وضع السهم في كبد القوس ثم قال: بسم الله ربِّ الغلام، ثم رماه فوقع السهم في صُدغه، فوضع يده في صدغه فمات، فقال الناس: آمنا برب الغلام، فأتى الملك فقيل له: أرأيت ما كنت تحذر؟ قد والله نزل به حذرك، قد آمن الناس، فأمر بالاخدود فافواه السلك فخدَّت واضرم فيه النيران وقال: من لم يرجع عن دينه فاقحموا فيها او قيل له: اقتحم، ففعلوا حتى جاءت إمراة ومعها صبيٌ لها، فتقاعست ان تقع فيها، فقال له الغلام: يا اماه اصبري فانكِ على الحق.[1]

---

١ رواه مسلم (٢٠٠٥) له (رياض الصالحين)، ژ: (٣١)، لا: (٢٠ـ٢١) چاپی یەکەم.

## چیرۆکی دووەم

## بە ناوی خوای منداڵەکەوە

سوهەیب (خـوا لێ ڕازی بێـت) دەگێڕێتـەوە کـە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرمویـەتی: پادشایەك لە پادشاکانی سەردەمانی پێش ئێوە جادوگەرێکی هـەبو (کـە چاوبەسـتکردنو خەڵەتاندنو ژێربارخستنی میللەتی داماوو ڕەشو ڕوت لە ڕێگەی سیحرکردنەوە کاری بو).

کاتێك ئەم جادوگەرە پیر بو توانای کارەکەی کەم بویەوە ڕووی کردە پادشا پێـی وت: دەبینی کە من پیر بوم (و توانـای ئـەم ئەرکـەم نـەماوە) دەی بـەڵکو منـداڵێکی چوسـتو چالاکم بۆ بنێری تا فێری جادوگەریەکەی خۆمی بکەم.

پادشا کوڕێکی چوستو وریای دیاری کردو دایە دەستی.

ئیتر لەو ڕۆژە بە دوا منداڵەکە بەردەوام هەمو ڕۆژێك سـەردانی ئـەو پـیرە جادوگـەرەی دەکرد لەناو ئەو شاخانەداو لێیەوە فێری جادو دەبو.

لەسەر ڕێگاکەی ئەشـکەوتێك هـەبو لـەو ئەشـکەوتەدا (خواناسـێك خـەریکی بەندایـەتی کردنی خوای پـەروەردگار بـو) ڕۆژێکیـان ئـەو منداڵـە لایدایـە لای ئـەو پیاوچـاکەو لـە لای دانیشتو بە وردی گوێی بۆ وتەکانی گرتو زۆر سەرسامو خۆشحاڵ بو بە وتەکانی.

لەو ڕۆژە بە دواوە بەردەوام سەرەتا لای دەدایە لای ئەو خواناسەو گـوێی بـۆ وتـەکانی شل دەکردو پاشان بە نابەدڵیـەوە دەچـو بـۆ لای مامۆسـتا جادوگەرەکـەیو وانـەی لـە لا دەخوێند.

دوای ئەوەی جادوگەرەکـە هەسـتی کـرد لـە کـاتی دیـاریکراودا ئامـادە نابێـتو ڕۆژانـە دوادەکەوێت زۆری لێدا..

کوڕەکەش زۆر ناڕەحەت بو، سکاڵای خـۆی بـردە لای زانـا خواناسـەکەو ئـەویش پێـی وت: کوڕی خۆم تۆ بەردەوام سەردانی من بکەو سارد مەبەرەوەو خۆ ئەگەر جادوگەرەکـە گلـەیی دواکـەوتنی لێ کـردی پێـی بڵـێ ئـیشو کـاری ماڵـەوەمان دوای خـستم، وە ئەگـەر ترسای ماڵەوە لێت بدەن پێیان بڵێ مامۆستا جادوگەرەکەم دوای خستم.

بەم شێوەیە ماوەیەك بەردەوام بو، تا ڕۆژێك لە ڕۆژان لە كاتی گەڕانەوەیدا بۆ ماڵ گیانلەبەرێكی زەبەلاحی بینی كە لە ناو چەقی ڕێگەكەدا وەستابو، خەڵكی هەمو لێی دەترسانو نەیاندەوێرا لەو ڕێگایەوە بڕۆن بۆ سەر كارەكانیان..

منداڵەكەش بۆ ئەوەی ڕاستی ڕێبازی پیاوچاكەكەو هیچو پوچی ڕێچكەی جادوگەرەكە بزانێت (لە لایەكو لە لایەكی تریشەوە چاكەیەك بێت لەگەڵ ئەو خەڵكەی ئەو ڕێگایەدا) بەردێكی گەورەی هەڵگرتو وتی: ئەمڕۆ بۆم ئاشكرا دەبێت كە ئایا كامیان لەسەر هەقن زانای خواناس یان پیرە جادوگەر؟

بەردەكەی بەرزكردەوە بە دەنگی بەرز هاواری كرد: ئەی پەروەردگارم ئەگەر پیاوە خواناسەكە لە لای تۆ لە جادوگەرەكە خۆشەویستترە من بەم بەردە ئەو دەعبایە بكوژمو خەڵكەكەی لێ ڕزگار بكەمو تێی گرتو كوشتیو خەڵكەكە بە خۆشحاڵیەوە بەو ڕێگایەدا بەرەو كارەكانیان ڕۆیشتن.

كاتێك لە ڕۆژی داهاتودا هاتەوە خزمەت پیاوە خواناسەكەو هەواڵەكەی بۆ گێڕایەوە، خواناسەكەش (زۆر خۆشحاڵ بو) دەستی خستەسەر شانیو پێی وت:

ئای كوڕی خۆم، ئەزانی تۆ لەم ڕۆوە لە من باشتریو وەك دەبینم زۆر بەڕێزو نزیك بوبیت لە خواوە..

بەڵام گیانەكەم دوژمنایەتی بیروباوەڕ لێت ناگەڕێنو دەتگرنو ئازارو ئەشكەنجەت ئەدەن، بەڵام دەخیلت بم هەرچەندە سزات بدەن تۆ خۆگر بەو ناوی من مەهێنە، چونكە من بیروباوەڕی دروێنەی ئەوانم ڕەدكردۆتەوەو دژی بیروبۆچونە بێباوەڕییەكانیانم..

ڕۆژان دەڕۆیشتنو ڕۆژان دەهاتن، بەردەوام ئەم منداڵە كاری لە باشیدا بو، هەردەم خوای گەورە زیاتر بەخششو نیعمەتی زیاتری بەسەردا دەڕژاند لەوانە توانای بەردانی زمانی لاڵو چارەسەری نەخۆشی پێستو نابینای چاك دەكردەوەو چارەسەری هەموو دەردەكانی تریشی دەكرد.

دوای ئەوەی بەم کارە خێری‌و چاکەخوازیانە ناوبانگی دەرکرد لەناو شارداو تا کار گەیشتە ئەوەی کە یەکێك لە دۆست‌و پیاوماقوڵی دیوەخانی پادشا کە نابینا بو، هەستیَ بە سەردانی کردنی ئەو کوڕە بە هیوای ئەوەی چاوەکانی بۆ چاك بکاتەوەو سەر لەنویَ دونیای ڕوناکی پیَ ببینێت.

بە کۆمەڵیَ دیاری سەنگینەوە ڕۆیشت بۆ ماڵی منداڵەکەو پێی وت: ئەگەر چاوەکانم چاك بکەیتەوە ئەم هەموو دیاریانە دەدەم بە تۆ.

منداڵەکەش وتی: من کەس چاك ناکەمەوە بەڵکو شیفا بەخشی ڕاستەقینە خوای پەروەردگارە، ئەگەر تۆ باوەڕ بەو خوایە بهێنی منیش لێی دەپاڕێمەوەو دوعات بۆ دەکەم کە چاکت بکاتەوە، پیاوە نابیناکەش هەر لەوێدا باوەڕی هێناو پەروەردگاریش دو چاوەکەی بۆ گێڕایەوەو شیفای پیَ بەخشی.

پیاوەکەش کاتێك کە بینی وا چاوەکانی دەبینیَ‌و دنیای ڕووناکی بۆ یەکەم جار بینی زۆر سوپاسی خوای کردو پیاوەکەی پاشا تێر دەستخۆشی لە منداڵەکە کردو سەرجەم دیاریەکانی پیَ بەخشی‌و گەڕایەوە بۆ ماڵەوە.

هەروەك عادەتی جارانی چویەوە بۆ دیوەخانی پادشا (بەڵام ئەمجارە کەس دەستی نەگرتبو بەڵکو بە پێی خۆی ڕۆیشت‌و پاشانیش زۆر خۆشحاڵ بو بۆیە بە دەم بیرۆزباییەوە) لێی پرسی:

کیَ چاوەکانی چاك کردیتەوە؟ پیاوەکە (ش بەبیَ دو دڵی) لە وەڵامدا وتی: پەروەردگارم.

پادشا (بە سەرسامیەوە هاواری کرد بە سەریدا) وتی: چی؟ بۆ جگە لە من کەسێکی تر بە خوای خۆت دەزانیت؟!

پیاوەکەش (بە دڵێکی پڕ لە باوەڕو باوەڕێکی پۆڵایینەوەو بیَ ترس‌و دو دڵی) وتی: گەورەم خوای من‌و خوای تۆش تەنها (الله)یە.

پادشا ئاگری تورەیی هەڵگیرساو فەرمانی دەرکرد دەست بەجێ پیاوە باوەڕدارەکەیان گرتو خستیانە ژێر ئەشکەنجەو ئازارێکی قورسەوە وتی: دەست لە ئەشکەنجەدانی هەڵمەگرن تا ناونیشانی ئەو منداڵەتان پێ دەڵێت.

ئەو ستەمکارە دڵڕەقانە جۆرەها سزای ناشیاویان لەگەڵیدا بەکارهێناو ناچار لە ئاکامدا وای بە باش زانی شوێنی منداڵەکەیان پێ بڵێ.

پیاوەکانی پادشا دەست بەجێ ڕۆیشتنو منداڵەکەیان هێنایە بەردەستی پادشاو ئەویش بە تورەییەوە لێی پرسی: ها کوڕم بۆ وا سپڵە دەرچویت؟ ئێمە فێری سیحرو جادومان کردیتو تۆش بۆ خۆت خەڵکی کەڕو لاڵو نابیناو گولی پێ چاك دەکەیتەوە بە هۆی سیحربازییەوە؟

(منداڵەکەش بە باوەڕێکی قایمو بە دڵێکی لەسەرخۆوە وڵامی پادشای ستەمکاری دایەوەو) وتی: من چیمو کێم؟ تا بتوانم خەڵکی چاك بکەمەوە بەڵکو شیفابەخشی هەمو لایەك تەنها خوای پەروەردگارەو بەس.

پاشا (زۆر تورە بو) چاوەکانی سورهەڵگەڕانو فەرمانی دەرکرد بە سەخسترین شێوەکانی سزا ئەشکەنجەی بدەن تا ناوو شوێنی ئەو کەسانەمان پێ دەڵێت کە ئاوا تێی گەیاندوەو تێکی داوە لێمان.

منداڵەکە لە ژێر ئەشکەنجەو ئازارە جیاجیاو بە ئێشەکاندا خۆی گرتو هیچی نەوت، بەڵام لە ئاکامدا بیری کردەوە کە ناوی مامۆستاکەی بڵێت تا بە چاوی خۆی وانەی سەبرو ئارامیشی لێوە فێر ببێت.

جەندرمەکانی پاشا بە ناشترینترین شێوە هەڵیانکوتایە سەر ئەشکەوتەکەو ئەو پیاوە خواناسە بە ساڵاچوەیان ڕاکێشتو بە لێدانو قسەی ناشیرینەوە بردیانە بەردەمی پاشایان.

پاش چەند ڕۆژێك لە زیندانی کردنو ئەشکەنجەدانی ئەو سێ کەسە باوەڕدارە بێ تاوانە پاشا فەرمانی دەرکرد کە بیانهێننە بەر دەستی خۆیو ئەوانیش هێنانیانە بەردەستیو سەرەتا لە مامۆستای خواناسەوە دەستی پێکردو پێی وت:

لە ئاین‌و بیروبڕوات پەشیمان بەرەوە.. پیاوی پیری بەساڵاچو لە پێناوی ڕەزامەندی خواو خۆشەویستی ئەودا تەمەنی هەمو بەسەربردوە چۆن وا بەو ئاسانیە خۆی ئەدات بە دەستەوەو پشت لەو ئاینە پاك‌و دروستە دەكات‌و بێباوەڕ دەبێتەوە.

بۆیە بە پاشای وت: هەرگیز نامبینی واز لەم ئاینەم بێنم. پاشا چاوەكانی پەڕیە تەوقی سەری‌و لە تاو توڕەبون كەفی ئەچەراندو هاواری دەكرد نامەوێ لە وڵاتی مندا كەسێك هەبێت جگە لە من خوایەكی تر بپەرستێت.

هەر لەوێدا فەرمانی دەركرد مشارێكی گەورەیان هێناو لە تەوقی سەریا دایانناو دەستیان كرد بە دولەتكردنی زانای خواناسی بەساڵاچو (بەبێ ئەوەی شەرمی ڕیشی سپی‌و تەمەنەكەی بكەن) تا خوارەوە بڕیارنەوەو كردیان بە دو بەشەوەو بەشەكانی لەشی كەوتن بەمدیوو ئەودیوداو گیانی پاكی بە شەهیدی بەخشیە پێناو بیروباوەڕو پەروەردگاری ڕاستەقینەی خۆی.

پاشان هاوڕێ گیانی بە گیانیەكەی دیوەخانی خۆی هێناو بەویشی وت: ها كوێرەی جاران واز لە بیروباوەڕەكەت دەهێنیت؟

پیاوە نابیناكەش بە باوەڕی پۆڵاینەوە لەبەردەمی پاشادا وەستاو وتی: هەرگیز، پاشای دڵڕەقیش فەرمانی دا بە هەمان شێوەی پیاوەكەی پێشو مشارەكەیان خستە تەوقی سەری ئەویش‌و ئەویشیان كرد بە دو لەتی ناوەڕاستەوەو لەتەكانی كەوتن بەملاولادا.

جا نۆرەی منداڵەش هات‌و داوای لەویش كرد كە واز لە ئاینەكەی بهێنێت‌و پێی وت: دەست لەم بیروباوەڕو ئاینەت هەڵدەگریت یان نا؟

منداڵەكەش (بە كێوێك سەبرو ئارامی‌و خۆگریەوە) سەرێكی باداو نەخێری بۆ كرد.

پاشایش خۆی بە شایستەی ئەوە نەزانی كە بە دەستی خۆی هەستێ بە كوشتنی منداڵێك بۆیە بە پیاوە چڵكاوخۆرەكانی خۆی وت:

بیبەن بۆ سەر لوتکەی بەرزترین کێوو لەوێ داوای لێ بکەن لە ئاینو بیروباوەڕی پەشیمان ببێتەوەو ئەگەر پەشیمان بویەوە زۆر باشە بەڵام ئەگەر هەر سور بو لەسەری لە کێوەکە فرێی بدەنە خوارەوە.

پاش ئەوەی کە هەر گوێی بۆ نەگرتن (چونکە ئەو ڕێزی پاشایانی شکاندو بە قسەی نەکرد) ئاخۆ دەبێ چۆن بە قسەی ئەم بەکرێگیراوە قەزەمانە بکات، ویستیان بیخەنە خوارەوە.

منداڵەکە ڕوی کردە خوای پەروەردگارو دەستە بچکۆلانەکانی بەرزکردەوە بۆ ئاسمانو وتی:

ئەی پەروەردگارم بە هەر جۆرێك خۆت پێت خۆشە ئەمانەم لە کۆڵ بکەرەوەو لەناویان بەرە.

خوای گەورەیش هات بە دەم نزاکەیەوەو کێوەکە دەستی کرد بە لەرزینو حەشۆکەکردنو سەربازەکانی پاشا کەوتنە خوارەوەو ملیان شکا.

منداڵەکە دوبارە بە عیزەتێکی باوەڕدارانەوە هاتەوە بۆ کۆشکی پاشاو پاشا زۆر سەرسام بو وتی: بچکۆل ئەی کوا سەربازەکانی لەگەڵتدا بون؟ چیان لێ هات؟

منداڵەکەش بە باوەڕێکی پۆڵاینەوە وەڵامی دایەوەو وتی: خوای پەروەردگار لەناوی بردنو لە کۆڵمی کردنەوە.

ئەم جارە پاشا (دیسان دەرسی وەرنەگرت) بەڵکو هەر بە هێزو لوتبەرزی خۆیدا دەینازی بۆیە دەستبەجێ فەرمانی دەرکرد کە بیگرنو ئەمجارە کۆمەڵێك سەربازی زۆرتری ڕاسپارد کە بیبەن بۆ ناوەڕاستی دەریایەکی بێ بنو ئەگەر وازی لە بیروباوەڕەکەی هێنا ئەوە وازی لێ بێننو خۆ ئەگەر هەر سور بو لەسەری، یەکسەر نوقمی دەریای بکەنو بیخنکێنن.

لەوێ پاش ئەوە سەربازەکان داوای گەڕانەوەیان لێ کرد لە ئاینەکەی بەڵام ئەو هەر گاڵتەی ئەهات بە هەڕەشەو گوڕەشەکانیانو ئەو بانگی دەکردن بۆ یەك خواپەرستی.

بۆیە هەمو پەلاماریان دا تا فرێی بدەنە ناو دەریاکەوە بەلام ئەم جارەیش منداڵەکە داوای لە پەروەردگاری کردەوە کە مۆڵەتی تەمەنی بداتو ئەو سەربازانەشی بۆ لەناو بەرێت.

لەو کاتەدا بە ویستی خوای عز وجل شەپۆلێکی گەورە هاتو کەشتیەکەی هەڵگەڕاندەوەو هەمو سەربازەکان خنکانو منداڵی باوەڕپتەو بە سەلامەتی لە ئاوەکە هاتە دەرەوە.

بۆ جاری سێیەم هاتەوە بۆ کۆشکی پاشاو پاشایش کاتێك بینی هەردوو چاوی پەڕیە تەوقی سەریو تورە بو هاواری کرد: کوا هاوڕێکانت چیان بەسەر هات؟

منداڵەکەش زۆر بە هێمنانەو لەسەرو بە پێکەنینەوە وەلامی دایەوەو وتی: خوای گەورە لەناوی بردنو لە کۆڵمی کردنەوە.

بەلام منداڵە ژیرەکە بلاوبونەوەی ئاینی خواو یەکتاپەرستی بە لاوە شیرینتر بو لە گیانی خۆی بۆیە زۆر بە ئاسایی روی کردە پاشاو پێی وت:

تۆ هەرگیز ناتوانی من بکوژیت مەگەر بەو جۆرە بکەیت کە من پێت دەڵێم.

پاشا وتی: ئەو جۆرە چیە بێڵێ با بیکەم؟

کوڕەکە وتی: لە گۆڕەپانی شاردا هەمو خەڵکی کۆبکەرەوەو من چوار مێخە بە دارێکدا بمبە سەرەوەو هەڵم واسەو پاشان لە تیرەکانی خۆم تیرێك دەربهێنەو پاشان تیرەکە بخەرە ناو کەوانەکەو روی بکەرە منو بڵێ:

((بە ناوی خوای ئەم کوڕەوە))و پاشان تیرەکەم تێ بگرەو ئەگەر بەو جۆرە بکەیت کە من پێت دەڵێم دەتوانیت بمکوژیت.

پاشایش خێرا بەو کارە رازی بو (بەبێ ئەوەی بیر لە ئاکامەکەی بکاتەوە کە هەمو خەڵکی شار راستیو گەورەییو دەستەلاتی خوای پەروەردگاریان بۆ دەردەکەوێتو موسڵمان دەبن).

پاشا لەناو شاردا جاڕی دا کە کەس لە ماڵەوە نەمێنێتو هەمو بەرەو گۆڕەپانی مەزنی شار بەڕێ بکەون بۆ ئەوە دیمەنی کوشتنی ئەو کوڕە ببینن کە لێی هەڵگەڕاوەتەوەو بێجگە لە ئەم خوایەکی تر بە ڕاست دەزانێت.

پاشا کوڕەکەی بە نیشانە نایەوەو لە تیردانەکەی تیرێکی دەرهێناو خستیە ناو کەوانەکەوەو ڕوی کردە کوڕەکەو پێش ئەوەی تێی بگرێت هاواری کرد بە دەنگی بەرز بە جۆرێك هەمو گۆڕەپانەکە بیستیان کاتێك وتی:

((بە ناوی پەروەدگاری ئەم کوڕە)) هەر کە تەقاندی تیّ دەست بەجیّ دای بەسەر دڵی کوڕەکەداو شەهیدی کرد.

هەمو جەماوەرەکە کە گوێیان لەو وتەیەی پاشایان بو، کاری کردە سەر دڵو جەرگیانو هەر لەوێدا هاواریان کردو وتیان: ((ئەوا هەمو باوەڕمان هێنا بە پەروەرکاری ئەم کوڕە)).

وەزیرو گزیرەکانی پاشا بە هەڵەدەوان لە پاشایان کۆبونەوەو وتیان: گەورەم ئەوەی لێی دەترسای ڕوی دا، دەی سوێند بە خوا ئەوەی تۆ حەزەرت لیّ دەکردو هاتەدی، ئەو خەڵکەی تۆ دەتویست کوڕەکە بکوژی تا کاریان تیّ نەکاتو نەیانکاتە سەر بیروباوەڕەکەی بەڵام وا بە دارشتنی نەخشەی کوشتنی خۆی ئەوەی ویستی بو هاتەدیو هەمو خەڵکی شوێنی کەوتنو باوەڕیان بە تاقە خواکەی هێنا، ئێستا چی بکەین گەورەم؟

پاشا ئەوەندە شبرزو نارەحەتو بەشێوحاڵ بو کە لە تاودا کەفی ئەچەراندو هاواری ئەکردو هەڕەشەی لە خەڵکی گۆڕەپانەکە کردو وتی:

لەسەر هەمو ڕێگاکاندا چاڵی گەورەو قوڵ هەڵبکەننو بە ئاگر تاوی بدەنو ئەوانیش ئەم کارەیان بۆ کرد.

فەرمانی دەرکرد هەر کەسێك پاشگەز نەبێتەوە لەو بیروباوەڕو ئاینی ئەو کوڕە بیخەنە ناو ئەو ئاگرەوەو بیسوتێنن.

ئەوانیش دەستیان کرد بە ڕیزکردنی خەڵکەکەو یەك یەك لێیان دەپرسین ئایا پەشیمان دەبیتەوەو ئەویش دلێرانە دەیوت هەرگیز، هەرگیز لە ئاینی ڕاستو دروستی پەروەردگارمان دەست هەڵناگرینو ئامادەین لەو پێناوەدا بمانسوتێنن..

ئەوانیش وەك عادەتی هەمو طاغوتو ملهوڕەکان بێ ڕەحمانە دەستە دەستە هەڵیان ئەدانە ناو ئەو ئاگرە گەورەیەوە تا ئەوەبو لەناو دەستەی باوەڕهێنەرەکاندا ژنێك خۆگرانە چوە پێشەوە بەڵام بەزەیی بە کۆرپەکەی باوەشیدا هاتەوەو لە دڵی خۆیدا وتی: ئەبێ ئەم منداڵەی باوەشم تاوانی چی بێ کە ببمە هۆی سوتانو مردنی؟

بۆیە نەیدەزانی چی بکات هەنگاوێ بەرەو ئاگرەکە دەڕۆیشتو کە بیری لە منداڵەکەی دەکردەوە هەنگاوی بەرەو دوا دەگەڕایەوە.

منداڵە ساواکەی باوەشی بە فەرمانی خوا هاتە قسەو ڕوی کردە دایکیو بێی وت:

دایە گیان بە ئارامو خۆگر بە چونکە تۆ لەسەر هەقی، ئەویشو خەڵکەکەش کە گوێیان لەو منداڵە بچوکە بو ئەم قسانەی کرد ئەوەندەی تر باوەڕیان چەسپاو سور بون لەسەر گیان فیدایی لە پێناویدا، ئەوە بو ژنەکە بە منداڵەکەیەوە خۆی هەوادایە ناو ئاگرەکەوەو سوتاو چوە ڕیزی ئافرەتانی شەهیدی پێناو ڕێبازی دروستی پەروەردگاری هەمو جیهان.

## پەندو ئامۆژگاریەکانی ئەم چیرۆکە:

١ـ دەبێت مرۆڤی موسڵمان هەمیشە پەند وەربگرێت لە ئوممەتانی پێش خۆی کە ئەگەر هەڵەیان کردبێت ئەو خۆی لێ بپارێزێتو ئەگەر چاکەشیان کردبێت با ئەویش بەو شێوەیە چاکە بکات.

٢ـ دەبێت مرۆڤی موسڵمان ئەوەی لە لا ڕون بێت کە تاقمو پێڕی کوفر بەردەوامنو کۆتاییان نایەتو نابینی سیحرەبازەکە پیربوە خێرا داوا لە پاشا دەکات منداڵێکی وتووریای بداتە دەست تا پاشا بێ جادوگەر نەمێنێتەوە.

٣ـ دەبێت مرۆڤی موسڵمان پەندو لەو پیرە سیحربازە وەربگرێتو نەوەکانی دوای خۆی بۆ هەڵگرتنی مەشخەڵی خواناسیو بیروباوەڕ پەروەردە بکات تا دوای خۆی چرای ئیسلام نەکوژێتەوەو تا قیامەت کاروانی قورئانی بەردەوام گەوهەرو زێڕ بە دەوروبەری ببەخشێت.

٤ـ دەبێت مرۆڤ بەردەوام بەراورد بکاتو بزانێت کێ ڕاست دەکاتو خزمەتکاری ڕاستەقینەیەو دڵو دەرونی بە ناوی قورئان ناو دراوەو کێش لەسەر هەڵەو بەتاڵو بیری پڕوپوچە لێیان دور بکەوێتەوە ئیتر با گەورەترین حیزبو گەورەترین دەسەڵاتیش بنو دەستەی باوەڕیش لاوازو بێ دەسەڵات بنو لە دەرەوەی کورسی حوکمڕانیشدا بن.

نابینی منداڵەکەلە ڕێگەی بەراوردکردنەوە ڕاستی خواناسەکەی بۆ دەرکەوت.

٥ـ دەبێ هەڵگرانی بیروباوەڕی ئیسلامی خۆیان ئامادە بکەن بۆ لێدانو ئەشکەنجەدان لە کاتی بەراوردکردنی پێڕی دەسەڵات لەگەڵ پیاوێکی بێ دەسەڵاتو لاواز بەڵام هەق لە لای ئەوە.

٦ـ دروستە مرۆڤ هەندێ کات پەنا بەرێت بۆ هەندێ سیناریۆ ئەمەش لە پێناو چەواشەکردنی زاڵمو ستەمکارو کاربەدەستان ئەمەش لە پێناو ئەوەی کە هێمنانە بەرەو ئامانجە پیرۆزەکانی بڕواتو هێدی هێدی بە گوێگرتنو خوێندنەوە خۆی بە چەکی باوەڕ پڕچەك بکات ئیتر دوایش درۆکەی ئاشکرا ببێ زیانی نیە.

نابینی خواناسەکە پێی دەڵێ لای سیحربازەکە بڵێ ماڵەوە دوایان خستمو لای ماڵەوەش بڵێ سیحربازەکە دوای خستم.

٧- مرۆڤی موسڵمان جار بە جار ئەتوانێ بۆ خۆیەکلایی کردنەوە بۆ ناو کاروانی باوەڕداران و وازهێنان لە تاقمی نەفامان هەندێ تاقیکردنەوەی دنیایی ئەنجام بدات وەك ئەوەی بڵێ ئەی خوایە گیان ئەگەر لێم ڕازیتو خۆشتم دەوێت با فلان کار ئەنجام بدەم.

نابینی کوڕەکە کوشتنی ئەو دایناصورە زەبەلاحە دەکاتە بەڵگەی ڕاستی بیروباوەڕی خواناسەکەو درۆو ناڕاستی پاشاو سیحربازەکەی.

٨- مرۆڤی موسڵمان نابێ هیچ هەل لە دەست بداتو لە هەر کوێ بۆی لوا کاری خەڵکی ئاسان بکاتو چاکەیان لەگەڵدا بکات تا زیاتر بچێتە ناو دڵیانەوەو شوێنی بکەون.

نابینی ئەو کوڕە چۆن دەستپێشخەری دەکاتو ئەو خزمەتە گەورەیەی شارەکەی دەکاتە بەشی خۆیو لەو دەعبا زەبەلاحە ڕزگاریان دەکات.

٩- ئەگەر خوای گەورە خۆشی ویستیتو لەسەر دەستی تۆ کارێکی موعجیزەئاسای (کەرامەت)ی ئەنجامدا خێرا خۆت بگەیەنەرە مامۆستایانی جێگەی متمانەتو هەواڵەکەیان بۆ بگێڕەوەو بە نهێنی مەیهێڵەوەو مەترسە ئەوە ناچێتە خانەی ڕیاو خۆدەرخستنەوە.

نابینی کوڕەکە چۆن خێرا خۆی گەیاندە مامۆستای خواناسیو ئەو مژدە خۆشەی پێدا کە کوشتنی دەعباکە بو لەگەڵ خۆیەکلاییکردنەوەکەیدا.

١٠- ئەگەر کارێکی جوانت لە خەڵکی دەوروبەرتدا بینی، خێرا دەستخۆشی لێ بکە تا هەست نەکات تۆ حەسودی پێ دەبەیتو پاشان زۆر ئاساییە پێی بڵێ کەوا دیارە لە لای خوا تۆ لە من خۆشەویستتریو کاری گەورەی پێت هەیە.

نابینی مامۆستای خواناسی پیر چۆن تەوازوعو خۆبەبچوك زانین دەنوێنێتو بە منداڵێکی بچوك کە خۆی دەرسی پێ وتوە، دەڵێ: مژدەت لێ بێت تۆ ئەمڕۆ لە من باشترو بەرزتری.

١١ـ مامۆستایانی قوتابی قورئان دەبێت دوای ئەوەی قوتابیەکانیان جوان لە ئیسلامو قورئانی پیرۆز حالّی بون، ئاگاداری ئەوەیان بکەنەوە کە لە دوارۆژدا توشی دەیانو سەدان ئازارو ناڕەحەتیو نان بڕینو دەربەدەری دەبنەوە لە لایەن پێڕی دەسەلاتەوە.

چونکە ئەوان ئەو بیروباوەڕە ڕاستو دروستەیان پێ قبولّ ناکرێت بەلّکو جۆرە موسلّمانەتیەکیان پێ خۆشە لەگەلّ مەزاجو پاراستنی کورسیەکانیاندا بگونجێتو جێیان پێ لەق نەکات، بۆیە ئەوانیش زانایانی ئاینیان هەیە لە کۆشکداو تا حەلالّو حەرام بە مەزاجی ئەو بسەلمێنن.

١٢ـ دەبێ مامۆستایان قوتابیەکانیان لەسەر کەتمانو نهێنی پارێزی پەروەردە بکەنو سڕو نهێنی ڕێکخستنەکانیان لە لای کەس نەدرکێنن بە تایبەت لەناو زیندانەکانی دەسەلاتدارەکانداو لە ژێر ئەشکەنجەدا.

١٣ـ ئەگەر خوای گەورەو پەروەردگار بەهرەیەکی جوانی پێدایت تۆش هەولّ بدە لە پێناوی بلاوکردنەوەی بانگەوازدا تەوزیفی بکەیت.

نابینی کوڕەکە چۆن بەهرەی پزیشکی پێ بەخشرابو ئەویش کەسی چاك نەدەکردەوە تا باوەڕی بە خوای تاقانە نەهێنایەو من خۆم هەر کەسێك داوای بکردایە فێری خۆشنوسی بکەم، مەرجم لێ دەگرت کە دەست بکات بە نوێژکردن.

١٤ـ هەمو لێهاتوویيو تواناو دەست ڕەنگینییەك دەبێت دەبێت بدرێتە پالّ خوای پەروەردگارو بە ئازایەتیو بەخششی ئەوی بزانێت کە تۆ بە دەڕنەفیزو کاوێیەك هەرچی جیهازی پەککەوتەیە چاکی دەکەیتەوە کەچی هەمان دەڕنەفیز بدرێت بە من لەوانەیە جیهازەکە بسوتێنمو تێکی بدەم، دەی خۆ خوا هەمان عەقلّی پێداوین بەلام من لە شتێکی تردا بەخششم پێ دراوە.

نابینی کوڕەکە خۆی هەلّنانیو بلّێ چاکتان دەکەمەوە بەلّکو دەلّێ تەنها خوایە دەتوانێت خەلّکی چاك بکاتەوەو شیفابەخشیش هەر ئەوە.

١٥ــ سودو کەڵكو لێهاتویت بۆ هەموان بێتو تەنانەت کاربەدەستانو بەرپرسانیش سودت لێ وەربگرن چونکە وا دەبێت لەو ڕێگایەوە تۆ بە لوتکەی دەسەڵات ئاشنا دەبیت، هەر لەبەر ئەم هۆیەش بو کە پێغەمبەر (ﷺ) هەوڵی دەدا سەرانی قورەیش موسڵمان بکات چونکە ئەگەر لوتکەی دەسەڵات چاك بو خوارەوەش سەیری ئەوان دەکەنو چاك دەبن.

نابینی کوڕەکە چۆن ئەم پیاوەی هاوڕێی پاشا چارەسەر دەکاتو نەیوت ئەمە یەکێکە لە تاغوتەکانو چاکی ناکەمەوە.

١٦ــ موسڵمانی ڕاستەقینە لە پێناو هێنانەوەی خەڵکی بۆ باوەشی پڕ سۆزی ئیسلام لەبەر ڕەزامەندی خواو بەهەشت ئەوە دەکاتو پارەو سامانی هەمو دنیای لێ ڕابدەن لەسەر ئەو بانگەوازە وەری ناگرێت..

نابینی کوڕەکە چۆن ئەو هەمو پارەیەی ڕەدکردەوەو وتی چاکت دەکەمەوە بە مەرجێك موسڵمان ببیتو پارەو پولی خۆت بۆ خۆت.

١٧ــ مرۆڤی بانگخواز دەیان جەنگی ڕاگەیاندنی لەگەڵ دەکرێتو قسەی ناخۆشو سوکی پێ دەدرێت بەڵام ئەویش دەبێت خۆگرو لەسەرخۆ بێتو تێك نەچێتو شپرزە نەبێت، بەڵکو لەسەرخۆ وەڵامێکی دروستی بداتەوە.

نابینی پاشا بە کوڕەکە دەڵێ: چاك فێری سیحرمان کردی کەچی بە هۆیەوە نەخۆشیو گولو کەڕو لاڵ چاك دەکەیتەوە.. ئەویش وتی: من چاکیان ناکەمەوە بەڵکو خوای پەروەردگار چاکیان دەکاتەوە.

١٨ــ ئەو کەسەی کە دەکەوێتە دەستی ستەمکارانو لە زینداندا جۆرەها ئەشکەنجەی جیاجیای دەدەن تا پاشگەزی بکەنەوە یان زانیای ترسناکی پێ بدرکێنن لەم حاڵەتەدا مەسەلەکە دەکەوێتە نێوان ڕوخسەتو عەزیمەوە، ئەگەر بتوانێت خۆی بگرێتو هیچ نەدرکێنێت ئەوە لوتکەی ڕاستگۆییو باوەڕی بتەوەو ئامادەی شەهیدبونەو لە هەمان کاتدا مرۆڤە باوەڕ لاوازەکان ئەتوانێت ڕوخسەت هەیە گوێڕایەڵی جەلادەکان بکەن بە مەرجێك دڵیان پڕ بێت لە باوەڕ.

نابینی ئەم کوڕە ئەزانێ مامۆستاکەی تەمەنی (٧٠) تا (٨٠) ساڵەو مردنی نزیکە بۆیە دەڵێ بۆچی ناوی نەباتو ئەویش بەشداری تاقیکردنەوەکە بکاتو وانەی خۆگری لێوە فێر ببێت.

١٩- پاشگەزبونەوەو وازهێنان لە ئیسلام هێڵی سورەو هەرگیز لە ژێر هیچ فشارێکدا نابێت جێبەجێ بکرێتو لە ژێر ئەشکەنجەدا لە ئاینەکەی پاشگەز بێتەوە بەڵکو دەبێ مردن قبوڵ بکات نەك ئەو داواکاریە.

نابینی هەرسێ باوەڕدارەکە لە پاشگەزبونەوەدا بە قسەی پاشایان نەکرد بەڵام لە ناوهێنانی مامۆستاکەیاندا گوێڕایەڵیان کردن.

٢٠- موسڵمان بونو باوەڕهێنان زۆر سەنگینەو نابێ بە چاوی سوك سەیر بکرێتو گەورەترین سەرمایەیەو دەبێ مرۆڤ لە پێناوی پاراستنیدا ئامادەش بێت بە مشار دوکەرتی بکەن.

٢١- ستەمکاران ڕەحم لە دڵیاندا نیەو فەرقی گەورەو بچوكو ناکەنو بە هەمو شێوەیەك نەیارانیان لەناو دەبەن ئەگەر منداڵیش بن.

نابینی پاشا ئەو ئەو منداڵەی دایە دەستی جەندرمەکانی تا لەسەر کێوەکەوە بەری بدەنەوە یان نوقمی دەریای بکەن.

نابینی پاشا قورسترین سزا بەسەر ئەو منداڵە باوەڕ پۆڵایینەدا دەدات.

٢٢- مرۆڤ ئەگەر زانی هێشتا پەیامە مەزنەکەی نەگەیاندۆتە شوێنی خۆیو خەڵکی لێ ئاشنا نەکردوە دەتوانێت داوا بکات لە خوا کە تەمەنی درێژ بکات بۆ زیاتر بانگەوازو گەیاندنی ئاینی پیرۆزی ئیسلام بە سەرجەم توێژەکانی مرۆڤایەتی.

نابینی منداڵەکە لەگەڵ ئەوەشدا کە ئاواتی شەهیدی ڕێگەی خوایە کەچی داوا لە خوا دەکات بیپارێزێتو لەسەر کێوەکەیان لە دەریاکەدا نەیکوژێت.

٢٣ــ دیارە مرۆڤی بڕوادار لە مردنو کوشتن ناترسێت بەڵام پێی خۆشە لە کاتو شوێنێکی گونجاودا بێتو مردنەکەشی سودو قازانج بە بانگەواز بگەیەنێتو دوا وانەی زیندوی ژیانی بێت.

نابینی کوڕەکە چۆن نەخشەی کوشتنی خۆی دەکێشێت بۆ پاشا؟

٢٤ــ ئەگەر هەر یەکێکیان دا بەسەرتدا خێرا مەڵێ زۆر باشەو لە بەرژەوەندی خۆمە بەڵکو بیر لە پاشەڕۆژی ئەو بڕیارە بکەرەوە ئەوجا بڕیاری کردنی دەربکە.

نابینی پاشا لە پێناو لەناوبردنی ئەم منداڵەدا حازر بو بە قسەی ئەو دوژمنەی خۆی بکات ئیتر ئەوەی لەبیرچو لە هەمو ئەهلی شارەکە باوەڕ دێنن کاتێك بزانن ئەم پاشایە کە پێشتر نەیتوانیوە ئەم کوڕە لاوە بکوژێت وا ئێستا بە ناوی خوای ئەو منداڵەوە تیری تیَ دەگرێتو یەکسەر دەیکوژێت.

٢٥ــ تۆ کاتێك لە پێناوی بانگەوازی بەرزی پەروەردگارتدا شەهید دەبیت خەمت نەبێت بۆ دوای خۆت، چونکە هەزاران کەس جێگات دەگرنەوەو شوێن ڕێبازە پاکەکەت دەکەونو دژایەتی پاشاکانی سەردەم دەکەنو درێژە بە کاروانی خەبات دەدەن.

نابینی یەك کوڕ کوژرا بەڵام شارێك باوەڕیان هێنا.

٢٦ــ هەر بەیناوبەینی خوای پەروەردگار موعجیزەیەك دەنوێنێتو بەو هۆیەوە دەستەی باوەڕ زیاتر سور دەبن لەسەر قوربانی دانو بەرخورددان.

نابینی خوای گەورە منداڵێکی ساوای خستە گوفتارو هانی دایکی دەدا تا خۆی بخاتە ناو ئاگرەکەوە.

# القصة الثالثة

## جُريج العفيف

عن أبي هريرة (رضي الله عنه)، عن النبي (ﷺ) قال: لم يتكلم في المهد الاّ ثلاثة: عيسى ابن مريم، وصاحب جُرَيج، وكان جريج رجلا عابدا، فاتخذ صومعة فكان بها، فأتته أمّه وهو يصلي، فقالت: يا جريج، فقال: يا رب أمي وصلاتي! ! فأقبل على صلاته، فانصرفت.

فلما كان من الغد، أتته وهو يصلي فقالت: يا جريج، فقال: أي ربٌّ، أميّ وصلاتي؟، فأقبل على صلاته.

فلما كان من الغد أتته وهو يصلي، فقالت: يا جريج! فقال: أي رب! أمي وصلاتي؟، فأقبل على صلاته، فقالت: اللهم لا تُمِته حتى ينظر إلى وجوه المومسات.

فتذاكر بنو إسرائيل جُريجاً وعبادته، وكانت امرأة بغيٌّ يُتمثلُ بحسنها، فقالت: إن شئتم لأفتننّه! فتعرضت له، فلم يلتفت إليها، فأتت راعيا كان يأوي إلى صومعته، فأمكنته من نفسها فوقع عليها، فحملت. فلما ولدت قالت: هو من جريج، فأتوه فاستنزلوه وهدموا صومعته وجعلوا يضربونه، فقال: ما شأنكم؟، قالوا: زنيت بهذه البغي فولدت منك. قال: أين الصبي؟ فجاؤوا به فقال: دعوني حتى أصلي، فصلى، فلما انصرف أتى الصبي فطعن في بطنه وقال: يا غلام! من أبوك؟! قال: فلان الراعي! !، فأقبلوا على جريج يقبِّلونه، ويتمسحون به، وقالوا: نبني لك صومعتك من ذهب، قال: لا، أعيدوها من طين كما كانت ففعلوا.[1]

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: جگە لە سێ کەس نەبێت هیچ کەس لە بێشکەدا نەهاتۆتە قسە، عیسای کوڕی مەریەمو منداڵەکەی لای جورەیج، جورەیج پیاوێکی خواناس بوەن پەرستگەیەکی بۆ خۆی دروست کردبو.

---

١ متفق عليه (البخاري (٣٤٣٦) ومسلم (٢٥٥٠) نیوەکەی تری فەرموودەکە منداڵی سێیەمە کە لە بێشکەدا قسەی کردوەو لە چیرۆکی چوارەمدا باسی دەکەم.

جارێکیان دایکی هات بۆ لایو بانگی کرد: جورەیج، ئەویش وتی: خوایە دایکم لە لایەکو نوێژەکەشم لە لایەکو دەستی کردەوە بە نوێژکردنو دایکیشی ڕۆشتەوە بۆ ماڵ.

لە ڕۆژی داهاتودا هاتەوە بۆ لایو جورەیج هەر لە نوێژدا بو بانگی کرد: جورەیج، جورەیجیش وتی دایکمو نوێژەکەم..و دەستی کردەوە بە نوێژو دایکیشی ڕۆشتەوە بۆ ماڵ.

بۆ سبەینێ دیسان هاتەوە بۆ لایو بانگی کرد: جورەیج، ئەویش وتی: دایکمو نوێژەکەمو دەستی کردەوە بە نوێژکردنەکەی.

دایکیشی وتی: خوایە نەیکوژی هەتا دوچاری ئافرەتی داوێن پیس دەبێت.

بەنی ئیسرائیلیەکان لەناو خۆیاندا باسی خواناسی جورەیجیان دەکردو لەوێ ئافرەتێکی داوێن پیس هەبو کە نمونەی جوانی بو وتی: ئەگەر بتانەوێت لە خشتەی دەبەم! . و چو بۆ لای بەڵام جورەیج هەر ئاوڕی لێ نەدایەوەو لەوێ شوانێکی بینی کە سەردانی پەرستگەکەی دەکردو خۆی دا لە قەرەیو لەگەڵیدا کاری خراپەی کردو سکی پڕبو..

کاتێك منداڵەکەی بو وتی: لە جورەیج بومە، خەڵکیش پەلاماری جورەیجیان داو پەرستگاکەیان ڕوخاند بەسەریدا وتی: بۆ وام لێ دەکەن؟ وتیان: زینات کردوە لەگەڵ ئەم داوێن پیسەداو منداڵت لێی بوە..

جورەیج وتی: کوا منداڵەکە؟ منداڵەکەیاتن هێنا بۆ لای وتی وازم لێ بێنن با نوێژ بکەمو کە لێ بویەوە کوتایە سکی منداڵەکەو وتی: باوکی تۆ کێیە؟ منداڵەکە هاتە قسەو وتی: من کوڕی شوانەکەم!!

خەڵکەکە پەلاماری جورەیجیان داو ماچیان دەکردو دەستیان پێدا دەهێنا وتیان: پەرستگاکەت لە ئاڵتون بۆ دروست دەکەینەوە، وتی: نا.. وەك خۆی لە قوڕ بۆم دروست بکەنەوەو ئەوانیش بۆیان دروست کردەوە.

# چیرۆکی سێیەم

## جورەیجی داوێن پاك

هاوەڵی بەڕێزو دڵسۆزی پێغەمبەرمان (ﷺ) کە ناوی ئەبو هورەیرەیە (ڕەزای خوای لێ بێت) بۆمان دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) جارێکیان چیرکێکی بۆ گێڕاینەوەو فەرموی:

هیچ منداڵێك لە بێشکەدا قسەی نەکردوە جگە لە سێ کەس نەبێت یەکەمیان عیسای کوڕی مەریەم (سەلامی خوای لێ بێت)و دوەمیان: هاوەڵەکەی جورەیج (خواناسی بەنی ئیسرائیل)[1].

مامۆستا جورەیج پیاوێکی باوەڕ بتەوو خواناس بو، ئەم پیاوە مەزنە پەرستگایەکی بۆ خۆی لە قوڕ دروست کردبو لە ناو ئەشکەوتێکداو تیایدا بە تەنها خواناسیو بەندایەتی پەروەردگاری دەکردو بیری لە گەورەییو دەستەڵاتی خوا دەکردەوە.

(ئەم خواناسە، گۆشەگیربو، زۆر بە کەمی دەگەڕایەوە ناو شارو تێکەڵی خەڵکی دەکردو ئەم جۆرە خواناسیە لە پێش ئیسلامدا هەبوەو خوا بۆی دانەنابون بەلام بەرگریشی لێ نەدەکردن چونکە لەبەر ڕەزامەندی ئەو ئەم کارەیان دەکرد، بەلام لەگەڵ هەڵهاتنی خۆری ئیسلامدا ئەم جۆرە گۆشەگیری (ڕەهبانیەتە) قەدەغەکراو پێغەمبەر (ﷺ) هانی هاوەڵانی دەدا تا تێکەڵی خەڵکی بکەنو بە ڕەوشتی جوانو ناوازەتان بۆ لای ئیسلام کەمەندکێشیان بکەن).

جورەیجی خواناس زۆربەی کاتەکانی لەناو نوێژدا بوەو لە خزمەت پەروەردگاریدا بوەو چرکەی بە زایە نەداوەو غەفڵەت بە لایدا نەهاتوە.

---

[1] سێیەمیانکوڕێەیەك لەگەڵ دایکی قسەی دەکردو لە چیرۆکی داهاتودا بە سەربەخۆ وەك چیرۆکێك هێناومە کە لە ڕاستیدا لەگەڵ ئەم فەرموودەیەدا پێغەمبەر (ﷺ) پێکەوە باسی کردون.

ڕۆژێکیـان دایکـی جـورەیج بـیری کوڕەکـەی دەکاتـەوە هەڵدەسـتێ هەنـدێ خـواردنو پێداویستی دەخاتە توێشەبەرەیەك لەگەڵ خۆی دەیبات بۆ سەردانی کردنی کوڕەکەی..

دایکی میهرەبـانی جـورەیج ئـەو هـەموو ڕێگایـەی بـڕیو دۆڵو چـیاکانی تـەی کـرد تـا سەرەنجام گەیشتە بەردەم ەرگای ئەو ئەشکەوتەی کە کوڕە ئازیزەکەی لێ بو، خـۆی پـێ نەگیراو هەر لە دەرەوە وەك شێتی لێ هات بۆ جەرگەکـەیو هـاواری کـرد: کـوڕم جـورەیج گیان.. منم دایکتم، هاتوم بۆ لات.

بەڵام جورەیج لەو کاتەدا لەناو قوڵایی نوێژدا بو زۆر چێژی لێ وەرگرتبو، لـە نوێژەکـەدا دەنگی دایکی ناسیەوەو سـۆزی هـات بـە جەرگیـدا بـیری کـردەوە، بـەڵام دڵـیشی نـەهات نوێژەکەی بۆ ببڕێتو وتی: ئەی خوایە، نازانم نوێژەکەم بەردەوام کـەم یـان بیـبڕمو بـچمە خزمەت دایکمو دەستەکانی ماچ بکەم، ئای خوایە گیان خۆ ئەو ڕێگا سـەختەی لەبـەر مـن بڕیوە..

بەڵام نا دایك سەد ئەوەندەش خۆشەویست بێت نایگۆڕمەوە بـە نوێژەکـەمو نوێـژی بـۆ نابڕم، چۆن حزوری پەروەردگارم بەجێ دێڵم لەبەر دایکم..

دایکی کە زانی کوڕەکەی لەناو نوێژدایـەو دڵـی نایـە نوێژەکـەی ببڕێـت دیاریـەکانی بـۆ بـەجێ هێـشتو بـە ئاسـپایی گەڕایـەوە بـۆ مـاڵو لـە دڵـی خۆیـدا وتـی قـەیناکا نوێژەکـە گەورترەو کێشە نیە جارێکی تر دێمەوە بۆ سەردانی، بە قوربانی هەناسەکەی بم.

بە هەمان شێوە جارێکی تر هاتەوە بۆ ئەشکەوت بۆ سەردانی جورەیجی کوڕیو بانگی کرد: جورەیج گیان، جورەیج گیان.

جورەیج وتی: ئەی خوایە گیان، دایکم بانگم دەکاتو لەناو نوێژیش دام نازانم بـڕۆم بـە دەمیەوە یان بەردەوام بم لەسەر نوێژەکەم (و ئەمـەی وت)و لەسـەر نوێژەکـەی بـەردەوام بۆیـەوەو دایکـی پـرچ سپیـشی زۆر خەفـەتی خـوارد بـەوەی بـۆ جـاری دوەم نـەیتوانی کوڕەکەی ببینێتو لەگەڵیدا تێر دابنیشێتو تاسوقی لێی بشکێت.

بە دەم بۆڵەبۆڵ و ورتەورتی ناڕەزاییەوە دوبارە دیاریەکانی بۆ دانا و بە ئەسپایی گەڕایەوە و بەڵام هیچی دەرنەبڕی.

بۆ جاری سێیەم یادی کوڕە چاك و خواناسەکەی هاتەوە بەسەریداو بە خواردن و کەلوپەلی زیاترەوە بەرەو ناو چیاکان ملی ناو بۆ سەردانی کوڕی دور لە ماڵ و منداڵی کەوتەڕێ و هەرکە گەیشتە بەر دەرگای ئەشکەوتەکە دیسان بانگی کردو وتی: جورەیج، کوڕی شیرینم، منم هاتوم بۆ لات دایکتم عەزیزەکەم وەڵامم بدەرەوە.

دیسان جورەیج بە هەمان شێوەکانی پێشو هەر لە نوێژدا بو (لە ڕازو نیازدا) بو لەگەڵ پەروەردگاری خۆشەویستیدا بۆیە لە دڵی خۆیدا وتی: ئای خوایە گیان، بە خوا ئەوە دایکمە هاتەوە بە قوربانی ئەو ڕێگایەی بم کە بڕیویەتی بەڵام چارم چیە وا لە نوێژدام، ئایا بیبڕم و بچم بە دەمیەوە؟ نا نا بە خوا هەرگیز هەڵەی وا ناکەم، هەر چۆنێك بێ دایکم زویر نابێ بەڵام نوێژەکەم لە دەست دەردەچێت، بۆیە گوێی بە دایکی نەداو لەسەر نوێژ بەردەوام بو!

ئەم جارەیان دایکی خۆی پێ نەگیراو پێش ئەوەی دیاریەکانی بۆ بەجێ بهێڵێت، دڵی لێی زویر بو دەستی بەرزکردەوە بۆ لای پەروەردگارو دوعایەکی خراپی لێ کرد ئەوجا ئەسپایی گەڕایەوەو بڕیاریشی دا ئیتر نەیەتەوە بۆ سەردانی جورەیج تا ئەو نەیەتە ماڵەوەو دەستەکانی دایکی ماچ نەکات و داوای لێبوردن نەکات.

لە نزاکەیدا وتی:

ئەی پەروەردگارم مادەم ئاوا دڵی دایکی لە لا ئاساییەوە زویری کردم دەی خوایە پێش ئەوەی بمرێت ئافرەتێکی داوێن پیس ببینێت.

ڕۆژان تێپەڕین و جورەیجی خواناس ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ناوبانگی خواناسی و پیاو چاکیەکەی زیادی دەکردو تا وای لێ هات لەناو بەنی ئیسرائیلیەکاندا باس هەر باسی جورەیج بو.

دەستەی باوەڕ بە شانازیەوە باسیان دەکردو ئاواتیان پێ دەخواستو بە پیرۆز ناویان دەبرد..

لە بەرامبەردا زومرەی نەفامانی ناو بەنی ئیسرائیل زۆر قاس بون پێیو زەمیان ئەکردو دەیانوت بۆ ڕوپاماییی پەرستش دەکاتو کەسێکی داخراوەو کۆمەڵایەتی نیە بۆیە گۆشەگیر بوە لەو شاخانەدا.

لەناو ئەم زومرەیەدا کەسانێك دەستیان کرد بە پیلانگێڕانو هەوڵدان بۆ ناشیرین کردنی ناوبانگی جورەیجی خواناس..

تا کار گەیشتە ئەوەی هەستن بە بەکارهێنانی جوانترین ئافرەتی ئەو سەردەمە کە تا بڵێی بەدڕەوشتو داوێن پیس بو، وتیان پێی: خانمەکەم ئەتوانی جورەیجمان بۆ لە خشتە بەریتو کاری حەرامی پێ بکەیت؟

ئەویش لە وەڵامدا وتی: زۆر ئاسانە بۆ من خۆم پیشانی هەر کەس دابێت یەکسەر خۆی پێ نەگیراوەو خوای لەبیرچۆتەوەو کاری ناشەرعی لەگەڵ کردوم..

ئەوانیش لەگەڵی ڕێك کەوتن کە ئەگەر لە خشتەی بەرێت خەڵاتێکی گەورەی بکەن..

ئافرەتەکەش خۆی جوان کردو جلی تەنكو تەنگو تەسکی لەبەر کرد بەرەو ئەشکەوتەکە کەوتەڕێ.

دیارە بەناوی پرسیاری شەرعیەوە خۆی کرد بە ئەشکەوتەکەداو بە غەمزەو نازەوە بە دەمیەوە پێکەنیو جوانیەکانی خۆی دەردەخست..

بەڵام جورەیجی خواناسو پیاو چاك زۆر ئازایانە زاڵ بو بەسەر شەیتانو حەزو ئارەزوەکانیداو لە ئافرەتەکە توڕە بو بە پەلە هەڵی ساند دەری کردە دەرەوەو پێی وت نەخەڵاتابی جارێکی تر بێیت بۆ لام من زۆر لەوە بەرزترم کە لەبەر خاتری ئافرەتێکی وەك تۆ لە لای خوا خۆم ڕیسوا بکەمو لە لای خەڵکیش بە بەدڕەوشتو داوێن پیس ناو دەربکەم.

ئەمەی وتو خێرا كردیە دەرەوە بەڵام ئافرەتەكە نایەوێت خەڵكی بزانن كە دۆڕاوەو جورەیج مەیلی نەداوەتیۆ لەم كارەیدا شكستی هێناوە.

بۆیە سەیری كرد دەبینێ وا شوانێك بە مەڕەكانیەوە لە ئەشكەوتەكە نزیك بویەوە كە جاران سەردانی جورەیجی پیاوچاكی كردوەو شیری مەڕەكانی بۆ دۆشیوەو بە دیاری بۆی هێناوە.

كیژە جوانو شۆخو شەنگەكە چوە ڕێگایو بە غەفزەو نازێكەوە بە دەمیەوە پێكەنیو ئەویش چونكە بیروباوەڕی بتەو نەبو لە بەردەم جوانی ئەم ئافرەتەدا خۆی پێ نەگیراو سەیری كردی بە دەمیەوە پێكەنیو پاشتر (پەنا بە خوا) كاری داوێن پیسی لەگەڵدا ئەنجام داو كچەكەش لەسەر ئەو كارە حەرامە شوانەكەی خەڵات كرد.

هاتەوە بۆ لای (بەنی ئیسرائیلی)یەكانو مژدەی سەركەوتنی پێدان لە كارەكەیداو ئەوانیش خەڵاتێكی باشیان كرد بە مەرجێك ڕاست بكاتو سكی پڕ بوبێت..

ئەوەبو پاش ماوەیەك بە ئاشكرا سكی ئەو ژنە بەرزبویەوەو لە ئاكامدا كوڕێكی بو، بە پەلە كوڕەكەی لە پارچە قوماشێك قوماتە كردو بردی بۆ لای پیاوخراپانی ناو بەنی ئیسرائیل وتی ها ئەوە كوڕەكەی جورەیجە، چی لێ ئەكەن پێی بكەن،و لە كۆڵی منی بكەنەوە..

ئەوانیش چونكە خۆیان سوكو سەلیمو ڕەوشت نزم بون، پێیان ناخۆش بو جورەیج ئاوا ناوبانگی دەركردوە لە خواناسیو ڕەوشتبەرزیو موسڵمانەتیدا، بۆیە ئەو دیمەنەیان بە هەل زانی تا خەڵكی شارەكەی لێ تێ بگەیەننو لەبەر چاوی خەڵكە عامەكەی بخەن، ئا بەو شێوەیەی جاران ڕێزی نەگرنو بە چاوێكی قورسەوە سەیری نەكەن.

جەماوەریش (زۆر زو هەڵئەچێتو تورە ئەبێ) لە ئەو كەسانەی كە بە جۆرێ سەیریان دەكەنو سەرەنجام وا دەرنەچونو بە كەسێكی گەندەڵو ڕەوشت نزم دەرچون.

لەسەر لە بەیانی ئەو ڕۆژەدا خەڵكی چونە سەر جورەیجو خواناسگەكەیان ڕوخاندو دەستیان كرد بە شەقو زللە لێدانی مامۆستای خواناسی بێ ئاگا (لەو داوەی ناحەزانی بەرنامەی خوا بۆیان نابویەوە)و ئەویش هەر هاواری دەكردو دەیوت:

بۆ خاتری خوا چیم کردوە، تاوانم چیە؟ بۆ ئاوا لێم ئەدەن من کەی شایانی ئەم سوکایەتیەم؟ خۆ جاران دەستەو نەزەر ڕێزتان لێ دەگرتمو دەستە دەستە دەهاتن بۆ لامو گوێتان لێ دەگرتمو پرسیاری شەرعیتان دەکرد، من تێ ناگەم توخوا چی بوە؟

وتیان: وسبە زۆر پرسیار مەکە، تاقەتی گوێ گرتنمان نەماوەو هەمو پڕین بۆت، تۆ خۆت بە خواناسو پیاو چاك دەدەیتە قەڵەم کەچی ئافرەتێك هاتوە بۆ خواناسگەکەتو توش بە زۆر گرتوتەو بەدڕەوشتیت لەگەڵدا کردوەو کوڕێکیشت لێی بوە!!

مامۆستا (زۆر بێ ئاگا بو لە مەسەلەکە) سەری سوڕماو بەڵام خۆ پاڕانەوەو بەرگریکردن هیچ سودی نیەو هەر گوێشی بۆ ناگرن، بۆیە داوای کرد لێیان ئادەی ئەو کوڕەم بۆ بێنن.

ئەوانیش لە قوماتەیەکدا بۆیان هێناو لە بەر دەمیدا دایان ناو وتیان ئەوە منداڵەکەتە، خۆ ئیتر قسەت نەماو فەرمو دان بنێ بە ڕاستی مەسەلەکەداو هەقیقەتەکەیمان بۆ ڕون بکەرەوە.

مامۆستای خواناسیش (پێکەنینی دەهات بەم قسانە بۆیە داوای کرد لە خوا کە پاکی دەربخات بۆ خەڵکەکە چونکە پاکو ڕەوشت بەرزە بەڵام بەڵگەی پاکی پێ نیە مەگەر خوا پاکی دەربخات).

هیچ چارێکی نەماو خەریك بو دەست بکەنەوە بە لێدانی.. بەڵام ئاماژەی کرد بۆ خەڵکەکە کە لێی گەڕێن تا دو ڕکات نوێژ دەکاتو لە نوێژەکەدا لە خوا پاڕایەوە کە لەم ئەستەنگە ڕزگاری بکاتو پاش ئەوەی لە نوێژەکەی بویەوە هات بۆ لای منداڵە ساواکەو بە سوکیو لەسەرخۆ دەستی کوتایە سکیو لێی پرسی:

ئەی منداڵە کۆرپەلەکە پێم بڵێ باوکی تۆ کێیە؟ خەڵکی وا دەزانن منم، ڕاستیمان بۆ ڕون کەرەوەن وردیلە گیان؟

خەڵکەکە واقیان وڕماو زۆر سەرسام بونو خەریك بو بە شێتیش دەری بکەن کەوا خەریکە لەگەڵ منداڵێکی ساوادا قسەت ئەکات!!

بەلاّم سەرسامی خەڵکەکە ڕەویەوەو بینیانو کۆرپەلە کەوتە قسەو وتی: من کوڕی شوانەکەمو من کوڕی فلاّن کەسی شوانم!!

پاكو بێگەردی بۆ تۆ پەروەردگار هەر خۆت ئەتوانی لە کاتە ناهەموارو تەنگەشەکاندا فریای بەندەکانت بکەویتو پاکیان بۆ دەوروبەری دەربخەیت.

خێرا خەڵکەکە ناردیان بە دوای شوانەکەداو هێنایانو ئەویش دانی نا بە تاوانەکەداو وتی من کاری خراپەم لەگەڵ کردوەو جورەیج زۆر پاكو ڕەوشت بەرزە.

هەر کە خەڵکەکە ئەو کەرامەتە گەورەیەیان بە چاوی خۆیان بینیو بە چاوی خۆیان شاهیدی شوانە بەدڕەوشتەکەیان بۆ دەرکەوت.. هەر هەمو پەلاماری قاچو دەستی جورەیجی مامۆستاو خواناسیان داو دەستیان کرد بە ماچکردنیو داوای لێبوردنیان لێ دەکردو خەجاڵەتیان دەردەبڕی بۆی.

هەر هەمو پێشنیاریان کرد بۆ مامۆستا جورەیج کە ڕێگەیان بدات خواپەرستگە ڕوخاوەکەی بە ئاڵتون دروست بکەنەوە.

بەلاّم جورەیج قبوڵی نەکردو وتی: هەرگیز نامەوێ لە ئاڵتون بۆم دروست بکەنەوە، بەلاّم مادەم خۆتان پێتان خۆشە بۆم دروست بکەنەوە با وەك خۆی جاران لە قوڕ بۆم بنیات بنێنەوە.

ئەوانیش گەورەو بچوك، ژنو پیاو هەریەکە کارێکی گرتە ئەستۆو لە ئەنجامدا خواپەرستگەکەیان بە جوانترو گەورەترو ڕازاوەتر بۆ دروست کردەوە.

## ئەو پەندو ئامۆژگاریانەی لەم چیرۆکە وەردەگیرێت:

١ـ خوای گەورە هەر بەینە نا بەینێ گەورەی خۆیو دروستی بەرنامەکە بۆ مرۆڤەکان دەسەلمێنێت لە ڕێگەی دەرخستنی موعجیزەو ڕوداوگەلێك کە بە دەرن لە توانای مرۆڤ.

نابینی مندالّی ساوای تازە لە دایك بو دەخاتە قسەو گەورەیی خۆیو ڕاستیو پاکی بەندە خواناسەکانی بۆ خەڵکی ڕۆشن دەکاتەوە.

٢ـ خواپەرستی بە تەنهایو گۆشەگیری لە ناو چیاو ئەشکەوتەکاندا یان لەناو تەکیەو مزگەوتەکاندا بۆ خواپەرستیو خۆدابڕین لە خەڵکی لە ئیسلامدا حەرام کراو بە پێچەوانەشەوە هانی خەڵکی دا بۆ تێکەڵکردنی خەڵکیو ڕێنمونی کردنیانو خۆگرییو ئارامی لەسەر نارەحەتیو قسەو قسەڵۆکیان. بە پێچەوانەی ئوممەتانی پێش ئیسلام کە بەرگریان لێ نەکرابو، ئەوەشی ئەمڕۆ بە چلەکێشان لەناو موسڵماناندا ناوی دەرکردوە، ئەوەش جۆرە ڕەهبانیەتێکەو دروست نیە.

٣ـ بەم چیرۆکەدا وا دیارە لە هەمو ئاینەکاندا خوای گەورە پلەوپایەی تایبەتی بەخشیوە بە دایكو گوێڕایەڵیو ڕێزلێگرتنی بە بەشێك لە خواناسی داناوەو فەرمانی پێ کردوەو ئیسلامیش ئەوەندە بەرز سەیری دایکانی کردوە کە لە زمانی پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەری بڕیوە بەهەشت لە ژێر پێی دایکاندایە.

٤ـ دایك ئەوەندە ڕۆڵەکانی خۆی خۆش دەوێت تا سێ جار هەر خۆی گرتو لە کوڕەکەی توڕە نەبو، وە کاتێکیش توڕە بو نزایەکی وای لێ نەکرد کە لەناو بچێت یان بێباوەڕ ببێت یان دوچاری بەدڕەوشتی ببێت بەڵکو پێی وت: یاخوا پێش مردنیو لە ژیانیدا ئافرەتێکی داوێن پیس ببینێت!

٥ـ هەمیشەو لە هەمو سەردەمێکدا بانگخوازانو خواناسان ناحەزیان بۆ هەڵدەکەوێتو بەو سومعە جوانو ناودەرکردنە پڕ لە شانازیەکەیان پەسنو هەمو جۆرە ڕێگایەکی ناشیاوو ناشایستە دەگرنە بەر بۆ ناشیرینکردنو ناوزڕاندنو لەبەرچاوی میللەتیان بخەن.

٦- مەرج نیە ئەو كەسانەی دژایەتی خواناسانی بانگخوازان دەكەن كافرو بێباوەڕو دوژمنانی ئیسلام بن، بەڵكو ڕودەدات هەر برای موسڵمانیشیەتی ئەم دژایەتیەی دەكاتو لەوانەشە بۆ ناشیرینكردنی پەنا بەرێت بۆ هەمو كەسێكی بەدڕەوشت یان هەر لایەنێكی دور لە خواو دەست ئەخاتە ناو دەستی لە پێناو بچوككردنەوەو كەنارگیركردنو ئابلۆقەدانی شوێنكەوتوانی قورئان.

٧- دەبێ بانگخوازانی ڕێگەی خوا زۆر وریا بنو بچوكترین گوناهیان لێ دەرنەكەوێتو خۆیان لە شوبوهاتیش بە دور بگرنو چونكە ئەوەی موسڵمانی ڕاستەقینەو خواناس لە بەناو موسڵمانە ڕەوشت نزمەكان جیادەكاتەوە سومعەی بەرزو ئەخلاقی قورئانیانەو نابێ ئەم جیاییە بە سوك سەیر بكەنو لە ئاسانترین داوای شەیتاندا بیدۆڕێنن.

٨- هەمیشە دوژمنان هەوڵ دەدەن لەناو موسڵماناندا كۆمەڵی باوەڕلاوازو دور لە خواناسیو ڕەوشت نزم بدۆزنەوەو بە كاریان بێنن بۆ دژایەتی كردنی هەڵگرانی بانگەوازی خواو شێواندنی ناوی جوانیان.

٩- ئافرەت گەورترین چەكی دەستی دوژمنانی ئیسلامەو لە ڕێگەی ئافرەتەوە ویستویانە گەنجەكان لە قورئانو مزگەت دوربخەنەوەو لەناو زەلكاوی شەرواڵ پیسیو بەدڕەوشتیدا بیانگەوزێننو بۆ ئەم مەبەستە ئافرەتان لە حیجابو جلوبەرگی پۆشتە دادەڕننو قاچو باڵو گەردنی سپیان پێ دەردەخەنو جۆرەها داو دەرمانو میكیاجیان بۆ داهێناون تا ڕاوی گەنجەكانیان پێ بكەن.

١٠- لەوانەیە ئەو داوەی ناحەزانی خواناسان دەینێنەوە سەربگرێتو ئەم دەستو دەمو دڵپاكانە بە درزو گەندەڵو داوێن پیس تۆمەتبار بكرێنو ئەمانیش دەبێت زۆر بە هێمنیو خوێن ساردانە وەڵامیان بدەنەوەو پاكی خۆیان ڕابگەیەنن.

١١- دەبێ بانگخوازان زۆر میللەتیان خۆش بوێتو خەڵكە عامەكە هیچ تاوانێكی نیە چونكە وا دەبێ دەستەڵاتداران وایان تێ دەگەیەنن كە ئەو كەسانەی ئێوە بە چاوی گەورەو قورسو گران سەیرتان دەكردن وا ئێستا جۆرەها تاوانیان ئەنجام داوەو ئەوانیش توانای بەدواداچونو لێكۆڵینەوەیان نیە بۆیە خێرا باوەڕ دەكەنو جاری واش هەیە دێنە سەریان بارەگاكانیان بەسەردا دەڕوخێنن.

١٢ـ دەبێ بانگخوازان زۆر دڵساف‌و بە بەزەیی بن بەرامبەر خەڵکە عامەکەو زۆر لێبوردە بن بەرامبەریان هەر کاتێك داوای لێبوردنیان لێ کردن لێیان ببورن‌و ڕقی کۆنیان لەگەڵدا نەخوێننەوە..

نابینی مامۆستا جورەیج (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لەوانەیە دەیان شەق‌و زللەو بۆکزی خواردبێت بە دەستیان بەڵام ئەزانی ئەوانە خاوەنی دڵێکی پاك‌و بێ کینەن‌و بە هەڵە لە مەسەلەکە گەیەنراون‌و هەر کە ڕاستیان بۆ دەربکەوێت داوای لێبوردن دەکەن‌و پەشیمانی دەردەبڕن.

١٣ـ دەبێ زۆر دڵنیا بین کە ئێمەی دەستەی باوەڕو خواناس لە ڕوبەڕوبونەوەماندا لەگەڵ زومرەی ناحەزانی ئیسلامدا سەرەنجام بردنەوە هەر بۆ ئێمەیە چونکە ئێمە لە پاکی خۆمان دڵنیاین‌و پەتی درۆی ئەوانیش کورتەو بۆ میللەت ئاشکرا دەبێت.

١٤ـ بەڵام ئەگەر داوەکە زۆر بە وردی نرابویەوەو لە توانای دەستەی باوەڕدا نەبو پاکی خۆیان بسەلمێنن، نابێ دەستەوسان بن شان شل بکەن بۆ لێدان‌و پاکتاوکردنیان، بەڵکو دەبێ پەنا بۆ نوێژی سوننەت‌و شەونوێژ بەرن‌و تیایدا بە گریان‌و پاڕانەوەوە لە خوا داوا بکەن بە قودرەت‌و گەورەیی خۆی پاکی‌و ڕەوشت بەرزیان ئاشکرا بکات‌و ئەویش ئەو کارەیان بۆ دەکات (ان شاء الله).

١٥ـ لە کاتێکدا دەستەی باوەڕ لە کێبەرکێکەدا لە زومرەی ناحەزانی ئیسلام ئەباتەوەو سەردەکەوێت نابێ جامی تورەیی بڕژێنێت بەسەر ئەو کەسانەدا کە ناهەقیەکەیان پێکردوە، بەڵکو بیانکات بە دو بەشەوە لە خەڵکە عامەکە خێرا خۆش ببێت بەڵام لە دوژمن‌و ناحەزان نەبورێت بەڵام حەکیمانە هەڵیگرێت بۆ ڕۆژی خۆی.

١٦ـ دەستەی باوەڕ گاڵتەیان دێ بە پارەو پول‌و ئاڵتون‌و زێڕو هەڵپەهەڵپی بە دوادا ناکەن‌و لەسەر سومعەی جوان‌و ناوی بانگخوازی موسڵمانەتی کۆشك‌و تەلار دروست ناکەن‌و نانی پێوە ناخۆن.

## القصة الرابعة

## ( ام تتمنى )

((.....وبينا صبي يرضع من أمه، فمر رجل راكب على دابة فارهة وشارة حسنة، فقالت أمه: اللهم اجعل ابني مثل هذا! فترك الثدي، وأقبل إليه، فنظر إليه وقال: اللهم لا تجعلني مثله، ثم أقبل على ثديه فجعل يرتضع"، فكأني أنظر إلى رسول الله (ﷺ) وهو يحكي ارتضاعه بأصبعه السبابة في فيه، فجعل يمصها، قال: (ومرُّوا بجارية وهم يضربونها ويقولون: زنيتِ، سرقتِ! وهي تقول: حسبي الله ونعم الوكيل. فقالت أمه: اللهم لا تجعل ابني مثلها، فترك الرضاع ونظر إليها وقال: اللهم اجعلني مثلها، فهنالك.

تراجعا الحديث، فقالت: مر رجل حسن الهيئة، فقلت: اللهم اجعل ابني مثله، فقلتَ: اللهم لا تجعلني مثله. ومروا بهذه الأمَة وهم يضربونها ويقولون: زنيتِ، سرقتِ، فقلت: اللهم لا تجعل ابني مثلها، فقلتَ: اللهم اجعلني مثلها؟!

قال: إن ذلك الرجل كان جبارا، فقلت: اللهم لا تجعلني مثله، وإن هذه يقولون لها: زنيتِ، ولم تزنِ، وسرقتِ ولم تسرق، فقلت: اللهم اجعلني مثلها.[1]

---

١ متفق عليه، البخاري (٣٤٣٦) وسلم (٢٥٥٠)، ئەم فەرموودەیە تەواوکەری فەرموودەی پێشوە منداڵی سێیەمە کە قسەی کردوە بە ساوایی، بەلآم لەبەر ئەوەی چیرۆکێکی مانابەخشی جیایە من کردم بە چیرۆکێکی سەربەخۆ.

# چیرۆکی چوارەم

## دایکێك ئاوات دەخوازێت

جارێك دایکێك کۆرپە ساواکەی لە باوەشدا بو، شیری پێ دەدا، لەو کاتەدا سوارچاکێك بە ئەسپێکی ڕەسەنو جلوبەرگێکی کەشخەوە لەوێوە تێپەڕی.

ئەم دایکە سەری هەڵبڕیو دیمەنی ئەو پیاوە جوانەی بینی زۆر سەرسامی بو، بە دەم خۆیەوە وتی: ئەی پەروەردگارم لە دواڕۆژدا ئەم منداڵەی منیش وەك ئەم پیاوەی لێ بێت، ببێتە سوارچاکێکی کەشخە.

منداڵەکە لەم کاتەدا دەمی لە مەمکی دایکیدا بو شیری دەخواردو وازی لە شیرخواردن هێناو سەری هەڵبڕی بۆ لای دایکیو پاشان سەیرێکی پیاوەکەی کردو هاتە قسەو وتی:

ئەی پەروەردگارم هەرگیز وەك ئەو پیاوەم لێ نەکەیت! ئەمەی وتو دەمی بردەوە بۆ مەمکەکانی دایکیو دەستی کردەووە بە شیر خواردن، ڕاوی دەڵێت: لە کاتێکدا پێغەمبەر (ﷺ) باسی ئەو منداڵەی دەکرد کە چۆن مەمکەمانی دایکی دەمژێتو ئەویش پەنجەی شایەتومانی (السبابة) خستبوە دەمی خۆیەوەو ئەیمژی.

پاشان ڕۆیشتنو دایان بە لای کچێکدا کە کەسوکارەکەی لێیان دەداو بە توڕەییەوە پێیان دەوت: بەدڕەوشتیت کردوە؟.. دزیت کردوە؟ ئەویش لێیان دەپاڕایەوەو دەیوت: هەرگیز شتی وام نەکردوە بەڵام گوێیان بۆ نەدەگرتو ئەویش هەر دەیوت: بەسمە کە خوا ئاگادارە لە پاکیمو هەر ئەویش ئیشو کارمی بە دەستە.

دایکەکە لەم کاتەدا سەیرێکی کۆرپە ساواکەی خۆی کردو وتی: ئەی پەروەردگارم ئەم کوڕەم وەك ئەو کچە لێ نەکەیت.

کۆرپە ساواکەش (دیسان) سەیرێکی ئەو کچەی کردو وتی: ئەی پەروەردگارم وەك ئەو کچەم لێ بکەیت!.

دایکەکە زۆر سەرسام بو (چاوەکانی ئەبلەق بو) دەیوت: ئەی خوایە ئەم منداڵەم چۆن قسە دەکات، کاتێك من هەرچی دەڵێم ئەو پێچەوانەکەی دەڵێت!

بۆیە بڕیاری دا ڕوی تێ بکاتو قسەی لەگەڵدا بکات تا بزانێ مەسەلەکە چیەو چ نهێنیەك لەوەدا هەیە کە حەزی نەکرد وەك ئەو سوارچاکەی لێ بێت!! کەچی حەزی کرد وەك ئەو کچەی لێ بێت کە بەسەر دزیو داوێن پیسیەوە گیراوە!!.

ئەوەبو پێی وت: ئەی کوڕی خۆم مەسەلە چیە کە پیاوێکی سوارچاكو کەشخە دای بە لاماندا من زۆر حەزم کرد لە دوارۆژدا تۆش ئاوا جوانو کەشخە بیو دوعای ئەوەم بۆ کردی کەچی تۆ وتت: خوایە وەك ئەو پیاوەم لێ نەکەیت؟!

هەروەها (مێشکم تەقی) کاتێك دامان بە لای کچێکدا کە لەسەر دزیو داوێن پیسی گیرابو لێیان دەداو منیش وتم: خوایە ئەم کوڕەم وەك ئەو کچەی لێ نەیەت.

کەچی تۆ وتت: یاخوا وەك ئەو کچەم لێ بێت!. من تێنەگەیشتمو زۆر سەرسامم وەختە تێك دەچم..

کۆرپە ساواکەش هاتە گوفتار وتی: ئەو پیاوەی کە ئەسپی ڕەسەنو جلی کەشخەی لەبەردا بو پیاوێکی خراپو ستەمکار بو، بۆیە وتم: خوایە منیش دوچاری خراپەکاریو ستەم نەکەیتو وەك ئەو پیاوەم لێ نەیەت.

هەروەها کاتێك بینیمان ئەو کچە سزا دەدراو لێیان دەدا پێیان دەوت: دزیت کردوە بەڵام ئەو دزی نەکردبو، یان دەیانوت: کاری بەدڕەوشتی کردوە بەڵام ئەو بێ تاوان بو کاری بەدڕەوشتی نەکردبو، بۆیە وتم خوایە منیش وەك ئەو کچە پاكو بێ تاوانم بکەیتو لەو بکەم.

دایکەکە گوشی بە خۆیەوەو تێر ماچی کرد..

## ئەو پەندو ئامۆژگاریانەی لەم چیرۆکە وەردەگیرێت:

١ـ مەرج نیە هەر کەسێك جلوبەرگی جوان‌و ئۆتۆمبیلی مۆدیل بەرزی لە ژێردا بو ئیتر ئەوە پیاوی چاکەو ئاواتی پیّ بخوازرێت، بەڵکو باشتر وایە مرۆڤ بڵێ خوایە وەك ئەم پیاوەم لیّ بکەیت ئەگەر ئەزانی خێری دنیاو ئاخیرەتمی تێدایە.

٢ـ مرۆڤ بیّ هەڵە نیەو کاتێك رایەك یان بۆچونێك دەردەبرێت نابیّ وابزانێت ئەو ڕاسترین بۆچونەو لەوە جوانترو باشتر نیە، یان جگە لەو بۆچونە هەمو بۆچونەکانی تر بە هەڵەدا چون‌و گومڕاییە.

ئەو دایکە منداڵێکی ساوای ناو بێشکە بەرپەرچی دەداتەوەو ڕایەکەی بۆ ڕاست دەکاتەوە.

٣ـ نابێت مرۆڤی موسڵمان زاهیربین بێت‌و هەر کاتێك چاوی کەوت بە خانویەکی جوان یان ئۆتۆمبیلێکی مۆدیل بەرز یان بەرپرسێکی گەورەی پاسەواندار، خێرا نەڵێت: الله خۆزگە هی من بوایە! یان ئەو بەرپرسە کوڕی من بوایە، کیّ ئەڵیّ ئەو بەرپرسە دزێکی پیاوکوژی مەی خۆر نەبێت.. یان ئەو ئۆتۆمبیلە یان خانوەکە بە پارەی حەرام نەکڕابێت‌و خانوە بچوکەکەی تۆ زۆر لە ئەو موبارەکترو بەڕێزترە لە لای خوا.

٤ـ یان بە پێچەوانەوە هەر کاتێك کەسێکمان دی گوناهێکی دەکرد یان لەسەر گوناهێك گیرابو خێرا زەمی مەکەو نەفرەتی لیّ مەکەو قسەی پیّ مەڵیّ چونکە ژیان شاراوەو نهێنیەکانی لە ئاشکراو دیارەکانی زۆر زیاترن.

کیّ نالیّ کەسێکی پاك‌و بیّ گوناه نیە بە هەڵە گیراوە یان ناچار بوەو تێکەوتوەو لە ئەسڵدا کەسێکی موسڵمان‌و خواناسەو خاوەنی دڵێکی باوەڕدارە.

٥ـ ئەگەر کەسێکی لە خۆمان منداڵتر یان خوێندەوارێکی مامناوەند یان ئاست نزم شتێکی بۆ ڕاست کردینەوە، ئەوە لە ئیسلامدا جێگەی دەست خۆشی‌و سوپاسکردنیەتی، ئەو شەیتانە پێمان دەڵیّ: عەیبە بۆ تۆیەکی عەلامەو زیرەك‌و خواناس خەڵکی منداڵ‌و نەخوێندەوارو عەوام ڕەخنەت لیّ بگرن‌و هەڵەت لیّ بدۆزنەوە، پێویستە گوێیان بۆ نەگریت!!

# القصة الخامسة

## إتق الله

عن ابن مسعود (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ): (إن أول ما دخل النقص على بني إسرائيل انه كان الرجل يلقى الرجل فيقول: يا هذا اتق الله ودع ما تصنع فإنه لا يحل لك، ثم يلقاه من الغد وهو على حاله، فلا يمنعه ذلك من أن يكون أكيله وشريبه وقعيده، فلما فعلوا ذلك ضرب الله قلوب بعضهم ببعض، ثم قال: ﴿ لُعِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ لِسَانِ دَاوُۥدَ وَعِيسَى ٱبۡنِ مَرۡيَمَۚ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَواْ وَّكَانُواْ يَعۡتَدُونَ ۝٧٨ كَانُواْ لَا يَتَنَاهَوۡنَ عَن مُّنكَرٖ فَعَلُوهُۚ لَبِئۡسَ مَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ ۝٧٩ تَرَىٰ كَثِيرٗا مِّنۡهُمۡ يَتَوَلَّوۡنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْۚ لَبِئۡسَ مَا قَدَّمَتۡ لَهُمۡ أَنفُسُهُمۡ أَن سَخِطَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ وَفِي ٱلۡعَذَابِ هُمۡ خَٰلِدُونَ ۝٨٠ وَلَوۡ كَانُواْ يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلنَّبِيِّ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مَا ٱتَّخَذُوهُمۡ أَوۡلِيَآءَ وَلَٰكِنَّ كَثِيرٗا مِّنۡهُمۡ فَٰسِقُونَ ۝٨١﴾[١].

ثم قال: كلا والله لتأمرن بالمعروف، ولتنهون عن المنكر، ولتأخذنّ على يدي الظالم ولتأطرنه على الحق اطراً، ولتقصرنه على الحق قصرا، أو ليضربن الله بقلوب بعضكم على بعض، ثم ليلعنكم كما لعنهم)).[٢]

---

١ المائدة (٧٨ـ٨١).

٢ رواه ابو داود والترمذي وقال حديث حسن وهذا اللفظ لأبي داود. لە كتێبی (رياض الصالحين) وەرم گرتوە، لاپەرە (٦٦)، ژمارە (٢٠١).

# چیرۆكی پێنجەم

## لە خوا بترسە

پاش ئەوەی (بەنی ئیسرائیل) لە میسردا دەسەڵاتێکیان گرتە دەستو بە بۆنەی یوسف پێغەمبەرەوە (سەلامی خوای لێ بێت) ژیانیان لەسەر خواپەرستیو خۆشگوزەرانیو دادپەروەریو چاکەخوازی بەسەر برد..

بەڵام وەك هەمو گەلێکی تر لەگەڵ زۆربونو گەورەبونی هۆزەکەیاندا وردە وردە خەڵکانی جۆراوجۆریان تێدا هەڵدەکەوتو لەگەڵ چاکەکارانیاندا کەسانی گوناهکەرو خوانەناسیان تێ دەکەوت..

ئەمەش شتێکی ئاساییەو ئاینو بیروباوەڕی پاكو دروست زیانی لێ ناکات چونکە وەك کورد دەڵێت: (چەم بێ چەقەڵ نابێت)و (مەدینەیش بێ دوڕو نابێت)..

بەڵام کارەکە بەوە تێك دەچێت کە کەسانی خوانەناسو چاکەکارو بانگخوازانی ناو ئەو گەلە گوێی پێ نەدەنو لەوە نەترسن خراپەکاران وردەوردە زۆر ببنو چاکەکاران بشارنەوەو دواتر کاروباری وڵات بکەوێتە دەستیانو پاشتر لەوانەیە ڕێگەش بگرن لە چاکەکارانو تەنگیان پێ هەڵچننو لە وڵاتیش دەریان بکەن یان توندی ناو بەندیخانەیان بکەن.

بۆ ئەوەی خراپەکاری تەشەنە نەسەنێ دەبێ فەرمان بە چاکەکردنو بەرگری کردن لە خراپە لە لایەن خواناسو ئیسلام پەروەرانەوە ئەنجام بدرێتو بوار نەدرێت خراپەکاران بێ شەرمانەو بە ئاشکرا لەناو کۆمەڵگەدا گوناه بکەنو ناشەرعیو نافەرمانی خوا لەبەر چاوی خەڵکی سوكو ئاسان بکەن.

بەڵام کێشەی چاکەکارانی بەنی ئیسرائیلیەکان لەوەدا بو کە بەردەوام نەبون لەسەر فەرمان بە چاکەو بەرگری لە خراپەو بەڵکو یەك دو جارێ ڕویان دەکردە خراپەکارەکەو پێیان دەوت:

تۆ فلان کەس لە خوا بترسەو ئەم کارە ڕەوا نیە بۆتو مەیکە.. بەڵام لە ڕۆژی ئایندەدا بە لایدا تێدەپەڕی دەبینێ لەسەر هەمان گوناهو خراپەکەی دوێنێی بەردەوامە..

بەڵام لە باتی ئەوەی ماندو نەبێتو بەردەوام نارەزایی دەبڕیایەو بەرگری لێ بکردایە بەڵکو بە دەم خۆیەوە دەیوت:

دوێنیێ پێم وت، چی لێ بکەم بە قسەم ناکات.. خۆ بە زۆر نابیێ! چاوی دەرهات.. خۆی حەز بە ئاگری دۆزەخ دەکات من چی لێ بکەم!!.

بەڵکو لە باتی ئەوەی هاورێیەتی کەم کاتەوەو لەگەڵیدا نەگەرێتو پێکەوە نان نەخۆنو پیاسە نەکەن.. تا بەڵکە بیربکاتەوەو پەشیمان ببێتەوەو دەست لەم کارەی هەڵبگرێتو دەست بداتە کاری جوانو چاکە..

ئەی چی ئەکرد؟

لە دوای ئەو یەکجار پیێ وتنە.. خۆی لێ کەڕ دەکرد.. ئامۆژگاری نەدەکردو بەڵکو بە پێچەوانەوە دەیوت بابە من پێم وتی گوناه مەکە کەچی هەر دەیکەی دەی هەر بیکە..

دوای ئەوە لەگەڵی دەیخواردو دەیخواردەوەو سەردانی دەکردو قسەو سوعبەتی لەگەڵ دەکردو پێکەوە لە چاخانەو پاركو سەیرانگاکاندا بە یەکەوە دادەنیشتنو چاوپۆشی لە گوناهەکانی دەکرد.

کاتێك ئەمەیان کرد خوای گەورەو پەروەردگار دڵەکانی لە یەك کردنو کینەو رقەبەرایەتی خستە نێوانیانو پاشان خوای گەورە نەفرەتی کرد لە بێباوەڕانی ناو هۆزی بەنی ئیسرائیل دەزانی لەبەر چی؟

لەبەر ئەوەی کە دەستی یەکتریان نەدەگرتو لە گوناه یەکتریان ئاگادار نەدەکردەوەو بەمەش خراپەو گوناهێکی گەورەیان ئەنجام دا کە ڕازی بونو بێدەنگ بوونە لە ئاستی گوناهکردن.

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ لُعِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ لِسَانِ دَاوُۥدَ وَعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ ۚ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا۟ وَّكَانُوا۟ يَعْتَدُونَ ﴿٧٨﴾ كَانُوا۟ لَا يَتَنَاهَوْنَ عَن مُّنكَرٍ فَعَلُوهُ ۚ لَبِئْسَ مَا كَانُوا۟ يَفْعَلُونَ ﴿٧٩﴾ تَرَىٰ كَثِيرًا

مِنْهُمْ يَتَوَلَّوْنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ لَبِئْسَ مَا قَدَّمَتْ لَهُمْ أَنفُسُهُمْ أَن سَخِطَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ وَفِى ٱلْعَذَابِ هُمْ خَٰلِدُونَ ﴿٨٠﴾ وَلَوْ كَانُوا۟ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلنَّبِىِّ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مَا ٱتَّخَذُوهُمْ أَوْلِيَآءَ وَلَٰكِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ ﴿٨١﴾﴾[١].

پاش گێڕانەوەی ئەم چیرۆکە لە لایەن پێغەمبەری خواوە (ﷺ) ئەوجا فەرموی: ((كلا والله لتأمرن بالمعروف، ولتنهون عن المنكر، ولتأخذنّ على يدي الظالم ولتأطرنه على الحق اطراً، ولتقصرنه على الحق قصرا، أو ليضربن الله بقلوب بعضكم على بعض، ثم ليلعنكم كما لعنهم)).

ڕوی کردە دانە دانەی ئوممەتەکەی پێی فەرمون: نەخێر، سوێند بە خوا فەرمان بە چاکە دەدەن‌و بەرگری لە خراپە دەکەن‌و دەستی ستەمکار دەگرن‌و ناهێڵن ستەم بکات‌و لەسەر هەق‌و دادپەروەری ڕای دەوەستێنن‌و ناهێڵن لەسەر هەق بە مو لابدات.

وەئەگەر نا خوای (عز وجل) دڵەکانتان دەکێشێت بە یەکداو ناکۆکیتان تێدا دروست دەکات‌و دواتریش نەفرەتی خۆیتان لێ دەکات وەك چۆن نەفرەتی لەوان کرد.

---

١ المائدة (٧٨ـ٨١).

# پەندو ئامۆژگاریەکانی ئەم چیرۆکە

١ـ دروستە باسکردنی کەسانو گەلانی ڕابردو، یادخستنەوەی هەڵە ناتەواویو هۆکاری لەناوچونیانو تورەبونو نەفرەتی خودا لێیانو ناچێتە خانەی غەیبەت کردنەوە، با ئیتر تا ئێستایش پاشماوەیان مابێتو پێیان ناخۆش بێت وەك نەوەکانی (بەنی ئیسرائیل)).

٢ـ لە فەرمودەکەدا پێغەمبەر (ﷺ) خاڵی سەرەتای لەناوچونو نوقسان بونو ڕوخانی وڵاتو گەلانی لەوەدا کۆکردۆتەوە کە دەستی یەکتری نەگرنو یەکتری لە خراپە دور نەخەنەوە.

ئەمڕۆ بە ناوی ئازادی بیروڕاوە یان ئازادی قەڵەمەوە خەڵکانێك هەن چی بێ بە دەمیاندا ئەیڵێنو چی بێ بە خەیاڵیاندا ئەینوسن! !

یان بە ناوی دێوەزمەی دیموکراتیەوە هەمو کەس ڕێگەپێدراوە کە هەستێت بە هەر تاوانو هەڵەو گوناهێكو نابێ کەس لێی تێك بداتو دەستگرو دەمگری نەبێت.. بەمەش ئەوروپا گۆڕی شارستانیەتی خۆی بە دەستی خۆی هەڵکەندوە.

٣ـ فەرمان بە چاکەو بەرگری لە خراپە بە یەك جار یان دو جار ناکرێتو بەڵکو دەبێ دەیان جار دوبارە بکرێتەوەو هەر جارەو بە شێوازێکی نوێ بە هاوڕێیەتی نەکردن، بە سەردانی نەکردن، بە هاورکاری لێ گرتنەوە، بە کەمکردنەوەی سەلام کردنو دەربڕینی بە ساردو سڕیو دەیان شتی تر تا بەڵکە بەو هۆیەوە ئەو کەسە لەو گوناهو تاوانە بگەڕێتەوە.

٤ـ دروستە سەلام کردنو قسە کردن لەگەڵ کەسانی لە خوا یاخیو گوناهکارو سەرپێچیکاران بەڵام نابێت قسەی خۆشوسوعبەتو سەیرانو صەفاو پێکەنینو نان خواردنو سەفەرەکردن پێکەوەی لەگەڵدا بکرێت بەڵکو لە کاتێکدا ئەمانە دروستن کە بە مەبەستی ڕێنمونی کردنو هیدایەتدانو ئامۆژگاری کردنی ئەنجام بدرێت.

٥ـ لەم چیرۆکەدا پێغەمبەر (ﷺ) سیفەتی موبالەغەی بەکارهێناوە کە وشەی (شریب)و (اکیل)و (قعید) کە مانای زۆر لەگەڵی مانەوەو زۆر پێکەوە گەڕانو نان خواردنو زۆر سەردانی کردنی گوناهەو دروست نیە.

٦ـ نابێت قبوڵی زوڵم بکرێت لە زاڵمو دەبێت دەستی بگیرێتو چونکە ئەوە خوارترین ئاستی بێ ڕەحمی مرۆڤە کە بە چاوی خۆی ستەم ببینێتو قبوڵی بکات..

٧ـ خوای گەورە وەسفی باوەڕداران بەوە دەکات کە فەرمان بە چاکە دەدەنو بەرگری لە خراپە دەکەنو گوێیش بەوە نادەن کە زەڕەیان تاڵ دەبێتو لەبەر چاوی خەڵکی دەکەونو دەکەونە لۆمەکردنیان گرنگ لە لایان وەك دەفەرموێت: ﴿ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۚ يَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ....... ﴾.

٨ـ ئەگەر خەڵکی واز لە یەکتر بێننو چاودێری هەڵسوکەوتو ڕەوشتی یەکتری نەکەنو هەڵەی یەکتر ڕاست نەکەنەوە بێگومان هەمو خەڵکی نوقمی ناو هەڵەو ناتەواویو ناشەرعی دەبن..

ئەو کاتە بێگومان هەڵەش لەگەڵ یەکتردا دەکەنو ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوەی دڵەکانیان لە یەکتر دەترازێنو ڕقو کینەو دوبەرەکی لە نێوانیاندا دروست دەبێت.

٩ـ ئەگەر فەرمان بە چاکەو بەرگریکردن لە خراپە لە نێوان خەڵکیدا نەماو کەس هەقی بە کەسەوە نەبو، ئەو کاتە چەکە گەورە کاریگەرەکەی بڕوادار ڕۆڵی نامێنێتو تەقەی پێ ناکرێت.

ئەو چەکەش دوعاکردنە کە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە ئەمر بە چاکەو بەرگری لە خراپە دەکەن باشە وەگەرنا زۆر نزیکە

سزایەکی گەورەتان بۆ دابەزێنێن‌و دوعاکانیشتان گیرا نەکات‌و دەفەرمووێت: ((والذي نفسي بيده لتأمرن بالمعروف ولتنهون عن المنكر، او ليوشكنّ الله ان يبعث عليكم عقاباً منه، ثم تدعونه فلا يستجاب لكم))[١].

١٠ـ دەبێت لەوە دڵنیا بین کە ئوممەتەکانی پێش ئیسلام چون بە کۆمەڵێ بۆچون‌و کاری هەڵەداو خۆیشیان بە هەڵە نەزانیوەو تەوبەیان لێ نەکردوەو خوایش بەر لەعنەتی خۆی خستون، ئێمەش هەر کاتێك بەو هەڵانەدا بڕۆینەوە هەمان سزامان بەسەردا دەدات.

١ رواه الترمذي وقال حديث حسن (٢١٦٩) رياض الصالحين: ژمارە (١٩٨)، لا (٦٦).

# القصة السادسة

## متصدّق بالليل

عن أبي هريرة (رضي الله عنه) أن رسول الله (ﷺ) قال:

((قال رجل: لأتصدقنّ بصدقة، فخرج بصدقته، فوضعها في يد سارق، فأصبحوا يتحدثون : تُصُدِّق على سارقٍ، فقال: اللهم لك الحمد لأتصدقنّ بصدقة، فخرج بصدقته فوضعها في يدي زانية، فأصبحوا يتحدثون: تُصُدِّق الليلة على زانية، فقال: اللهم لك الحمد على زانية!، لأتصدقنّ بصدقة، فخرج بصدقته فوضعها في يدي غني، فأصبحوا يتحدثون: تُصُدِّق على غنيٍّ، فقال : اللهم لك الحمد على سارق وعلى زانية وعلى غني!، فأُتي فقيل له: أما صدقتك على سارق، فلعله أن يستعف عن سرقته، وأما الزانية، فلعلها أن تستعف عن زناها، وأما الغني، فلعله يعتبر فينفق مما أعطاه الله)).[1]

واتە: پیاوێك وتی: ئەمشەو خێرێك دەكەم، شەو چوە دەرەوە بۆ خێركردنەكەی پیاوێكی (دزی) پێ گەیشتو پارەكەی كردە مشتی دزەكەوە، بەیانی خەڵكی دەیان وت: ئەمشەو خێر بە دزێك كراوە، پیاوەكەش وتی: خوایە سوپاس بۆ تۆ، ئەمشەو خێرێكی تر دەكەم، شەو داهاتو چوە دەرەوەو پارەكەی كردە مشتی ئافرەتێكی زیناكەر، لە بەیانیەكەیدا خەڵكی دەیوت: ئەمشەو خێرومەندێك خێری بە ئافرەتێكی زیناكەر كردوە! پیاوەكەش وتی: خوایە سوپاس بۆ تۆ لەسەر خێركردنم بە زیناكەرێك، بڕیاری دا شەوی داهاتوش خێرێكی نوێ بكاتو كاتێك دەرچو، پارەكەی كردە مشتی دەوڵەمەندێك، لە بەیانی ڕۆژی داهاتوشدا خەڵكی دەیوت: ئەم شەو خێر بە دەوڵەمەندێك كراوە، پیاوەكەش وتی: سوپاس بۆ خوا لەسەر خێركردنم بە دزو داوێن پیسو دەوڵەمەندێك.

پاشان (لە خەودا) پێیان وت: زۆر باشت كردوەو لەوانەیە بەو خێركردنەی تۆ دزەكە دەستی لە دزی هەڵگرتبێتو زیناكەرەكەش وازی لە زینا هێنابێتو دەوڵەمەندەكەش بیر بكاتەوە پارەكانی بكات بە خێر.

---

١ رواه البخاري بلفظه ومسلم بمعناه (البخاري: ١٤٢١) ومسلم (١٠٢٢)، لە كتێبی (ریاض الصالحین) لا (٤٠٩)، ژمارە (١٨٧٤).

# چیرۆکی شەشەم

# خێرومەندێك لە شەودا

پیاوێکی خواناس بڕیاری دا کە لە تاریکایی شەودا نەبێت خێر نەکات بۆ ئەوەی بە تەواوی لە ریاو رووپامایی بە دور بێتو تەنانەت خێر وەرگرەکەش نەزانێت کێیە ئەو کەسەی خێرەکەی پێ کردوە..

شەوی یەکەم کیسەیەك پارەی هەڵگرتو لە ماڵ دەرچو بە ئەسپایی بۆ ئەملاو ئەولای شەقامەکەی دەڕوانی..

تا بەڵکو داماوێ.. هەژارێ.. دەست کورتێکی بکەوێتە بەر چاو کیسە پارەکەی پێ بدات..

وا لە دورەوە پیاوێك هات بەڵام وا دیارە زۆر بە نهێنی دەڕوات بە ڕێوەو ئەمیش لە دڵی خۆیدا وتی: سەیرکە چەند شەرمنە.. چۆن بە ئەسپایی ڕێگە دەبڕێت؟!

وا دیارە هەژاری خۆمم دۆزیەوە، با پارەکەی بۆ بەرم.. کابرای بانگ کردو لە دواوە پێی وت: برای بەڕێزم من خێرێکم کردوەو پێم خۆشە بیدەم بە تۆ.. کیسەکەی لێ ڕادا..

کابراش زۆر سەری سوڕما لە دڵی خۆیدا وتی: تۆ بڵێی بە ڕاستی بێ دەترسم بمخەڵەتێنێتو کە نزیك بومەوە بمگرێتو تەسلیمی پۆلیسم بکات...

بەڵام کاتێك گوێی لە زرەی درهەمەکان بو.. تەماح گرتیو چوە پێشەوەو کیسەکەی لە دەست گرتو سوپاسی کردو بە خێرایی نایە گیرفانیەوەو بەرەو ماڵ گەڕایەوە.

لە بەیانی ئەو ڕۆژەدا دەنگو باس وا بڵاوبویەوە کە ئەم شەو کابرایەك چوە خێری بە دزێك کردوە!..

پیاوە خواناسەکە پەشیمان نەبویەوە بەڵکو دەستی بەرزکردەوە بۆ لای خواو وتی: سوپاس بۆ خوا کە خێرم بە دزێك کرد ئەمشەو!. بەڵام قەیناکا ئەمشەو خێرێکی تر دەکەم..

لە شەوی داهاتودا بە هەمان شێوە گەڕا دەبینێت ئافرەتێك بەو شەوە تاریکە لە کۆڵانەو ئەمیش نەیدەزانی کێیە، ڕوی تێکرد وتی: من بڕیاری خێرکردنم داوەو حەز دەکەم بۆ تۆ بێت.. فەرمو ئەم کیسە پارە زۆرە بگرە !..

ئافرەتەکە زۆر سەرسام بو بەڵام پێی وت لە بەرامبەری چیدا ئەم پارەیەم پێ دەدەیتو چیت لێم دەوێت؟

پیاوەکە وتی: لەبەر ڕەزامەندی خوا دەتدەمێو هیچ نیازێکم پێت نیە..

ئەویش پارەکەی وەرگرتو زۆر سوپاسی کردو بەرەو ماڵ گەڕایەوەو سوپاسی خوای دەکرد..

لە بەیانی ئەو ڕۆژەشدا پیاوەکە گوێی لێ بو خەڵکی دەیانوت: ئەمشەو کابرایەك خێری بە ئافرەتێکی داوێن پیس کردوە !..

ئەویش هیچ پەشیمان نەبو بەڵکو بە دڵێکی خۆشەوە وتی: سوپاسو ستایش بۆ ئەو خوایەی کە یارمەتی دام دەستگرۆیی زیناکەرێك بکەمو مەرج بێت ئەمشەویش بڕۆمەوەو خێرێکی تر بکەم..

لە شەوی سێیەمدا سێ بارە بە کیسێك پارەی زۆرەوە چوە دەرەوەو لەناو تاریکایی شەوەکەدا پیاوێکی (بە شانو شەوکەت) کەوتە بەر چاویو لە دڵی خۆیدا وتی: لەوانەیە ئەمە زۆر دەست کورت بێتو خێری پێ بشێت..

بۆیە بانگی کرد: ها کابرا.. سڵاو.. ئەمە بەم شەوە تاریکە خێرە لە دەرەوەی.. هیچ مەڵێ ئەزانم چی هێناویتیە دەرەوە.. ها بگرە برای بەڕێزم ئەم کیسە پارەیەم کردوە بە خێرو حەز دەکەم بیدەم بە تۆ..

کابرا وەك لە بان بەری بدەنەوە هاواری کرد: چی.. پارە.. بۆ من؟ بۆ تۆ من بە کێ تێ ئەگەی؟ کاکە من وەزعم باشە.. بیدە بە یەکێکی تر..

پیاوە خواناسەکە وای زانی لە شەرماندا وا دەڵێ یان کەسێکی عەفیفە، بۆیە بە زۆر لێی ڕاداو دایە دەستیو ئەویش بە سەرسوڕمانەوە لێی وەرگرتو سوپاسی کردو ڕۆشتەوە بۆ ماڵ..

لە بەرەبەیانی ئەو ڕۆژەدا بەرەو بازاڕ کەوتەڕێو لەوێ گوێی لێ بو خەڵکەکە لەناو خۆیاندا ئەیان وت: دە وەرە مەتەقە لە داخا، ئەم شەو کەسێك خێری کردوە، چوە پارەیەکی زۆری کردوەتە گیرفانی دەوڵەمەندێکەوە!..

کابرا وتی: منیش تێگەیشتم بۆیە وتم خوایە من نەمزانی دەوڵەمەندە لێم ببورە بەڵام هەرچۆنێ بێت سوپاسگوزارتم کە توانیم خێر بە دزو زیناکەرو دەوڵەمەندێك بکەم.

پیاوەکە بە خەفەتێکەوە چوەوە بۆماڵەوە (ئەشترسا) خوای گەورە خێرەکەی لێ وەرنەگرتبێتو بگرە توشی گوناهیش بوبێت بۆیە شەو بە دەم ((لا حول ولا قوة الاّ بالله العلي العظيم))ەوە خەوی لێ کەوت.

لە خەودا مژدەیان پێدا کە خێرەکەت لێ وەرگیراوەو بە بۆنەی ئەم خێرکردنەی تۆوە.. دزەکە ئیتر پێویستی بە پارە نەماو دەستی لە دزی هەڵگرتوەو تەوبەیەکی خاوێنی کردوە..

هەروەها ئافرەتە بەدڕەوشتەکەش.. خاوەنی هەندێ هەتیو بو لەبەر ئەوەی منداڵەکانی لە برساندا نەمرن.. ناچار ڕێگای زینای گرتبوە بەرو کە تۆ ئەو پارەیەت پێدا خستیە سەر چاویو بڕیاری دا ئیتر کاری زشتو ناشیرینی وا نەکاتو ڕێگای داوێن پاکی بگرێت.

هەروەها ئەو دەوڵەمەندەی تۆ خێرەکەت کردە مشتیەوە پیاوێکی زۆر دەوڵەمەند بو بەڵام تا بڵێی چروكو ڕەزیلو دەست قوچاو بو بۆیە کە تۆ خێرت پێ کرد زۆر دڵخۆش بو لە دڵی خۆیدا وتی: خوایە مەرج بێ منیش لە سامانەکەم خێر بکەمو دڵی هەژاران خۆش بکەمو چیتر هەر نەیشارمەوەو کۆی نەمەکەوە..

پیاوەکە هەستایە سەرپێو بە دڵێکی زۆر خۆشەوە دەستی بەرزکردەوە بۆ لای خوای پەروەردگارو لە کانگای دڵیەوە سوپاسێکی بێ پایانی کرد..

# القصة السابعة
# زيارة الأصدقاء

عن أبي هريرة (رضي الله عنه) عن النبي (ﷺ) أن رجلا زار أخا له في قرية أخرى، فأرصد الله له على مدرجته ملكاً، فلما أتى عليه قال: أين تريد؟

قال أريد أخا لي في هذه القرية، قال: هل لك عليه من نعمةٍ تَرُبُّها عليه؟ قال: لا، غير أني أحببته في الله تعالى..

قال: فإني رسول الله إليك بأن الله قد أحبك كما أحببته فيه.[١]

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێت) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوەو دەفەرمووێت:

((جارێك پیاوێك چو بۆ سەردانی برایەكی خواناسی خۆی لە دێیەكی دیكە، خوای پەروەردگاریش فریشتەیەك دەنێرێتە ڕێگای‌و كاتێ دەگات پێی لێی دەپرسێت: بۆ كوێ بە نیازیت بڕۆیت؟

پیاوەكەش وتی: بە نیازم سەردانی برایەكم بكەم لە ئەم دێیە؟ ئەویش لێی پرسی ئایا چاكەو پیاوەتی بەسەر تۆوە هەیەو دەتەوێ پاداشتی بۆ بكەیتەوە؟

پیاوەكە وتی: نەخێر، تەنها لەبەر ئەوەیە كە لەبەر خاتری خوا خۆشم دەوێت.

ئەویش وتی: دەی من فریشتەی پەروەردگارم هاتوم بۆ لات تا پێت ڕابگەیەنم كە وەك چۆن تۆ لەبەر خاتری خوا ئەو برایەتت خۆش دەوێت ئاوا خوایش تۆی خۆش دەوێت.

---

١ رواه مسلم (٢٥٦٧) لە كتێبی (رياض الصالحين) لاپەڕە (١٠٧) ژمارە (٣٦٥).

# چیرۆکی حەوتەم
## سەردانی هاوڕێیان

یەکێك لە پیاوچاکان دانیشتبو، خەیاڵی هاوڕێکانی هات بە مێشکیداو لەناویاندا یەکێکیانی زۆر خۆش دەویستو حەزی بە بینینی دەکرد چونکە خوای گەورەی لە لا خۆشەویست دەکردو ڕۆژی سەختی قیامەتی دەخستەوە بیری‌و قسەی چاكو بەسودیان دەکرد پێکەوە..

بۆیە لە خۆی پرسی ئاخۆ دەبێ بۆچی سەردانێکی نەکەم؟ بێگومان زۆر شادمان‌و دڵخۆش دەبێت‌و خوا شاهیدە لەبەر هیچ مەرامێکی دنیایی خۆشم ناوێ‌و تەنها لەبەر خاتری خوایەو بەس..

ئەوە بو خواحافیزی لە ماڵ‌و منداڵەکەی کردو سواری وڵاخەکەی بو بەرەو دێی (شادیان) کەوتەڕێ کە نزیکەی دو سەعات لە دێکەی ئەمانەوە دور بو..

لە ڕێگا لە لای کانیاوێکی سەوزو دڵڕەفێندا لایدا کە خوڕەی ئاوو ئاوازی باڵندەکان دڵی هەزارانیان بۆ خۆیان کەمەندکێش دەکرد.. دەستنوێژێکی گرت‌و دو ڕکات نوێژی چێشتەنگای کردو پاشان دەستی بەرز کردەوە بۆ لای پەروەردگاری خۆشەویستی‌و وتی:

ئەی خوایە گیان.. من هێشتا نەمدیویت ئەوەندەی هەمو دنیا خۆشم دەوێی لەسەر نیعمەتی باوەڕو لەشی ساغ‌و عەقڵی دروست.. خوایە لەم هاوڕێیەم خۆشبەو یارمەتیم بدە بچم بۆ سەردانی‌و پێکەوە قسەی خۆش‌و پێکەنین لەگەڵ یادی پڕ شکۆی تۆدا تێکەڵ بکەین.. آمین..

لەوەدا بو سواری وڵاخەکەی بێت‌و بە ناوی خواوە بکەوێتە ڕێ، لە ناکاو پیاوێکی جوانی سورو سپی‌و ڕیش سپی.. نور لەناو چاوی ئەباری.. لەناو باخەکەی خوار کانیاوەکەوە بە ئەسپایی هاتە دەرەوەو بە سڵاوی خوا سڵاوێکی گەرمی لێ کرد..

پیاوەکەش زۆر شادمان بو بە بینینیو سڵاوی بە جوانترین شێوە لیٚ کردەوەو فەرمویٚ لیٚ کرد تا دانیشن پێکەوەو خواردنێکی سوکەی لەناو تێشتەبەرەکەدا بو.. دەرهێناو فەرموی لیٚ کرد تا پێکەوە پارویەکی لەگەڵدا بخوات..

ئەویش لەگەڵی دانیشتو بە یەکەوە دەستیان کرد بە قسەی خۆشو مەسەلەکانیان پێکەوە تاوتویٚ کرد..

پاشان بە ڕویەکی خۆشەوە لێی پرسی: ئەی برای بڕوادارم، خێرە وا کەوتویتەڕیٚ؟ بە نیازی بۆ کویٚ بچی -إنشاء الله-؟

پیاوە خواناسەکە وتی: دەمەویٚ تا دێی شادیان بڕۆم؟ پیاوە ڕیش سپیەکە بە ئەدەبێکەوە وتی: ئەتوانم پرسیارێکت لیٚ بکەم کە ئاخێرە؟ بۆچی بۆ ئەو دێیە ئەڕۆیت؟ ئیشت لەویٚ هەیە؟

پیاوە خواناسەکە پیکەنی وتی: خاڵۆ گیان.. باوەڕ بکە هیچ ئیشێکم لە دێی شادیان نیەو نە کشتوکاڵو نە هیچ پڕۆژەیەکم لەویٚ نیە..

+ ئەی خزمو کەست لەوێیە؟ سەردانیان دەکەیت؟

- وتی: خزمیشمی لیٚ نیە، بەڵکو هاوڕێیەکی خۆشەویستمی لێیە کە برایەکی هاوئاوینو بیروبڕوامە.. ئەم شەو بیرم کردەوەو بڕیارم دا سەردانێکی بکەمو بەسەری بکەمەوە.

پیاوە ڕیش سپیەکە بە ڕویەکی گەشەوە پێی وت: هیچ پەیوەندیەکی بازرگانی لە نێوانتاندا نیە؟

پیاو چاکەکە بە پێکەنینەوە وتی: با گەورەترین بازرگانی!

پیاوەکە زۆر سەری سوڕماو وتی چ بازرگانیەك؟

+ بازرگانی مەزن! بازرگانی دەستکەوتنی تاجی ڕەزامەندی خواو بەهەشتە جوانو بەرینەکەی..

پیاوە ڕیش سپیەکە ڕوی وەك گوڵ گەش بویەوەو پێی وت: ئەزانی من کێم؟

وتی: من نازانم تۆ کێی بەڵام لە پیاوێکی ڕاستگۆو خواناس دەچیتو نهێنیەك لەوەدا هەیە کە نازانم بۆچی خۆشم ئەوێیت.

پیاوە ڕیش سپیەکە وتی: من فریشتەی پەروەردگارمو ئەو ناردومی بۆ لات تا بێمە ڕێتو ئەم پرسیارانەت لێ بکەم.. و دڵنیاشت دەکەم کە پێم سپێردراوە مژدەت بدەمێ کە ئەو خوایە خۆشی دەوێت کە لەبەر خاتری ئەو ئەو برایەتت[1] خۆش دەوێتو لەبەر خاتری ئەو سەردانی دەکەیت..

پیاوەکە لە خۆشیاندا هەر لەوێدا سوژدەیەکی شوکری بردو کاتێ سەری هەڵبڕی فریشتەکە دیار نەبو.. ئەمیش حەبەسابو هەر سەیری ئەملاو ئەولای دەکرد..

١ برا –وشەیەکە لە فەرهەنگی ئیسلامدا– سەمفۆنیایەکی خۆشی هەیەو لە وشەی برادەر، هاوڕێ، هەڤاڵو هتد خۆشترەو مەبەستیش لێی برایەتی ئاینیە، ((إنَّما المؤمنون إخوة)).

## پەندو ئامۆژگاریەکانی ئەم چیرۆکە

١- پێغەمبەر (ﷺ) لە ڕێگەی گێڕانەوەی ئەم چیرۆکەوە سەردانی کردنی یەکتری بەرز نرخاندوەو کردویەتی بە هۆکاری بەدەستهێنانی خۆشەویستی خودا بۆ ئەو بەندانەی لەبەر خاتری ئەو سەردانی براکانیان دەکەن.

٢- بەم فەرمودەیەدا وا دیارە دروستە مرۆڤ بۆ تاقیکردنەوەی کەسانی تر، کەسێك بنێرێت بۆ لای بە دزیەوەو لە نیازو نیەتی تێ بگات، بە مەرجێك خوای گەورە خۆیشی ئەیزانی بۆ کوێ دەچێتو بۆ لای کێ دەچێت.

٣- دروستە مرۆڤ ئەگەر ویستی کارێکی خێر بکات، خەڵکی پێی بزانن بەلام خۆی باسی نەکات بەڵکو کاتێ پرسیاری لێ کرا ڕاستو دروست بڵێ بە نیازی فلان کاری خێرمو نابێ بیشارێتەوەو بڵێ نەوەك توشی ڕیا ببم!

٤- پێویستە مرۆڤ هەر کارێکی خێرو چاکە دەکات تەنها مەبەستی ڕەزامەندی خوا بێتو خوا کاری نیواو نیوی ناوێ کە لەبەر خاتری ئەو کارێ بکات بەلام حەزیش بکات خەڵکی دەستخۆشی لێ بکەنو ناوی بەرن بە چاکە..

٥- ئەگەر کەسێك لە تاقیکردنەوەکەت دەرچو، بەو شێوەیە دەرچو کە تۆ پێت خۆش بو.. مژدەی دەرچونی پێ بدەو دڵی خۆش بکە وەك چۆن فریشتەکە بە پیاوچاکەکەی وت: مژدەت لێ بێ ئەو خوایە خۆشی دەوێیت کە لەبەر ئەو سەردانی ئەو برایەت دەکەیت.

٦- کار بە نهێنی بکەو مەیەڵە بە نهێنیەکانت بزانن‌و نەخشەکانت لێ تێك بدەن بەلام دوای ئەوەی مەبەستەکەت هاتەدی ئیتر گوێ مەدەرێ ئاشکرا بێت یا نا، بەڵکو ئەشتوانیت خۆت ئاشکرای بکەیت وەك چۆن پیاوەکە وتی دەی من فریشتەی پەروەردگارمو بۆ لای تۆ نێردراوم..

# القصة الثامنة

# لا تنتحر

عن جندب البجلي (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ):

((كان فيمن كان قبلكم رجل به جرح، فجزعَ ، فأخذ سكيناً فجز بها يده ، فما رقأ الدم حتى مات . قال الله تعالى: بادرني عبدي بنفسه، حرمت عليه الجنة)).[1]

واتە: جوندوب البجلی (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی:

لەناو گەلانی پێش ئێوەدا پیاوێك هەبو.. ئەم پیاوە بە هەر هۆیەك بو برینـدار بـو.. زۆر هاواری دەکرد لەتاو ئێش و ئازار.. تا کار گەیشتە ئـەوەی.. چـەقۆیەکی هێنـاو برینەکـەی پێ کولاندەوەو گەورەی کردو خوێنی بەربو هەر نەدەوەستایەوە تا گیانی دەرچو..

خوای گـەورەیش فـەرموی بەندەکـەم زۆر پەلـەی کـرد لـە گەڕانـەوەی بـۆ لام و (خـۆی کوشت) دەی ئەوا منیش بەهەشتی لێ قەدەغەو حەرام دەکەم.

---

1 رواه البخاري (٣٤٦٣)، لـە کتێبـی (صـحیح قـصص القـرآن) بەشـی دو لا (٥٢) وەرمگرتـوە لـە نوسینی سعد یوسف أبو عزیز.

# چیرۆکی هەشتەم

## خۆت نەکوژیت

پیاوێك لە سەردەمانی ئوممەتەکانی پێش ئیسلامدا.. دەچێت بۆ ڕاوشکارو لەوێ درندەیەك پەلاماری دەداتو دەیەوێت بیخوات بەڵام ئەم پیاوە خاوەنی جەستەیەکی گەورەو تۆکمە بو..

درندەکە بە ئاسانی چاری نەکرد بەڵام تا توانی کەڵپەی گیرکرد لە باڵیو بە خەستی پیاوەکەی بریندار کردو ئەویش لێی هاتە دەستو بە خەنجەر ئەنجر ئەنجری کردو کوشتی..

بە دەم ئێشو ئازارەوەو بە دەم خوێن لێ ڕۆیشتنەوە هاواری ئەکردو ئەی قیراند: ئای باڵم.. ئای مردم.. خوایە ئازار شێتی کردم! تا گەیشتە قەراغ کانیاوێكو لەوێ تێر ئاوی خواردەوە بەڵام برینەکەی زۆر ئازاری دەداو بە دەم ئێشەوە ئەتلایەوە..

کە ئازار زۆری بۆ هێنا خۆی پێ نەگیراو خەنجەرەکەی دەرهێناو برینەکەی پێ تلیشاندو خوێن وەك بەلوعە فیچقەی دەکردو بە هیچ جۆرێك خوێنەکەی نەوەستایەوە تا گیانی دەرچو مرد..

خوای گەورەو پەروەردگاریش زۆر پێی ناخۆش بو.. ئەم کارەی بەندەکەی بە دڵ نەبو.. کە دەبوایە زامەکەی ببەستایەو تیماری بکردایە تا وردە وردە خۆش دەبویەوە..

بۆیە ڕوی کردە فریشتەکانیو پێی فەرمون: ئاگاتان لێیە بەندەکەم چۆن پەلەی کرد لە گەڕانەوە بۆ لام؟!

دەی ئێوە بە شایەت بن من بەهەشتی لێ حەرام دەکەمو نایەڵم بچێتە ناویەوە..

## پەندو ئامۆژگاریەکانی ئەم چیرۆکە

١ـ مرۆڤ کە لە ژیاندایە، دەبێت چاوەڕوانی ئەوە بکات کە لە هەمو ساتێکدا ئەگەری ئەوە هەیە توشی کارەسات ببێتو تیایدا دەستو قاچی لە دەست بداتو یان برینداریکی سەخت ببێت.

بۆیە دەبێ بە سەبرو ئارام بێت لە کاتی ئەو ڕوداوانەداو ناشکوری نەکاتو سکاڵای خۆی لە لای هەمو کەس نەکات، بەڵکو بەردەوام سوپاسگوزاری خوا بێتو بەو بەشەی ڕازی بێت تا لە پاداشتی سوپاسگوزاران بێ بەش نەبێتو پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) مژدەی داوە بە کۆشکێك لە بەهەشتدا (بۆ ئەو کەسانەی لەسەر ناڕەحەتیو نەهامەتی بە ئارام دەبن) بە ناوی کۆشکی (سوپاس).

٢ـ نابێت نائومێدیو بێ هیواییو دەست لە دنیا شتن ڕو بکاتە مرۆڤی موسڵمانی نەهامەت (مصیبە)دار، بەڵکو دڵی زۆر بە خوای خۆی خۆش بێتو داوای شیفاو دەروی خێری لێ بکاتو کارێك نەکات خوای گەورە لە خۆی بڕەنجێنێت. وەك ئەو پیاوەی کە لەسەر برینەکەی باڵی سەبری نەگرتو بە خەنجەر خۆی کوشت..

٣ـ خۆکوشتن لە ئیسلامدا کارێکی زۆر ترسناکەو گوناهێکی زەبەلاحو کەبیرەیەو خوای گەورە زۆر ڕقی لەو کەسانەیە کە هەڵدەسن بەو کارە ناشیرینەو هەڕەشەی حەرام کردنی بەهەشتیان لێ دەکات.

٤ـ بە درێژایی مێژوی ئیسلام ڕێژەی خۆکوژی لە ناو موسڵماناندا زۆر کەم بوە یان هەر نەبوەو بە پێچەوانەی وڵاتانی ڕۆژئاوا کە بە بچوکترین گیروگرفتو نەهامەتی خۆیان دەکوژن چونکە پەروەردگارێکی گەورەو بەبەزەیی وەك (الله) شك نابەن تا لەبەر ئەو خۆیان بگرنو بە ئارام بن.

٥ـ لە ئیسلامدا ئەو کەسەی خۆی ئەکوژێتو پێشتر موسڵمان بوە ئەوە هەر بە موسڵمانەتی دەمرێتو پێشەوا نەوەوی ئەفەرموێت: مانای فەرمودەکە ئەوە ناگەیەنێت

کە وەك کافرو دوڕووەکان بە هەمیشەیی لەناو ئاگردا بمێنێتەوە بەڵکو خوا ماوەیەکی زۆر لە بەهەشتو خۆشیەکانی بێ بەشی دەکات بەڵام لە ئاکامدا لەبەر باوەڕەکەیو یەکتاپەرستیەکەی لە دۆزەخدا نایهێڵێتەوەو دەچێتەوە بەهەشت (ان شاء الله تعالى).

# القصة التاسعة
## شوك الطريق

عن ابي هريرة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ): ((بينما رجل يمشي بطريق، وجد غصن شوك على الطريق، فأخره، فشكر الله له فغفر له)).[١]

وفي رواية مسلم: ((لقد رأيت رجلا يتقلبُ في الجنة في الشجرة قطعها في ظهر الطريق كانت تؤذي المسلمين)).[٢]

وفي رواية: ((نَزَعَ رَجُلٌ لم يعمل خيرا قطّ غصن شوك عن الطريق، إما قال: كان في شجرة قطعه، وإما كان موضوعاً فأماطه عن طريق فشكر الله ذلك له، فأدخله الجنة)).[٣]

واتە: ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێت) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی:

جارێك پیاوێك بەسەر جادەیەکدا دەڕۆیشت، لە ڕێگا چاوی بە لقە دارێکی چڵ چڵێن – دڕکاوی– کەوت، بەخێرایی ڕۆیشتو هەڵی گرتو لەسەر جادەکە دوری خستەوە، خوای گەورەیش لەسەر ئەو کارەی سوپاسی کردو لە گوناهەکانی خۆش بو.

لە ڕیوایەتی پێشەوا (مسلم)دا هاتوە: کە فەرمویەتی: لە بەهەشتدا چاوم کەوت بە پیاوێك پیاسەی دەکرد، کە لە دنیادا یەك کاری چاکەی نەبو، بەلام چوبوە بەهەشتەوە تەنها لەبەر ئەوەی کە لقەدارێکی دڕکاوی لەسەر ڕێگەی باوەڕداران دورخستەوە یان لەبەر ئەوەی کە درەختێك سەر جادەکەی گرتبو بڕیەوە یان کەوتبوە سەر جادەکەو ئەویش دوری خستەوە لە ڕێگەکە، خوایش لەسەر ئەو کارەی سوپاسی کردو لێی خۆش بو.

---

١ رواه البخاري (٦٥٢) ومسلم (١٤١٩).

٢ رواه مسلم.

٣ رواه ابو داود، حديث حسن، الجامع الصحيح (٦٧٥٥).

# چیرۆکی نۆیەم

## دڕکی ڕێگا

جارێك پیاوێك بە ڕێگەیەکدا دەڕۆیشت لە ڕێگا ئاگای لە خۆی نەبو.. پێی هەڵکەوت لە لقەدارێکی دڕکاوی گەورەو کەوتە سەر زەویەکەوو ئەژنۆکانی ئازاریان پێ گەیشت‌و برینداربو..

کاتێك هەستایەوە سەیرێکی ئەم لاولای خۆی کرد.. دڵی خۆش بو کە کەس چاوی پێی نەکەوتبو، بۆیە بە دەم خۆیەوە قسەی دەکردو دەیوت:

زۆر سەیرە ئەم خەڵکە!.. ئاخر تۆ دارەکە ئەبڕی بۆچی لەسەر جادەی باوەڕداران فڕێی ئەدەی یان بەجێی دێڵی؟..

لای کردەوە بۆ دواوە.. بینی وا پیاوێکی نابینا بەرەو ئەو ڕاڕەوە دێت کە لقە دارە گەورەکەی تێدا کەوتوە..

خێرا هەستایە سەرپێ‌و ئێشەکەی لەبیر چویەوەو بە شەلەشەل خۆی گەیاندە لقە دارەکەو هەڵی گرت‌و بردی لە دوری ڕێگاکەوە دایناو جادەکەی لێ پاك کردەوە..

ئەوجا پیاوە نابیناکە بە ئاسایی بە ڕێگاکەدا ڕۆیشت‌و تێپەڕی، پیاوەکەش کە پێشتر کاری چاکەی نەکردبو.. زۆر دڵخۆش بو بەو کارە چاکەی کە کردی چونکە ڕێگای بۆ بڕواداران بە تایبەت ئەو پیاوە نابینایە پاك کردەوە.

هەناسەیەکی خۆشی هەڵمژی‌و پەیمانی بە پەروەردگاری خۆی دا کە هەمیشە ڕێگای بڕواداران پاك بکاتەوە لە تەلەزمە بەردو تاسەو دڕك‌و داڵ‌و پیسایی بە دەم خۆیەوە دەیوت:

من خۆم گوێم لە مامۆستاکە بو لە تەلەفزیۆنەکەدا وتاری دەداو دەیوت: خوای گەورە لە کەسێك خۆش بو لەسەر ئەوەی دڕك‌و داڵی لەسەر ڕێگەی موسڵمانان دورخستەوەو بە مەرجێك یەك چاکەی نەکردبو لە ژیانیدا..

دەی بە خوا ئەوە منم کە لە ژیانمدا کاری چاکەم نەکردوە، دەی توخـوا شـورەیی نیـە بۆ من لەسەر لابردنی لقێك دار لەسەر جادەکەی خوا لە من خۆش ببێت! ؟ ئەی سا بۆچـی لەمەولا چاکەکاریش نەکەمو لەگەڵ خوای خۆمدا لاپەڕەیەکی نوێ هەڵنەدەمەوە؟. و دواتر دەستی کرد بە کردەوەی چاکەکردن.

## پەندو ئامۆژگاری لەم فەرمودەیە

١ـ خوای گەورە ڕەقیبو چاودێرە بەسەر تاکەتاکەی مرۆڤەکانەوەو بە تاسەوە چاوەڕوان دەکات کەی کارێکی چاکەو خزمەتگوزاری ئەنجام بدەیتو ئەو لە کەمیندایە بۆ لێخۆشبونمان.. ئای کە خوایەکی بە ڕەحمو بە بەزەییە..

٢ـ لابردنی شتێك لەسەر ڕێگا ئەوپەڕی خۆشەویستی موسڵمانانەو نواندنی تەوازوعو بێ فیزیە.

٣ـ هەتا مرۆڤ خزمەت بە خەڵکی بکاتو نەهامەتیەکانیان لەسەر سوك بکاتو جادەکانیان بۆ پاك بکاتەوە.. خوای گەورە خۆشحاڵ دەبێت، بە مەرجێك هیچ سودێکیشی بۆ ئەو نیە. کەچی ئەو سوپاسی دەکاتو لە پاداشتیدا لێی خۆش دەبێت..

٤ـ لە گەورەیی پاداشتی لابردنی شتێك لەسەر جادە ئەوەندە مەزنو پڕ بایەخ بێت کە خوا لە خاوەنەکەی خۆش ببێت لەسەری..

ئەی دەبێ بە پێچەوانەوە گوناهی ئەو کەسە چەند گەورە بێت کە دڕكو داڵ دەخاتە سەر جادەی موسڵمانانو خۆڵو خاشاكو زبڵ دەکاتە سەر جادەکە..

٥ـ ئەی دەبێ گوناهی ئەو کەسانە چەند بێت کە ئۆتۆمبێلٚ یان ماتۆڕ بە شێوەیەکی خێراو ترسناك لێ دەخوڕنو منداڵی موسڵمانان دەکەن بە ژێرەوەو جەرگی دایكو باوکیان دەبڕنو غەمباریان دەکەنو بە غەمەوە دەیانکوژن؟.

٦ـ ئەی لە بەرامبەردا دەبێ دانانی لقێك دار بخرێتە سەر جادە ئەوەندە گەورە بێت ئەی تاوانی ئەو کەسانەی کە تاسەی بەرز یان چاڵی گەورە دەکەنە سەر جادە قیرەکان چەند گەورە بێت پەنا بە خوا..

٧ـ دروستکردنی تاسە لەسەر جادەکان لە لایەن ماڵەکانەوە ڕەمزی تێنەگەیشتنە لە ئیسلام لە لایەكو لە لایەکی تریشەوە ڕەمزی هەمەجیەتو تێنەگەیشتنە چونکە لە وڵاتە پێشکەوتوەکاندا ئەم فەرمودەشیان نەبیستوە سیمای جادەکان ناشێوێنن.. لەبەر تەپو تۆزی ئۆتۆمبێلی خێرا یان نەوەك منداڵێکیان بکات بە ژێرەوەو بکوژێ! کەوەك خۆمان ناشزانن ئەجەل دیاری کراوە.

# القصة العاشرة
# الشرط العظيم

عن أبي موسى الأشعري (رضي الله عنه) قال: أتى النبي (ﷺ) اعرابياً فاكرمه، فقال له إئتنا، فأتاه، فقال رسول الله (ﷺ): ((سل حاجتك ؟ فقال: ناقة برحلها وأعنز يحلبها أهلي، فقال رسول الله (ﷺ): أعجزتم أن تكونوا مثل عجوز بني إسرائيل؟)).

فقال أصحابه: يا رسول الله! وما عجوز بني إسرائيل؟ قال: إن موسى لمّا سار ببني إسرائيل في مصر، ضلوا الطريق فقال: ما هذا؟

فقال: علماؤهم: نحن نحدثك أن يوسف لما حضره الموت أخذ علينا موثقا من الله، أن لا نخرج من مصر حتى ننقل عظامه، معنا، قال: فمن يعلم موضع قبره ؟

قالوا: ما ندري اين قبر يوسف، إلا عجوز من بني إسرائيل.

فبعث إليها فاتته، فقال: دولينا على قبر يوسف.

فقالت: لا والله، لا أفعل حتى تعطيني حكمي.

قال: وما حكمك؟

قالت: أكون معك في الجنة!

فكره ان يعطيها ذلك، فأوحى الله اليه ان أعطها حكمها، فانطلقت بهنَّ إلى بحيرة مستنقع ماء، فقالت: أنضبوا هذا الماء، فأنضبوا، قال: احتفروا واستخرجوا عظام يوسف.

فلما اقلّوها إلى الارض، اذا الطريق مثل ضوء النهار)).[1]

واتە: ئەبو موسای ئەشعەری (خوا لێی ڕازی بێت) ئەگێڕێتەوە کە پیاوێکی دەشتەکی هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) ئەویش ڕێزی تەواوی لێ گرت.

پێی فەرمو: وەرە بۆ لامان، ئەویش هاتە خزمەتی، پێغەمبەر (ﷺ) (وەك ڕێز لێگرتن) پێی فەرمو: پێداویستیت چیە بیڵێ؟

---

[1] لە کتێبی قصص الرسول (٦٦/٣) وەرم گرتوە.

حديث صحيح، اخرجه ابو يعلى في مسنده (٣٤٤/١) والحاكم (٤٠٤/٢)، وقال صحيح على شرط الشيخين. وقال الالباني: صحيح على شرط مسلم.

ئەویش وتی: حوشترێك بە بارەوە، هەندێ بزنیش کە خێزانەکەم بیدۆشێت..

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: ئەوە ناتوانن وەك پیرەژنەکەی ناو بەنی ئیسرائیل بن؟

هاوەڵانی (خوایان لێ ڕازی بێت) پرسیان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)! مەسەلەی پیرەژنەکەی بەنی ئیسرائیل چۆن بوە؟

ئەویش فەرموی: کاتێك موسا لەگەڵ نەوەکانی ئیسرائیل ویستی لە میسر دەربچێت، ڕێگاکەیان ون کرد، موسا فەرموی: ئەوە چیە؟ واتە: چی بکەین بۆ دۆزینەوەی ڕێگەکە؟

زاناو شارەزاکانی ناویان وتیان: ئێمە شتێکت بۆ باس دەکەین لەم بارەوە، (ئەویش گوێی بۆ گرتن).

وتیان: کاتێك یوسف وەختی مردنی هات، پەیمانی لێ وەرگرتوین کە لە میسر دەرنەچن بەبێ ئەوو (جەستەکەی) لەگەڵ خۆیان بەرن‌و جێی نەهێڵن..

موسا (سەلام خوای لێ بێت) فەرموی: جا کێ ئەزانێ گۆڕەکەی لە کوێدا نێژراوە؟

ئەوانیش وتیان: کەسمان نازانین گۆڕەکەی لە کوێدایە جگە لە پیرەژنێك؟؟

موسا پێغەمبەریش (سەلامی خوای لێ بێت) ناردی بە دوایداو پێی فەرمو: شوێنی گۆڕەکەی یوسفمان پێ بڵێ..

پیرەژنەکەش وتی: نا، وەڵڵاهی پێت ناڵێم تا پاداشتەکەیم نەدەیتەوە..

موسا فەرموی: پاداشتەکەی چیە؟

پیرەژنەکە وتی: داوام بۆ بکەیت لە بەهەشتدا ببمە هاوڕێت‌و لەگەڵ تۆدا بم!.

بەڵام پێغەمبەر موسا ئەمەی پێ ناخۆش بو، نەیتوانی وەعدی ئەوەی پێ بدات..

بەڵام خوای گەورە نیگای بۆ نارد کە پەیمانی بدەرێ (ئێمە بۆت جێبەجێ دەکەین)و ئەویش داواکەی جێبەجێ کرد.

پیرەژنەکەش بردنی بۆ لای دەریاچەیەك، کە گۆماوێکی بچوکی لێ بو ئاو تیایدا وەستابویەوە پێی وتن:

ئاوەکەی خاڵی بکەن‌و ئەوانیش دەستیان کرد بە خاڵی کردنی ئاوەکە تا چاڵاوەکەیان وشك کردەوە.

پاشان پێی وتن: ئادەی زەویەکە هەڵکەنن‌و لاشەکەی دەربهێنن..

ئەوانیش دەستیان کرد بە هەڵکەندن تا گەیشتنە گۆڕەکەی‌و دەریان هێنایەوە.

هەر کە دەریان هێنایە سەر زەویەکە یەکسەر دنیا وەك ڕۆژی ڕۆشنا ڕوناك بویەوە..

# چیرۆكی دەیەم

## مەرجی گەورە

ئەو شەوەی فیرعەون خەریك بو بدات بەسەر موسا پێغەمبەرو شوێنكەوتوەكانیداو لە ناویان بەرێت..

خوای گەورە وەحی نارد بۆ موساو فەرمانی پێدا خۆتو هەمو شوێنكەوتوانت لە بەنی ئیسرائیل میسر بەجێ بێلّن ڕێڕەوی دەریا بگرنە بەر..

ئەویش هەمو شوێنكەوتوانی كۆ دەكاتەوەو دەڵێ دەبێ ئەم شەو دەربچین چونكە فیرعەون پێی زانیوینو دەدات بەسەرمانداو تاقمان لێ دەبڕێت..

هەمو بە گوێیان كردو ژنو پیاوو گەورەو بچوك بە دزیەوەو لە ژێر باڵی تاریكایی شەودا كەوتنەڕێو هەر لایان نەكردەوە بزانن سەربازانی فیرعەون دەرنەكەوتون..

ماوەیەك ڕۆیشتنو لە ناكاو هەمو وەستان.. واقیان وڕما.. یەكێك هاواری كرد:

ئەمە كەی كاتی وەستانە بۆ خاتری خودا.. مەوەستن هاكا سەربازەكان گەیشتنو هەمومان قۆڵبەستە كەن..

دەلیلەكەیان وەستابو.. نەیدەزانی بە كام ڕێگادا بڕوات.. موسا (سەلامی خوای لێ بێت) دەلیلەكەی بانگ كردو پێی وت: خۆ تۆ باش شارەزای ئەم ناوچانەی بۆ وەستاوی؟

دەلیلەكە بە زمانێكی شڵەژاوەوە وتی: گەورەم.. ئەی پێغەمبەری خوا ئەمە یەكەم جارمە ڕێگەم لێ هەڵە ببێتو خۆیشم تێ ناگەم.. هەرگیز ئەمە لێ بەسەر نەهاتوەو كون بە كونی ئەم ناوچانە شارەزام..

موسا فەرموی: خێری پێوە بێت (ان شاء الله) ئەمەش كاری خوایەو بێ حیكمەت نیە، خەڵكەكەی ئێور كردەوەو دڵنیای كردن لەوەی كە خوای گەورەیان لەگەڵدایەو خوایش لە فیرعەون گەورەترەو دەستەڵاتی زۆر زیاترە..

پاشان فەرمانی دەركردو هەمو ئاقڵ مەندانی ناویانی كۆكردەوەو مشاوەرەی پێكردن..

زاناكانی ناو هۆزەكەی (بەنی ئیسرائیل) وتیان: ئێمە لەم بارەیەوە شتێك دەزانین ئەگەر ڕوخسەت بفەرمویت عەرزتی دەكەین.

موسا پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) زۆر دڵخۆش بو.. خێرا فەرموی: ئەی بۆ نایڵێن، ئەی ڕاوێژ بۆچی كراوە؟. فەرمون.

یەكێك لە زاناكانیان وتی: وەختێ خۆی كاتێ یوسف پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) كاتی سەرەمەرگی هات، كۆی كردینەوەو سوێندی داینو بەڵێنی لێ وەرگرتین كە لە میسر دەرمەچنو هەر كاتێك لە میسر دەرچون منیش لەگەڵ خۆتان بەرنو بەجێم نەهێڵن لەناو گۆڕەكەمدا..

موسا زۆر دڵخۆش بو.. یەكسەر فەرموی: دەی هەروایە.. ئەوەیە كە وتم حیكمەتێكی گەورەی تێدایە وا لە تاریكایی شەوەكەدا ڕێگەكەمان لێ ون بوە..

دەی باشە ئێستا كەسێك شوێن گۆڕەكەی دەزانێت؟

وتیان: كەسمان نازانینو بیرمان نەماوە لە كوێدا نێژراوە بەڵام ئەڵێن تەنها كەسێك جێ گۆڕەكەی بزانێت پیرەژنێكەو لەگەڵ خۆمانداو لەناو لەناو كاروانەكەماندایە..

موسا خێرا ناردی بە دوایداو ئەویش وەك سەربازێكی گوێڕایەڵ یەكسەر هاتە خزمەتیو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (گیانم فیدات بێت) بە چی ئەتوانم خزمەتتان بكەم؟

موسا پێغەمبەر فەرموی: ئەڵێن تەنها تۆ دەزانیت یوسف پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) لە كوێدا نێژراوە.. ئەمە ڕاستە؟

پیرەژنەكە وتی: گەورەم بەڵێ ڕاستە من جاربەجار دەڕۆمە سەر گۆڕەكەیو دوعای پایەبەرزی بۆ ئەكەمو داوای لێخۆشبونو بەزەیی خوا دەكەم.. بەڵام پێم ناڵێن بۆ چیتانە لەم شەوە ترسناكە تاریكەدا؟ ئەمە كەی وەختی ئەو پرسیارەیە..

موسا پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) فەرموی: كاتمان بە دەستەوە نیە داپیرە گیان زوكە پێمان بڵێ ئێمە تا لاشەی پیرۆزی لەگەڵ خۆماندا نەبەین لەم گرفتە ڕزگارمان نا بێتو ڕێگەكەمان نادۆزینەوە.

داپیرە: ئاوا زۆر گرنگە.. دەی من پێتان دەڵێم بەڵام یەك مەرجم هەیە، یان بڵێم یەك داواکاریم هەیە!..

موسا فەرموی: مەرجت دەخەینە سەر چاومان چیە بیڵێ؟

داپیرە وتی: پەیمانم بدەرێ لە بەهەشتدا ببمە هاوڕێت و لەگەڵتدا بژیم (واتە ببمە خێزانت).

موسا (سەلامی خوای لێ بێت) تەزویەك بە بەدەنیدا هات و لە جێی خۆی وشك بو، زۆر پێی ناخۆش بو لە دڵی خۆیدا وتی:

خۆ بەهەشت بە دەستی کەس نیە تا ببەخشێت جگە لە خوا، لە لایەکی تریشەوە لەوانەیە من پێم ناخۆش بێت و حەز نەکەم بە هاوڕێیەتی و ژیان لەگەڵ ئەم ئافرەتەدا..

لەم خەیاڵاتەدا بو لە ناکاو فەیضی پەروەردگار هاتە جۆش و نیگا دابەزی بۆ پێغەمبەر موساو فەرمانی پێککرد کە بە مەرجی ئەو داپیرەیە ڕازی بێ و ئێمە بۆی دەهێنینە دی.

موسا سەیرێکی پیرەژنەکەی کردو پێی فەرمو: مژدەت لێ بێ خوای عز وجل بە مەرجەکەت ڕازی بو.. فەرموی شوێنی گۆڕەکەمان پێ بڵێ تا خێرا هەڵی بدەینەوەو بە ڕێزەوە لەگەڵ خۆمان ببەین..

پیرەژنەکەش بردنی بۆ لای گۆماوێك و داوای لێ کردن ئاوەکەی خاڵی بکەنەوە.. ئەوانیش هەر هەمویان بەشداریان کردو لە ماوەیەکی کورتدا ئاوەکەیان خاڵی کردەوە..

پیرەژنەکەش ئاماژەی کرد بۆ جێگایەك وتی: ئا ئێرە هەڵ بکەنن.. ئەمە شوێنی گۆڕەکەیە..

ئەوانیش دەستیان کرد بە هەڵکەندنی و هەر ئەوەندەیان زانی جەستەی پیرۆزی یوسف دەرکەوت کە وەم مانگ دەدرەوشایەوە..

هەر کە هێنایانە دەرەوە خێرا ئەو ناوە وەك ڕۆژی ڕۆشنا ڕۆشن بویەوەو بە جوانی ڕێگەکەیان دۆزیەوەو بە جەنازەی یوسف پێغەمبەرەوە دەستیان کرد بە ڕۆیشتن و لە دەستی فیرعەون و سەربازە خوێنرێژەکانی ڕزگاریان بوو بەرەو فەلەستین بردیان و لەوێ ئەسپەردەیان کردەوە.

# پەندو ئامۆژگاریەکانی ئەم چیرۆکە

١ـ زۆر گرینگە لەسەر مرۆڤی موسڵمان خاوەن پەیام کە ڕێزی تەواو لە ڕادەبەدەر ببەخشێتە دەوروبەرەکەی ئیتر لە ئاستی خۆیشی زۆر نزمتر بن، چونکە خۆرەی بانگخوازان خۆبەزلزانینە!..

نابینی پێغەمبەر (ﷺ) ڕێز لە ئەعرابیەك دەگرێت کە نزمترین ئاستی کۆمەڵگا بون لەو سەردەمەدا لە لایەنی ڕۆشنبیریو فامەوە.

٢ـ دەبێ سەرکردە زۆر بەخشندەو دەست بڵاو بێت لەگەڵ خەڵکانی خوار خۆیداو هەر ئەو کارەشە وای لێ دەکات بچێتە ناو دڵیانەوەو لە پێناویدا سەری خۆیان دابنێن..

هەر سەرکردەیەکتان بینی چروكو ڕەزیل بو!. هەر کۆی ئەکردەوە! بۆ خۆی دەژیا! دڵنیا بن ئەوە سەرکردە نییەو ڕۆژێ لادەبرێتو ئەوە بە هۆیەکی هەڵەوە (خلل فني) خراوەتە ئەو جێگایە..

نابینی پێغەمبەرمان (ﷺ) چونکە مەرجی سەرکردایەتی تێدایە بە دەشتەکیەکە دەفەرموێت: سل حاجتك! واتە: چیت پێویستە داوا بکە..

٣ـ تا بۆت دەکرێت داوای شتی دنیایی لە کەس مەکەو خۆت بە (عفيف النفس) پیشان بدە، ئەگەریش ناچار بویت داوای بکەیت، داوای شتی کەمو زروریات بکە..

نابینی ئەعرابیەکە داوای وڵاخێك سواری ببێو ئاژەڵێك شیرەکەی بدۆشێتو بیخواتەوە.. ئیتر نەیوت بمکە بەرپرسی یەمەن! سان سەرکردەی سوپا!

٤ـ هەمیشە هانی خەڵکی بدە بۆ ئەوەی بەرزیان بکەیتەوەو لە زەویو داواکاریە دنیاییە کاتییەکان بیانبچڕێنێتو هەوڵ بدە داوای ڕەزامەندی خواو بەدەستهێنانی بەهەشت بکەنو ئەوە گەورەترین ئاواتیان بێت.

نابینی پێغەمبەر (ﷺ) چۆن فەرموی بە هاوەڵان بۆچی وەك پیرەژنەکەی بەنی ئیسرائیل نابنو داوای بەهەشت بکەن.

٥- پێشڕەوی‌و (قدوە)یی مەرج نییە لە کەسانێکدا بن کە خاوەنی پلەوپایەی بەرزو بڕواناکەی زانستی‌و توانای سەربازی لە ڕادەبەدەر بن!

نەخێر بەڵکو وا دەبێ مرۆڤ پێشڕەو چاولێکراو بێت لە کاتێکدا کە کەسێکی زۆر نادیاری ناو کۆمەڵگە بێت.

٦- لە چڵەپۆپەی دەروونناسیە کە بۆچونی کەسێکت بە دڵ نەبو ویستت وای لێ بکەیت بۆچونی گەورەترو جوانتری هەبێت..

دەبێ تەریقی نەکەیتەوەو ڕاستەوخۆ پێی نەڵێیت‌و ناوی نەبەیت بەڵکو وەك پێغەمبەرە نازدارەکەت بە (ﷺ) کە چۆن ویستی بۆچونی ئەعرابیەك ڕاست بکاتەوە بەڵام ڕوی کردە هەمو هاوەڵان‌و پێی فەرمون: ئەوە ناتوانن وەك وەك پیرەژنەکەی بەنی ئیسرائیل بن!؟

٧- مرۆڤ لە ژیانیدا دوچاری ڕێ لێ ون بون یان تێکەوتن یان بەهەڵەداچون دەبێت با لە بەرزترین ئاستیشدا بێت.. هیچ عەیب نییە بۆی کە لە مەسەلەیەکدا شارەزا نەبێت دانی پێدا بنێت‌و بیداتە دەستی کەسانی تایبەت بەو بوارە.

نابینی موسا (سەلامی خوای لێ بێت) ڕێگە شارەزا نەبو.. هیچیش لە ئاست بەرزی پێغەمبەریەکەی کەمی نەکردو خۆی بە کەم نەزانی‌و زۆر ئاسایی پرسیاری ڕێگەچارەی کێشەکەی کرد لە زاناکانی دەوروبەری!.

٨- لە مەرجی کەسانی سەرکردە ئەوەیە هەمو کارەکان خۆی نەیکات‌و خۆی بە (تاقانەی زەمانە) نەزانێ، وا بزانێ کەس شایستەی هیچ کارێك نیەو کەس وەك خۆی بە جوانی نایکات..

بەڵکو دەبێ وەك موسا بێت (سەلامی خوای لێ بێت) چۆن پرس‌و ڕای بە چواردەورەکەی خۆی کرد دەربارەی دۆزینەوەی ڕێگاکە..

٩- دەبێت سەرکردە زۆر لەسەرخۆو نەرم‌و نیان بێت لەگەڵ کەسانی چواردەوری خۆیداو بە کەسانی زاناو ڕۆشنبیر سەیریان بکات‌و گوێ بۆ بۆچونەکانیان بگرێت‌و کاریشی پێ بکات.

نابینی موسا پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) چۆن گوێ شل دەکات بۆ خوێندەوارەکانی ناو بەنی ئیسرائیلو ئەوانیش باسی مێژوی یوسفی بۆ دەکەن کە لە ڕاستیدا موسا ڕابەرو فێرکەریان بو.. خوایش ئەوی ئاگادار کردبو لە هەمو مەسەلە گەورەو گرانەکانی پێش خۆی.

١٠ـ مرۆڤی موسڵمان خاوەنی بیناییەکی تیژەو شتی لە بیر ناچێتەوە مەگەر بە هۆی گوناه کردنەوە ئەو بیناییو بەسیرەتو فراسەتەی لێ وەربگیرێتەوە..

نابینی زاناکانی ناو بەنی ئیسرائیل تا ڕێگەکەیان لێ هەڵە نەبو بیریان نەکەوتەوە کە یوسف (سەلامی خوای لێ بێت) وەسیەتی بۆ کردون کە گۆڕەکەی بەرێتەوە بۆ فەلەستین بۆ لای گۆڕی باوباپیرانی کە پێغەمبەرانی خوا بون (سەلامی خوایان لێ بێت).

١١ـ کارەکانی خوای گەورە بێ حیکمەت نییە، سەیر بکە چۆن خوای گەورە کارێکی وای کرد بە شوێنکەوتوانی موسا (سەلامی خوای لێ بێت)و ڕێگەی لێ هەڵە کردن تا بەو هۆیەوە گۆڕی یوسف لەو زۆنگاوە ڕزگار بکەنو بە ڕێزەوە بەرەو وڵاتی شام بەڕێی بخەن.

١٢ـ پێغەمبەران لە دوای مردنیشیان دەکرێت خوای گەورە جەستەکانیان وەك موعجیزە بە جوانیو نەشێواوی بهێڵێتەوەو لەگەڵ هێنانە دەرەوەیدا ئەو شەوە تاریکە وەك ڕۆژی ڕوناك ڕوناك بکاتەوە.

١٣ـ وشەی (عظام) واتە (ئێسك) لە فەرمودەکەدا هاتوە، شێخ ئەلبانی ئەفەرموێت: زۆر سەرسام بوم دەبێت چۆن دژی ئەو فەرمودەیەیە کە دەفەرموێت: لاشەی پێغەمبەران زەوی نایخوات.. لە دوایدا سوپاس بۆ خوا بۆم دەرکەوت عەرەب وشەی (عظام) بە کاردێنن بە مانای جەستەکە هەمویەتیو بەو هۆیەوە ئیشکالەکەم ڕەویەوە نەما.[1]

١٤ـ مرۆڤی تێگەیشتو ژیر ڕۆژی قیامەتو ڕەزامەندی خواو بەهەشتی بە لاوە گرنگترە لە پارەو سامانو ماڵی دنیا وەك پیرەژنەکە وای کرد (ڕەحمەتی خوای لێ بێت).

١٥ـ سەرکردە دەبێت گوێ بۆ خواری خۆی بگرێتو سود لە زانیاریەکانیان وەربگرێتو لە بەرامبەریشدا ئەگەر داوایەکیان هەبو جێبەجێی بکات بۆیان.

---

١ السلسلة الصحيحة (١/٦٢٣ـ٦٢٤) للشيخ ناصر الدين الالباني.

١٦ـ لە بەرنامەی خودادا دیکتاتۆریەتو تاکڕەوی لە حوکمڕانیدا نیە، ئەوەتا ئەو پیرەژنە ئەوەندە دڵنیایە لە دادپەروەریو بەبەزەیی موسای سەرکردەی.. ناڵێت باشە بەسەرچاو پێتان دەڵێم.. بەڵکو لە بەرامبەردا مەرجیش دادەنێ.. موسایش (سەلامی خوای لێ بێت) دلڕەقانە فەرمان دەرناکاتو بڵێ: بڕۆن بە زۆرو لە ژێر ئەشکەنجەدا زانیاریەکەی دەربارەی قەبرەکەی یوسف لێ وەربگرن.. ئێمە لە حاڵەتی ترس داینو خەریکە ئەمانگرن، کەچی ئەم ژنە ئەیەوێت مەرجم لەسەر دابنێ..

١٧ـ لە هیچ حاڵەتێکدا حکومەتی ئیسلامی بنەمای عەدلو دادو بەزەییو گوێگرتن بۆ خواری خۆی فەرامۆش ناکاتو سەپاندنی باری نائاسایی (حالة الطوارئ) لە دەوڵەتی قورئاندا بونی نییە..

ئەوەتا موسا (سەلامی خوای لێ بێت) فەرمانی نەداو بڵێ: دەی بە زۆر بیڵێ چونکە هەمومان تیا ئەچین!..

١٨ـ سەرکردەی موسڵمان دەتوانێ پارەو ماڵو سامان ببەخشێت بە میللەتو ژێردەستەو سەربازەکانی.. بەڵام زۆر مەحاڵە (جگە) لە خوای (عز وجل) هیچ کەس مافی ئەوەی هەبێت بەهەشت بفرۆشێت بەمو بەو! یان وەعدی بەهەشت بە کەس بدات.. بۆیە موسا (سەلامی خوای لێ بێت) لە شوێنی خۆی وشك بو.. وەڵامی نەدایەوە تا خوا بە وەحی بەهەشتی بەو داپیرە باوەڕدارە بەخشی.

ئەمەش پێچەوانەی کاهنەکانی ئەوروپایە کە پسولەی بەهەشتیان دەفرۆشت بە گاورە داماوەکان، لای خۆیشمان دەیانوت فلانو فلانت خۆش بوێت لە (ئالوبەیت) ئەوە دڵنیا بە دەچیتە بەهەشت با چاکەیشت نەبێت لە دنیا!!..

١٩ـ لە دەوڵەتی قورئاندا گرنگی بە زاناییو داناییو لێهاتویی دەدرێتو کار بەو کەسانە دەسپێردرێت کە دەتوانن ڕای پەڕێننو دڵسۆزن لە کارەکانیاندا ئیتر با خاوەنی ماستەرو دوکتۆراو پرۆفیسۆریش نەبن..

هەندێ کات خاوەن بڕوانامەکان دەبێ بێنە خزمەت کەسانی شارەزاو بە تەمەنو خواناسو چۆك دا بدەنو گوێ بۆ ئەزمونی چەند ساڵەو زانیاری زۆرو زەبەندیان بگرن ئیتر با نەخوێندەواریش بن.

٢٠ــ لە دەوڵەتی قورئاندا ڕێزی زۆر گەورەو گران بۆ پیرو بە ساڵاچوان دادەنرێتو گوێ بۆ بیروبۆچونیان دەگیرێتو وڵات پشتیان پێ دەبەستێ لە خۆشیو ناخۆشیەکاندا..

ئەمەی ئەمڕۆ ئەوروپا پێی گەیشتوە لە ڕێزگرتن لە پیرو گوێگرتن بۆ بۆچونەکانیانو کردنەوەی ئەنجومەنی پیران بۆیان لە پەرلەماندا.

شتێکی تازە نیەو پێغەمبەری خوا (١٤٣٠) ساڵ لەمەوبەر لەم چیرۆکەدا بنەماکانی داڕشتوەو نرخی پیری بەرز هەڵسەنگاندوە.

٢١ــ لە دەوڵەتی قورئاندا ڕێزی تایبەت دانراوە بۆ وەسیەت کردنو جێبەجێکردنی داواکاریەکانی مرۆڤ لە دوای مردنی بە مەرجێ داواکانی ڕەوا بنو گوناهو خراپەو پچڕاندنی سیلەی ڕەحمی تێدا نەبێت.

نابینی زاناکانی بەنی ئیسرائیل چۆن ڕێز لە وەسیەتی یوسف پێغەمبەر دەگرنو لە نارەحەترین کاتدا بیریان دەکەوێتەوەو جێبەجێی دەکەنو لەو پێناوەشدا دەیان نارەحەتیو ترسو بیم قبوڵ دەکەن.

یان لە شەوێکی پڕ لە ترسو بیمدا کە سوپای باوەڕ نزیکە فیرعەون بدات بەسەریداو تەفرو تونای بکات کەچی وەسیەتەکەیان جێبەجێ کرد..

یان ئەو هەمو کەسە دوڵچەیان پەیدا کردو ڕوبارێکیان خاڵی کردەوە تا گۆڕەکەی یوسف دەر بخەن.

٢٢ــ ئەم فەرمودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی قورئان هیچ کات نابێ واز لە بنەما شەرعیو دروستەکانی خۆی بێنێو بچێتە سەر عورفی حاکمڕەوا دنیاییەکانی پێش خۆی.. کە گوایە کاری حیزبیو حکومی چۆن بێ، دەبێ حیزبە ئیسلامیەکانیش جێبەجێی بکەن! نەخێر وانیە..

نابینی یوسف (سەلامی خوای لێ بێت) ڕازی نابێ ئەهرامی گەورە بەسەر گۆڕەکەیەوە دروست بکەن وەك فیرعەونو کاربەدەستە گەورەکانی میسری ئەو سەردەمە بەڵکو دەڵێ زەویم بۆ هەڵ بکەنن بمنێژنو نەشمکەن بە مەزارگەو لە هەمو لایەکەوە بێنە سەردانم.

## القصة الحادي العشر
## القرد والتاجر الغشاش

عن أبي هريرة (رضي الله عنه) ان رسول الله (ﷺ) قال:

((إن رجلاً حمل معه خمراً في سفينة يبيعه، ومعه قرد، قال: فكان الرجل إذا باع الخمر شابه بالماء ثم باعه. قال: فأخذ القرد الكيس فصعد به فوق الدَّقَل، قال: فجعل يطرح ديناراً في البحر وديناراً في السفينة حتى قسمه)).[1]

وفي رواية البيهقي (رحمه الله):

قال رسول الله (ﷺ): ((ألا وإن رجلاً ممن كان قبلكم جلب خمراً الى قرية، فشابها بالماء فأضعف أضعافاً، فاشترى قرداً، فركب البحر، حتى إذا لجج فيه، ألهَمَ الله القرد صرة الدنانير فأخذها فصعد الدقل ففتح الصرة، وصاحبها ينظر إليه، فأخذ ديناراً فرمى به في البحر، وديناراً في السفينة حتَّى قسَّمها قسمين)).

واتە: ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: پیاوێك لە کەشتیەکدا ئارەقێکی (خمر) زۆری بۆ فرۆشتن هەڵگرتبو، لەناو کەشتیەکەیدا مەیمونێکی لەگەڵ خۆی بردبو، لە ڕێگادا بە بەرچاوی مەیمونەکەیەکە ئاوی کردە ناو ئارەقەکەوەو بەو هۆیەوە ئارەقەکە بو بە دو ئەوەندە، هەموی فرۆشت بە پارەیەکی زۆر، مەیمونەکە کیسە پارەکەی فڕاندو چوە سەر چارۆکەی کەشتیەکەو دەستی دەکرد بە کیسە پارەکەداو دینارێکی هەڵدەدایە دەریاکەوەو دینارێکیشی هەڵدەدایە ناو کەشتیەکەوە تا کردی بە دو بەشی یەکسانەوە.

لە ڕیوایەتەکەی بەیهەقیدا هاتوە کە بە پارەکەی مەیمونێکی کڕیو خوای گەورەیش شوێنی کیسە پارەکەی نیشان داو ئەویش فڕاندیو چوە سەر چارۆکەی کەشتیەکەو بە بەرچاوی پیاوەکەوە پارەکەی کرد بە دو بەشەوەو دینارێك بۆ ناو دەریاکەو دینارێکیش بۆ ناو کەشتیەکە..

---

[1] صحيح، رواه احمد في المسند (٨٠٤١) شێخ احمد شاكر دەڵێت: (إسناده صحيح) لە کتێبی (صحيح قصص الرسول (٥٧/٣) وەرم گرتوە.

## چیرۆکی یانزەیەم
## مەیمون و بازرگانێکی گزی باز

یەکێك لە بازرگانەکان لە شوێنێکەوە کاڵایەکی دەکڕیو دەیبرد بۆ جێیەکی تـرو لـەوێ بە پارەیەکی زۆر دەیفرۆشتەوە..

ڕۆژێك لە ڕۆژان ئارەقێکی زۆری کڕیو خستیە نـاو کەشـتیەکەیو بـەرەو شـارێکی دور کەوتەڕێ بۆ فرۆشتنی..

کردبوی بە عادەتی خۆی لـە هـەمو گەشـتە بازرگانیەکانیـدا مـەیمونێکی هـەبو لەگـەڵ خۆی دەیبرد..

ئەم مەیمونە هەندێ سەلیقەی وردی تێدابو.. خاوەنەکەی زۆر خۆش ئەویستو ئـەویش بەبێ ئەو بۆ هیچ گەشتێك نەدەچو..

لە ڕێگا ئەم بازرگانە بیرێکی خـراپ هـات بـە مێـشکیداو بـە دەم خۆیـەوە وتـی: باشـە بۆچی ئاو نەکەمە ناو ئـەم گۆزانـەو ڕێـژەی ئارەقەکـەی زۆر ببێـتو قـازانجێکی زۆر زیـاتر بکەم..

چی تیایە با زۆر خەستیش نەبێتو ئێ خۆ کەسیش ئاگای لێ نیەو کێ ئـەزانێ! ئـێ بـا بیشزانن خۆ پێیان ئەڵێم، هەر خۆی کەمێ تەڕە بەڵام زۆر بە چێژو بە لەزەتە..

مەیمونەکەش بەرامبەری دانیشتبو بەڵام نەیدەزانی ئەم پیاوە بیر لە چی دەکاتەوەو چ پیلانێکی بە دەستەوەیە..

پیاوەکە ئاوێکی زۆری کردە هەمو گۆزەکانو تا وایان لێهات دو گـۆزەی خـاڵی پـێ پـڕ کردن واتە بون بە چوار گۆزە..

کاتێك گەیشتە قەراغی دەریاکەو کەشتیەکەی بەسـتەوەو گۆزەکـانی بـە کرێکارەکـانی قەزاغ دەریادا گوێستەوە بۆ بازاڕو بە نرخێکی چاك فرۆشتی..

بە پێکەنینو ڕویەکی خۆشەوە مەیمونەکەی خستە سـەر شـانیو بـە کیـسەیەك پـارەی پـڕەوە بـەرەو قـەراغی دەریاکـە ڕۆیـشتو بـە زەوقو شـەوقێکەوە خـۆی هاویـشتە نـاو کەشتیەکەوە..

هەناسەیەکی خۆشی هەڵمژی‌و پاشان تۆزێك یاری کرد بۆ مەیمونەکە هەرچەندە مەیمونەکە ڕوی خۆش نەبو وەك جاران هەڵبەزو دابەزی نەکرد لەبەر دەمیدا..

بازرگانەکە سێوێکی بە دەمەوە بو تا دەستی بگرێت تێی گرت بەڵام بەری نەکەوت‌و وتی:

چیە؟ مەیمونە فەنی.. من ئەمڕۆ زەوقم هەیەو پارەیەکی خەیاڵی زۆرم چنگ کەوتوەو خۆشیمە، کەچی تۆ مۆن بویت..

(بە دەم خۆیەوە) لەوەتی لە هیندستان کڕیمە وا نەبوە زۆر سەیرە تێ ناگەم ئەگەر هەر وابێت ئەیفرۆشم هاوڕێ مژومۆڵ‌و مۆنم بە درهەمێك ناوێ... ئاه. ئاه...

کیسە پارەکەی لەگەڵ شتەکانی تریدا لەناو کەشتیەکەدا داناو چو بۆ سەوڵ لێدان‌و بە دەم سەوڵ لێدانەوە سەیری مەیمونەکەی دەکردو بە دەم خۆیەوە خەیاڵی پارە زۆرەکەی دەکرد..

ئیتر ئەم بازرگانە وای دەزانی کارەکەی کردوەو توانی خەڵکی داماوی ئەو شارە بخەڵەتێنێ‌و کەس ئاگای لێ نەبوە!!

نازانێ خوای پەروەردگار ﴿وَإِنَّهُۥ عَلَىٰ ذَٰلِكَ لَشَهِيدٌ﴾ یان ﴿أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ﴾و بینەرو بە ئاگایە لە کاری هەمو دروستکراوەکانی‌و مەحاڵە بەبێ ئاگایی‌و چاودێری ئەو هیچ کارێك بکرێت لە گەردوندا.

بۆیە خوای پەروەردگار ویستی ئەم بازرگانە گزی بازە بە ئاگا بێتەوەو بیخاتەوە سەر ڕێگای ڕاست‌و تێی بگەیەنێت کە کاری بازرگانی‌و کڕین‌و فرۆشتن زۆر ترسناکەو ئەگەر مرۆڤ بە ئاگا نەبێت‌و خوای لە یاد بچێت زۆر ئاسانە خەڵکی داماو ڕەش‌و ڕوت بخەڵەتێنێ‌و گزیان لێ بکات‌و کەسیش پێی نەزانێت..

بەڵام خۆ خوا بە خەبەرە.. بە ئاگایە.. چاودێرو ڕەقیبە بەسەر کاروکردەوەی مرۆڤەکانەوە..

لـە ڕێگـای دروسـتكراوێكی بـێ زمـان.. بـێ عـەقڵی وەك مەیمونەكەیـەوە بـە ئاگـای هێنایەوەو بیری لە كارە پڕ لە غەشو گزیبازیەكەی خۆی كردەوە، تا بۆی دەركـەوێت كـە نیوەی ئەو پارەیە غەشەو نیوەی حەڵاڵە بۆی..

بە ئیرادەی خوای بە توانا.. مەیمونەكەی بە ئاگا كرد لـە شـوێنی كیـسە پارەكـەو چـو هێنایو گرتـی بـە دەسـتیەوەو یـاری پـێ دەكـردو لـە لای قـەراغی كەشـتیەكەوە شـۆڕی ئەكردەوە خوارەوەو بەرزی ئەكردەوە.. چەپڵەی لێ ئەداو پێئەكەنیو هەلهەلەی دەكرد..

بازرگان كە ئەو دیمەنەی بینی چاوی پەڕیە تەوقی سەری.. تورە بو سـەوڵەكانی دانـاو ڕای كرد بە دوایدا تا پارەكەی لێ بسەنێتەوەو ئـەویش كـون بـە كـون ئەیفڕانـدو بـە دوای یەكدا ڕایان دەكرد تا سەرەنجام كابرا هیلاك بـو بـۆی نـەگیراو مەیمونەكـەش هـەڵیكرد بـە داری چارۆكەی كەشتیەكەداو چوە نوكەكەی..

كابرای بازرگان بە قسەی خۆشو پێكەنینو بستەو فستقی بۆ هێناو فەرموی خـواردنی لێ دەكردو دەیویست بە بۆنەی خواردنی بستەكەوە بێتە خوارەوە بـەڵام مەیمونەكـە هـەر گوێی بە كابراو بستەو شتەكەی هەر نەدا..

ئەم پەروەردگاری ڕای سپاردوە كە وانەیـەكی دەسـتپاكیو حـەڵاڵ خـۆری پێـشكەشی ئەم بازرگانە باوەڕدارە بكاتو تێی بگەیەنێت بازرگانی موسڵمان دەستو دڵو دەم پاكـەو لە ڕێگای گزیو غەشكردنەوە هەوڵی زۆركردنی پارەكانی نادات..

پیاوەكە ئەوەندەی تر شێت بو.. بە هەردو دەست ئەیدا بە سەریدا.. لێـی دەپاڕایـەوە بێتە خوارەوە بەڵام ئەو كیـسە پارەكـەی كـردەوەو دینـارێكی دەهاویـشتە نـاو دەریاكـەو دینارێكی دەهاویشتە ناو كەشتیەكەو پیاوەكەش دەیگرتەوەو دەیخستە گیرفانی..

مەیمون بەردەوام خەریك بو.. دینارێك بۆ دەریاكەو دینارێك بۆ ناو كەشـیتەكە.. تـا لـە ئاكامدا كردی بە دو بەشی یەكسانەوە..

بازرگانەكە بەشەكەی كۆكردەوەو بـە چـۆكدا كـەوتو تێگەیـشت كـە خـوای گـەورە لـە ڕێگەی ئەم مەیمونەوە ئامۆژگاری كردوە كە پارەكەی نیـوەی حەڵاڵـەو هـی خۆتـە، بـەڵام

نیوەکەی تری هی ئاوەکەیە کە تێم کردوەو بە من نابڕێت بەڵکو بەو دەریا دەبڕی کە لە ئاوەکەی ئەو ئارەقەکەم پڕ کرد لە ئاو..

بۆیە مەیمونەکە هاتە خوارەوەو لە پاڵیدا کسکەی کردو ئەویش بەرزی کردەوەو ماچێکی کردو زۆر سوپاسی کرد لەسەر ئەم وانە پڕ لە مانایەو بڕیاری دا چی تر بیر لە بازرگانی حەرام نەکاتەوە.

## پەندو ئامۆژگاریەکانی ئەم چیرۆکە

١- بازرگانیو کڕینو فرۆشتن فراوانترین دەرگای کارو کاسبیە.. وەك لە فەرمودەدا هاتوە کە نۆ لەسەر دەی ڕۆزی وا لە بازرگانیداو دەڵێن: فەرمانبەریش تەسکترین دەرگای ڕۆزیە.

٢- وا دیارە لەو سەردەمەی پێش ئیسلامدا کڕینو فرۆشتنو خواردنەوەی مەی حەرام نەبوە بۆیە ئەو کابرا باوەڕدارە بازرگانی پێوە کردوە.

٣- مەرج نیە هەر شتێك لە ئیسلامدا حەرام بێت ئیتر نابێ لە فەرهەنگی موسڵماناندا باسو خواسی هەبێت، موسڵمانانی ئەمڕۆ بە هەڵە تێگەیشتون لە سەگو بەرازو عارەقو ناهێڵن لە هیچ کۆڕو چیرۆکێکدا باسو خواستی بکرێت، ئەوەتا پێغەمبەر (ﷺ) باسی بازرگانی مەی دەکاتو دەشزانێت خواردنەوەو کڕینو فرۆشتنیشی حەرامە.

٤- دەبێت بازرگانی موسڵمان زۆر بە ئاگا بێتو زۆر لە پارەی حەرام بترسێتو شتی عادی لە چینەوە نەهێنێتو بیخاتە کارتۆنی ئەسڵیەوەو بیفرۆشێت بە پارەی کاڵای ستاندار.. چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((من غش المسلمين فليس منهم)).[١] واتە: هەر کەسێك غەشو گزی لە موسڵمانان بکات، ئەوە لە ڕیزی موسڵمانان دانانرێت پەنا بە خوا..

٥- دروستە مرۆڤ ئاژەڵێکی کێوی یان باڵندەیەکی هەبێتوماڵی بکاتو لەگەڵ خۆی بیگەڕێنێت بە مەرجێك برسیو تینوی نەکاتو شەڕی پێ نەکات لەگەڵ هاوڕەگەزی خۆیدا، یان کە تورە بو نەیکوژێت یان نەینێتەوە بە نیشانە ئەمانە حەرامنو نابێ لەگەڵ باڵندەو گیانلەبەردا ئەنجام بدرێت.

٦- غەشکردن بە هەمو شێوازەکانی لە ئیسلامدا حەرامە بەڵێ بە تایبەت باسی ئاو تێکردنی کردوەو لە سەردەمی عمری کوڕی خطابدا قەدەغەی کرد ئاو بکرێتە شیرەوەو

---

١ رواه الطبري في الكبير ورواته ثقات كذا قال المنذري في الترغيب (٢٥٤٠).

وتووێژی نێوان کچە باوەڕدارەکەو دایکەکەی ئاشکرایە کە نەیهێشت دایکی ئاو بکاتە ناو شیرەکەوەو پێی وت: ئەگەر عومەر ئاگای لێ نەبێت، خۆ خوای عومەر ئاگای لێیەو نەنوستوە.

٧ـ لە جۆرەکانی تری غەش کردن:

١ـ غەش کردن لە گۆڕانی سیمادا وەك ئەوەی قژو سەرو ڕیش‌و سمێڵی بۆیەی ڕەش بکات‌و خۆی بە گەنج پیشان بدات..

٢ـ غەش کردن لە موسڵمانەتیدا وەك ئەوەی ڕیشی سوننەت بهێڵێتەوەو بەر سمێڵ بکات یان ئافرەت سەرپۆش (حجاب) لەبەر بکات‌و لە ژێرەوە گوناهکار خوانەناس بێت کە ئەوە کاری دوڕووەکانە..

٣ـ غەش کردن لە هاوڕێیەتیدا وەك ئەوەی لە کاتی ڕاوێژدا ڕێگای خوارو خێچی پێ بڵێ، یان ناپاکی لەگەڵ خێزان‌و کچەکەیدا بکات یان دزی لێ بکات..

٤ـ غەش کردن لە بڵاوکردنەوەی نهێنیەکان‌و پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمویەتی: ((المجالسُ بالأمانة)) [1] واتە: نابێ نهێنی دانیشتنەکان ناپاکی لێ بکرێت‌و بڵاوبکرێتەوە.

٥ـ غەش کردن لە فەتواداندا، ئەمە ترسناکترین غەشە چونکە لە باتی خوای گەورە ئیمزای دروستی‌و نادروستی مەسەلە شەرعیەکان دەکات.

٨ـ ئەگەر کەسێك کارێکی نادروستی ئەنجام داو کەوتە ناو حەرام‌و ناشەرعیەوە.. ئەو کەسە ئەگەر کەسێکی چاك بێت‌و بە نەزانی‌و بە تێکەوتن دوچاری ئەو ناپاکیە بوبێت.. ئەمەل هەیە خوای گەورە دەستی لێ هەڵنەگرێت‌و ئەگەر بە نوادندی موعجیزە یان کەرامەتێکیشەوە بێت دەیگێڕێتەوە سەر ڕێگای ڕاست‌و بە ئاگای ئەهێنێتەوە.

نابینی لە ڕێگەی مەیمونێکەوە تێی دەگەیەنێت کە نیوەی پارەکە بۆ تۆ حەڵاڵەو نیوەکەی تری مافی دەریاکەیە..

---

١ الأحیاء (٧٨٢/٤).

٩ـ خوای گەورە ئەم کارە چاکە لەگەڵ هەمو کەسێکدا ناکاتو ئەوانەی کە پەنا بە خوا ڕۆچون لە غەش کردنو گزیو چاوبەستی خەڵکیدا، خوا پشتیان لێ هەڵ دەکات بواریشیان دەدات کە بەردەوام بن لەسەر کاری خۆیانو بەڵام دەرگای تەوبەیان دەخاتە سەر پشت بۆ ئەو جۆرە غەشاشانە..

١٠ـ ئەو بازرگانەی غەشو گزی دەکاتو پارەی زۆر پەیدا دەکات، لە بەرامبەردا ئەو بازرگانە خواناسەی کە غەشو گزی ناکاتو ڕازیە بە قازانجێکی کەم، ئەوەی ئەم باشترەو بەرەکەتدارترە لەوەی یەکەم.

پێشەوا غەزالی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: (جاری وا هەیە تەنها درهەمێك چەند کەمە خوا بەرەکەتی تێ دەخاتو خاوەنەکەی بەختەوەری دنیاو ئاخیرەت دەکات، هەزارانو ملیۆنەها دیناری دەوڵەمەندەکەش کە بە حەرام پەیدای کردوە دەبێتە هۆی ئاژاوەو نەخۆشیو لەناوچونی خاوەنەکەیو تا وای لێ دێت ئاواتەخواز بێت کە هەژار بوایە.[1]

---

١ موعظة المؤمنين من أحياء علوم الدين/ الغزالي.

# القصة الثاني العشرة
# سحابة خاصة

عن ابي هريرة (رضي الله عنه) عن النبي (ﷺ) قال: ((بينا رجل بفلاة من الأرض، فسمع صوتاً في سحابة: إسق حديقة فلان فتنحى ذلك السَّحاب فأفرغ ماءه في حرة.

فإذا شرجة من تلك الشراج قد استوعبت ذلك الماء كله، فتتبع الماء، فإذا رجل قائم في حديقته يحول الماء بمسحاته، فقال له: يا عبدالله ما اسمك؟ قال: فلان، للاسم الذي في السحابة.

فقال له: يا عبدالله، لم تسألني عن اسمي؟ فقال: أني سمعت صوتاً في السحاب الذي هذا ماءه يقول: اسق حديقة فلان لاسمك فما تصنع فيها؟

قال أما إذ قلت هذا، فإني أنظر إلى ما يخرج منها، فأتصدق بثلثه، وآكل أنا وعيالي ثلثا، وأردُّ فيها ثلثه)).[١]

واتە: ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێت) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە كە فەرمویەتی: جارێك پیاوێك لە دەشتێكدا دەڕۆیشت بۆ كارێك، لە ڕێگا گوێی لە دەنگێك بو لەناو هەورەوە دەیوت: ئەی هەور بڕۆ باخی فڵان كەس ئاو بدە !.

هەورەكەش لایدا بۆ لایەكی ترو چو لەوێ هەمو ئاوەكەی لەوێ ڕشتو ئاوەكەشی چو بە جۆگەیەكداو كەوتەڕێ ئەویش بە دوایدا ڕۆیشت تا خۆی كرد بە باخی پیاوێكدا كە خاكەناسەكەی بە دەستەوە بو ئاوەكەی ئەملاو ئەولا پێ دەكرد..

ڕوی تێ كردو پێی وت: ئەی بەندەی خوا ناوت چیە؟ وتی: فڵان، هەمان ئەو ناوەی لە هەورەكەدا بو..

---

١ رواه مسلم (٢٩٨٤) لە كتێبی (صحيح قصص الرسول) وەرم گرتوە، (٦١/٣).

بەلاَم تۆ بۆچی لە ناوی من دەپرسیت؟ ئەویش وتی: من گوێم لە دەنگێك بو لەناو ئەو هەورەوە کە ئەمە ئاوەکەیەتی دەیوت: بڕۆ باخی فلاَن کەس ئاو بدەو ئەم ناوەی تۆی برد، باشە تۆ چی دەکەیت بەم باخەت؟

پیاوەکەش وتی: کە مادەم ئەمەت وتو زانیت پێم، پێت دەڵێم، من سەیری بەروبومەکەی دەکەم.. هەر کاتێك هاتە بەر، سێیەکی دەکەم بە خێرو سێیەکی دائەنێم بۆ بژێوی خۆم‌و ماڵ‌و منداڵەکەم‌و سێیەکیشی لە باخەکە خۆیدا خەرج دەکەمەوە.

# چیرۆکی دوانزەیەم

## هەورێکی تایبەت

جارێك یەکێك لە پیاو چاکان بۆ کارێك لە ماڵ دەرچو.. بەناو دەشتێکی پانو پۆڕدا دەڕۆیشت، لە ڕێگا سەری هەڵبڕی هەورێکی بینی وا دیاربو بارانی پێ بو، بە دەم خۆیەوە دەیوت:

ئەی خوایە گیان ئەم هەورە جوانەت دروست کردوەو لە ڕێگای ئەم هەورەوە سەر زەوی سەوزو جوانو ڕازاوە دەکەیتو زەوی مردو سەرلەنوێ زیندو دەکەیتەوە..

چەند خوایەکی گەورەی پەروەردگارم.. خوایە ئەم هەورە جوانە بارانێکی بە ڕەحمەتی لێ ببارێنەو دۆڵو چیاو دەشتەکانمان پڕ لە ئاو بکەرەوە..

لەم ساتە شتێکی زۆر سەیر ڕویدا! هاواری کرد وتی: ئەی خوایە گوێم ئەزرینگێتەوە یان ئەمە ڕاستیە؟

من خەریکە شێت ئەبم.. یەکەم جارە ئەبیستم لەگەڵ هەوردا قسە ئەکرێت با جوان گوێ شل بکەم شتێکم بۆ دەر بکەوێت، لە وڵاخەکەی دابەزیو نوتقی لە خۆی بڕی گوێی شل کرد:

دەنگەکە هاواری ئەکردو بە هەورەکەی ئەوت: ئەی هەورەکە بڕۆ باخی فلان کەس ئاو بدە!!.

پیاوە خواناسەکە وتی: وەڵلاهی گوێم نازرینگێتەوەو مەسەلەکە ڕاستیە ناوی باخەوانەکەشی برد.. خۆزگەم بەو باخەوانە.. دەبێ چی کردبێت وا لە لای خوا ئەوەندە خۆشەویست بوە خوا خۆی هەور دەنێرێتو باخەکەی بۆ ئاو دەدات؟..

سەرێکی هەڵبڕی بۆ هەورەکە.. شتێکی سەیری بینی.. خێرا هەورەکە گوێڕایەڵی دەنگەکەی کردو بەرەو لایەك ملی ڕێی گرتو پاشان لە لای دۆڵێکدا هەمو بارانەکەی خۆی ڕژاند..

ئاوەکەش سەرەوخوار بویەوە هەموی چوە ناو جۆگەیەكو سەربەرەوخوار ملی ڕێگەی گرت..

پیاوەکەش بڕیاری دا گەشتەکەی خۆی ببڕێتو شوێن ئەم مەسەلە گرنگە بکەوێتو بە جۆگەکەدا لەسەرخۆ دەڕۆیشت تا بینی هەمو ئاوەکە خۆی کرد بەناو باخێکدا..

ئەمیش خۆی کرد بە باخەکەدا.. دەبینیێ پیاوێکی سیما جوانی نورانی خاکەناسێکی بە دەستەوەیەو ئاوەکە دابەش دەکات بەسەر جۆگە فەرعیەکانی باخەکەیداو ئاوی درەختەکانی پێ دەدێراو بە دەم خۆیەوە زیکری خوای دەکرد.

پیاوە خواناسەکە لێی چوە پێشەوەو سڵاوی لێ کردو ئەویش بە جوانترین شێوە وەڵامی سڵاوەکەی دایەوە..

پاشان فەرموی لێ کرد لە لای بمێنێتەوەو خێرا ڕۆیشت هەندێ میوەی جوانو تازەی لێکردەوەو بۆی هێناو خستیە بەر دەستی.

پیاوەکەش زۆر سوپاسی کردو وتی: دەستت خۆش بێت.. بەڵام من بۆ ئەمە نەهاتوم.. بۆ کارێکی زۆر گرنگتر هاتوم کە خەریکە ژیریم لە دەست دەدەم هەرچی دەکەم تێ ناگەم..

باخەوان: چی بوە خاڵۆ گیان بیڵێ تا بەڵکو بتوانم هاوکاریت بکەم..

پیاوەکەش وتی: تۆ ناوت چیە ئەی بەندەی خوا؟ وتی: ناوم فڵان کەسە، کتو مت ئەو ناوە بو کە لە هەورەکە گوێی بو پیاوەکە کەوت بە چۆکداو زۆر سەرسام بو.. خەریك بو لە هۆش خۆی بچێت بەڵام بە ئاگا هاتەوە.

باخەوانەکەش وتی: ئەی برای باوەڕدارم شتێکت بەسەرهات.. خێرە وا لە ناوەکەم ئەپرسی؟ ناوی منت بۆ چیە؟

پیاوەکەش وتی: ڕاستیو پاکی سەرسامیەکەم تۆیتو ئەبێ تۆ بیرەوێنیتەوەو هاوکاریم بکەیت چونکە من گوێم لەم ناوەی تۆ بو کە بە هەورەکەیان دەوت: بڕۆ باخی فڵان کەس ئاو بدە..

باخەوان: ناوی من؟ زۆر سەیرە شتی وا بوە؟

پیاوەکە: بەڵێ برای بەڕێزم بە گوێی خۆم گوێم لێ بو بەڵام توخوا پێم بڵێ تۆ چی دەکەیت بەم باخەت وا خوا ئاوا فەرمان بە هەورەکان دەکات باخەکەت ئاو بدەن لەم ساڵە بێ ئاوی‌و وشکەساڵیەدا؟

باخەوان: کە مادەم ئەمەت وت.. هیچ چارم نیە بۆت باس دەکەم هەرچەندە حەزم نەکردوە کەس بزانێت بەم کارەم.

پیاوەکە: بێ خەم بە قاڵت نازڕێنم‌و بۆت دەپۆشم مەگەر خۆت پێت خۆش بێت.

باخەوانەکە: وەڵڵاهی شك نابەم کردەوەیە وام هەبێت کە شایەنی ئەوە بم بەڵام بەینی خۆم‌و خوا ئەم باخەم کردوە بە سێ بەشەوە، یەك بەشی دەکەم بە خێرو بەسەر هەژاراندا دابەشی دەکەم‌و بەشی دوەمم داناوە بۆ بژێوی ژیانی خۆم‌و ماڵ‌و منداڵم‌و بەشێکیشم داناوە بۆ باخەکەو لە خۆیدا خەرجی دەکەم.. ئیتر لەمە زیاتر شك نابەم کارێکی وام هەبێت کە شایانی ئەوە بم هەور بێت‌و بە تایبەت‌و تەنها باخەکەی من ئاو بدات..

پیاوەکە: دەستی کردە ملی‌و تێر ماچی کردو پێی وت ئافەرین وا بەشی خوات لێ جیا کردۆتەوەو خوایش لەبەر بەشەکەی خۆیشی بوە دەست لە باخەکەت هەڵناگرێت‌و بەرەکەتی تێ دەخات‌و هەوری تایبەتیشی بۆ مسۆگەر دەکات تا نمامەکانت تینویان نەبێت‌و وشك نەبن‌و بێ بەر نەبن.

دەی خوا حافیز.. خوات لەگەڵ برای هاوئاوینم بەس تکایەکم هەیە لێت، ئەمەم بۆ بپۆشەو باسی مەکە.

کابرایش: بە چاوان ناوت نابەم.

## پەندو ئامۆژگاریەکانی ئەم چیرۆکە

١ـ مرۆڤ کاتێك ڕوداوێك دەبینێت یان دەبیستێتو دەزانێت لە زانینەکەیدا سودی بەرزبونەوەی ئاستی باوەڕەکەی تێدایە،.. خێرا بەدواداچونی بۆ بکاتو ڕاستیو دروستی ئەو ڕوداوە یان ئەو دیمەنەی بۆ دەر بکەوێت.

نابینی ئەو پیاوە خواناسە بۆ کاری خۆی دەڕۆیشت بەڵام هەر کە ئەو دەنگەی بیست وازی لە کارەکەی هێناو بە دوای پەڵە هەورەکەدا ڕۆیشتو پاشان خۆی کرد بە باخەکەداو ڕاستی موعجیزەکەی بۆ دەرکەوت.

٢ـ ئەگەر ئەتەوێت باخەکەت لە لایەن خواوە پارێزراو بێتو ئۆتۆمبێلەکەت لە کارەساتو پێکادان بە دور بێت با بەشی خوای لێ جیا بکەیتەوەو خەڵکی داماو پیرو پەککەوتەی قەراغ جادەکان هەڵگرێتو ئەوە دەبێتە زکاتەکەی.. چونکە تۆ هەر کەس بکەیتە شەریك لەگەڵ خۆتدا هەوڵ دەدات بیپارێزێت بۆت.

نابینی ئەو باخەوانە یەك لە سێی دانابو بۆ فەقیرو هەژاران.

٣ـ دەنگ لە فلان هەورەوە بێتو فەرمانی پێدان کە بچێ بۆ فلان باخو ئاوی بدات، ئەمە موعجیزەی خواییەو لە هەمو سەردەمەداندا ڕویان داوەو ڕودەدەن.. بۆ ئەوەیە کە باوەڕداران بێنەوە هۆشو باوەڕەکەیان نوێ بکەنەوەو گورو تینیان تێ بکەوێتەوەو گومانیان لە ڕاستیو دروستیو ناوازەیی پەیامەکەیاندا نەبێت.

٤ـ خوای گەورە بیەوێت ناوی کەسێك بەرز بکاتەوە ئاوا بەرزی ئەکاتەوەو نابێ کەس خۆی بە خواناسو صالحو وەلی ناو بەرێت بەڵکو خۆی بە بچوكو سادە بزانێتو ناودەرکردنی خۆ بداتە دەستی خواو ئەو لەناو هەورو ئاسمانەکانەوە ناوت دەباتو خەڵکت لێ حاڵی دەکات کە خۆشیان بوێت.

٥ـ هەندێ کەرامەت هەیە لە مرۆڤی موسڵمانەوە دەردەکەوێتو خەڵکی پێی دەزانن بەڵام خۆی هەستی پێ ناکات یان ئەگەر هەستی پێ بکات هەرگیز لای کەس باسی ناکاتو خۆی پێ هەڵنانێت..

ئەگەر کەشفیش بو پێی ناخۆشەو حەز ناکات، نابینی ئەو باخەوانە کەرامەتدارە چۆن وتی: کە مادەم وای لێهاتو تۆ پێت زانیم قەیناکات هۆکارەکەیت بۆ باس دەکەم.

٦ـ دەبێت ئاگاداری ئەوە بین کە کەرامەتو شحوذە بەوەدا لە یەکتر جیادەکرێنەوە (شحوذە) لە کەسێکەوە دەردەکەوێت پیاو صالحو بۆ خوا گونجاو نیەو خۆیشی پێوە هەڵئەنێو باسی ئەکات بۆ نمونە ئەگەر دوعای گیرابێت ئەڵێ بە خەڵکی دوعایەکت بۆ نەنوسم! یان بە یەکێك رقی لێی بێت دەڵێت: دوعایەکت لێ دەکەم!! یان ئەگەر باسی کەرامەت کرد لە لایداو پێی خۆش بو وە وتی: بەڵێ بەڵێ ئەی چۆن چەند ساڵە من کەرامەتم هەیەو شتی لەمە گەورەتریش ئەگەم سوپاس بۆ خوا!!.

٧ـ مرۆڤی موسڵمان ئەگەر لە سەروەتو سامانەکەی خێری کردو زەکاتی لێ دەرکرد ئەوە ئەو بەشانەشی کە بۆ خۆیو ماڵوم منداڵی سەرف دەکات یان لە باخەکە یان لە ئۆتۆمبیلو پرۆژەکەدا خەرجی دەکات هەموی یەکپارچە دەبێتە خێرو چاکە.

٨ـ نابێت موسڵمان هەمو شتەکان بە پێوەری مادی هەڵسەنگێنێتو ئەگەر شتێکی سەیر لە موسڵمانێکەوە روبدات، خێرا بڵێ ئەسڵی نیە.. دۆریە (بە کۆمپیوتەر دۆبلاژو مۆنتاژ کراوە، چونکە ئەوە کاری گەرمی دنیای مادیەتە) بەسەر عەقڵیەتی موسڵمانانەوە پەنا بە خوا.

## القصة الثالثة عشر

## يا ناس هرب الملك

عن عبدالله بن مسعود (رضي الله عنه) عن النبي (ﷺ) قال: أن بني إسرائيل استخلفوا خليفة عليهم بعد موسى (عليه السلام).

فقام يصلي ليلة فوق بيت المقدس في القمر، فذكر أموراً كان صنعها، فتدلى بسبب، فأصبح السبب معلقاً في المسجد وقد ذهب.

قال: فانطلق حتى أتى قوماً على شط البحر فوجدهم يضربون لبناً -أو يصنعون لبناً- فسألهم: كيف تأخذون على هذا اللبن؟.

قال: فأخبروه، فلبن معهم، فكان يأكل من عمل يده.

فإذا كان حين الصلاة قام يصلي، فرفع ذلك العمال إلى دهقانهم: أن فينا رجلاً يفعل كذا وكذا، فأرسل إليه، فأبى أن يأتيه -ثلاث مرات- ثم إنه جاء يسير على دابته.

فلما رآه فرَّ، فاتبعه فسبقه فقال: انتظرني أكلمك، قال: فقام حتى كلمه فأخبره خبره، فلما أخبره أنه كان ملكاً وأنه فر من رهبة ربه، قال: إني أظنني لاحق بك. قال: فاتبعه فعبدا الله حتى ماتا برميلة مصر.

قال عبدالله بن مسعود (رضي الله عنه): ((لو أني كنت هناك ثمَّ لاهتديت إلى قبريهما بصفة رسول الله (ﷺ) التي وصف لنا)).[1]

واتە: عبدالله‌ی کوڕی مەسعود (ڕەزای خوای لێ بێت) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرمووی: (بەنی ئیسرائیل) لە دوای لە دنیا دەرچوونی موسا پێغەمبەریان (سەلامی خوای لێ بێت) لەناو خۆیاندا کەسێکیان کرد بە جێنشینی ئەو (بو بە پاشایان).

شەوێك لەسەر بانی (أقصی) نوێژی ئەکردو لە شەوێکی مانگە شەودا خەریکی شەونوێژ بو.. بیری لە کردەوەکانی پێشوی خۆی ئەکردەوە هاتە خوارەوەو لە مزگەوتەکەدا گوریسێکی هەڵواسیو دەستی پێوە دەگرت لە نوێژدا..

---

١ الحديث حسن اخرجه البزار واحمد والطبراني وغيرهم، وحسنه الهيثمي في (المجمع)، (٢١٩/١٠) والالباني في (صحيحه)، (١٨٢٢). لە کتێبی (صحیح قصص الرسول) (٢٣٨/٣) وەرم گرتوە.

لە نیوەشەودا گوریسەکەی بە هەڵواسراوی بەجێ هێشتو ڕای کردو هەڵهات.

لە کەناری دەریا کۆمەڵێك کەسی بینی خشتی قوڕیان دروست دەکرد، لێی پرسین ئایا کرێکارتان دەوێ‌و ئایا چەندی پێ ئەدەن؟

ئەوانیش وەریان گرتو پارەکەیان پێ وتو لەگەڵ ئەواندا دەستی کرد بە خشت بڕینو پارەی ئارەقی ناوچەوانی خۆی دەخوارد.. هەر کە وەختی نوێژ هات، دەستی لە کارەکەی هەڵگرتو چو دەستی کرد بە نوێژکردن..

کرێکارەکان هەواڵی ئەو کرێکارە غەریبەو نوێژکردنەکەیان گەیاندە پاشاکەیان، کە وتیان پیاوێك لەناوماندایە ئاواو ئاوا دەکات.. پاشا خێرا ناردی بە دوایداو ئەو هەر وتی ناچم..

تا سێ جار ناردی بە شوێنیداو ئەو هەر ئەیوت ناڕۆم، ناچار پاشا خۆی بە سواری وڵاخەکەی ڕۆیشت بۆ لای.

پیاوەکە کاتێك پاشاو داروودەستەکانی بینی.. هەڵهات، پاشایش دابەزی بڕوات بۆ لای، ئەو ڕای کردو پاشایش کەوتە دوای هەرچی کرد نەیتوانی بیگرێتەوە ناچار لە دواوە بانگی کردو وتی:

ڕاوەستە قسەت لەگەڵدا دەکەم، ئەویش وەستا تا قسەی لەگەڵدا بکات.. قسەیان پێکەوە کردو حاڵو مەسەلەی پاشاییو ڕاکردنی خۆی بۆ باس کرد..

کاتێك پێی وت من پاشا بومو لە خۆفو ترسی پەروەردگارم پاشایەتیم بەجێ هێشتو ڕام کرد.. پاشا وتی: منیش گومانم وایە ئەبم بە هاوڕێتو دەڵێ: ئەویش لەگەڵ ئەودا هەڵهاتو پێکەوە خواناسیان دەکرد تا لە ڕومەیلەی میسر کۆچی دواییان کرد.

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (خوای لێ ڕازی بێت) لە دوای ئەم فەرمودەیە دەفەرموێت: ئێستا من لە میسر بومایە جێگا گۆڕەکەیم پێ پیشان دەدان بە پێی ئەو وەسفکردنە وردەی پێغەمبەری خوا.

# چیرۆکی سیانزەیەم

## خەڵكینە پاشا هەڵات

زاناو ژیرمەنـدانو سیاسـەتمەدارانی بـەنی ئیـسرائیل لـە دوای لـە دنیـا دەرچـونی پێغەمبەری ئازیزیان موسا (سەلامی خوای لێ بێت) کەسێکی ژیـرو خواناسـیان هەڵبـژاردو کردیان بە جێنشینی موسا.

پاشـای خوانـاس بـە ڕۆژ خـەریکی جێبـەجێکردنی کاروبـاری وڵات بـو.. بـە شـەویش خەریکی خواناسیو شەونوێژ بو..

شەوێکی مانگەشەو کات زۆر درەنگ بو.. هەمو خەڵکی لە خڕی خەو دابون..

بەڵام پاشای خوانـاس بـەرماڵێکی داخـستبو لەسـەر بـانی (بیـت المقـدس)و چـو بـەناو قوڵایی گوڵزاری شەونوێژو لە نوێژەکەی بویەوە.

بیرێکی لە کردەوەکانی پێشوی کردەوەو هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێـشاو لەگـەڵ خۆیـدا دەستی کرد بە قسەکردنو بە دەم خۆیەوە دەیوت:

ئەی پەروەردگارم.. لە کانگـای دڵمـەوە خۆشـم ئـەوێی.. بـەڵام هەرچـی سـەیر ئەکـەم کردەوەیەکی وام نیە تۆی پێ ڕازی بکەم ئەی نوری چاوم..

کردەوە چاکەکانم ترسم هەیە ڕیاو ڕوپامایی تێکەڵ بوبێتو تـۆ قبوڵـت نـەکردبن لـێم.. ئیتر با ئەو هەموە گوناهەش بوەستێت کە بێ شەرمانە لەبەر چاوی تۆ کردومە..

هەرچەندە تەوبەم لێ کردون.. بەڵام زۆر ئەترسم شایانی لێخۆشبونت نـەبم ئـەی خوایـە گیان..

خوایە تۆ ئەزانی من بە بۆنەی ئەم ئەرکە قورسـەی جێنـشینی پێغەمبەرەکەتـەوە وەك پێویست نەمتوانیوە بتپەرستمو بەندایەتیت بکەم..

ئەمەی وتو دابەزیو چوە مزگەوتەکەو گورسێکی هەڵواسیو هـەر کـە مانـدو دەبـو لـە نوێژدا دەستی پێوە دەگرتو لە پاش تێپەڕبونی نیوەی شەو بە خۆی وت:

من ئەم پۆستەم بەجێ دێڵم‌و ئەڕۆم بۆ جێگایەك كەس نەمناسێت‌و بە ئارەزوی خۆم‌و هەمو كاتەكانم تەرخان ئەكەم بۆ خواناسی‌و بەندایەتی..

بۆ مەسەلەی جێگاكەشم سوپاس بۆ خوا چەندان كەسی لە من باشترو ژێرتر لەناو بەنی ئیسرائیلدا هەیەو یەكیان ناكەوێت لەسەر من..

ئەمەی وت‌و تێشەبەرەیەكی ئامادە كردو هەندێ نان‌و خورماو ئاوی لەگەڵ خۆی بردو ڕوی كردە بیابانی كاكی بە كاكی..

ماوەی چەند ڕۆژێك لەم شار بۆ ئەو شارو لەم دێ بۆ ئەو دێ لە ڕۆیشتندا بو لە ئاكامدا هیچ شوێنێكی بە دڵ نەبو كە هێمن‌و ساكن‌و ئارام بێت‌و كەش‌و هەوای خواناسی لەخۆ بگرێت..

بۆیە ڕێگای دەریای سوری گرتەبەرو كاتێ ڕۆشتە ئەو بەرەوە بینی كۆمەڵێ كرێكاری زۆر خەریكن خشتی سور دەبڕن‌و دیار بو بۆ دروستكردنی كۆشكی پاشایان ئامادە دەكرد..

لێیان نزیك بویەوەو سڵاوی لێ كردن‌و ئەوانیش بە جوانترین شێوە وەڵامیان دایەوەو فەرمویان لێ كردو لە لایاندا دانیشت..

كرێكارێك: ئەڵێی غەریبی براكەم‌و خەڵكی ئەم ناوچەیە نیت؟

پیاوچاك: بەڵێ لە فەلەستینەوە هاتوم‌و لە شاری قدسی پیرۆزەوە..

كرێكار: خوای گەورە بە فەڕو پیرۆزتری بكات.. لە شارێكی پڕ خێرو موبارەكەوە هاتوی.. شاری پێغەمبەری خوا موسا (سەلامی خوای لێ بێت).

پیاوچاك: بۆ ئێوەش بڕوادارن؟

كرێكار: خوا لێمان قبوڵ بكات هەمو شوێنكەوتوی موسا پێغەمبەرین‌و لەوەوە ڕێنماییمان بۆ دێت‌و پاشاكەشمان زۆر پیاوێكی دادپەروەرو خواناسە، لەوانەیە بتبینێت زۆر دڵخۆش بێت، برای بەڕێزم..

پیاوچاك: نا نا.. پێی مەڵێن.. نامەوێ بمبینێت.. من لە كوێو پلەوپایەی پاشا لە كوێ؟ من ئەگەر ئێوە قبوڵتان بێت.. حەزم لە ئیشو كرێكاریە لەگەڵ ئێوەو ئایا ڕۆژانە چەند دەدەن بە كرێكار؟

كرێكار: بە خۆشحاڵیەوە هەرچەندە سیمات لە كرێكار ناكات.. حەز دەكەین كارمان لەگەڵدا بكەیت چونكە كارەكەمان زۆر قورسەو دەبێت خشتی زۆر ببڕین چونكە بە نیازین كۆشكێك بۆ گەورەو پاشامان دروست بكەین ان شاء الله..

كرێكارێك: ڕۆژی دو سكەی ئاڵتونت پێ دەدەین..

كرێكارێكی تر: لەبەر ئەوەی غەریبیو خەڵكی ئێرە نیت.. من لە ماڵی خۆم ژورێكی چۆڵم هەیەو كارم پێی نیە.. ئەگەر پێت خۆشە لە خزمەتت دایە، چی دەڵێی؟

پیاوچاك: زۆر زۆر مەمنونتانم، خوا وێنەتان زۆر بكات.. بەڵام ئەگەر ڕێگەم بدەن من بەردەوام هەمو ڕۆژێك كار ناكەم.. بەڵكو من تەنهامو هەر خۆمم پارەیەكی وام پێویست نیە.. لەبەر ئەوە هەر كاتێك ویستم كار دەكەمو خشت دەبڕم لەگەڵتاندا..

كرێكارەكانیش وتیان زۆر باشە با بە حەزی خۆت بێت برای ئازیزمان.

پیاوچاكەكە دەیویست كەس بە هەواڵی نەزانێت.. بۆیە زۆر بە دزیەوە خواناسیو شەونوێژی دەكرد..

بەڵام جارێك كاری خشت بڕین درێژەی كێشاو كاتی نوێژێك هاتە پێشەوەو خێرا داوای ڕوخسەتی لە هاوڕێكانی كردو چو دەستی كرد بە نوێژكردن.

لەناو نوێژەكەدا چاوەكانی پڕ بون لە ئاو دەگریاو لەگەڵ خوای خۆیدا موناجاتی دەكرد..

كاتێك لای كردەوە دەبینێت هەمو كارێكارەكان ڕیز بونو سەیری دەكەن.. سەری ڕیزیان بۆ ئەلەقاند..

كە زانی پێیان زانیوە یەكسەر بەرماڵەكەی كۆكردەوەو بە پەلە بەرەو كارەكەی ڕۆشتەوە.. بەڵام كرێكارێك هاتە ڕێگەیو وتی: ئەی برای خواناسو موسڵمانم پاشا ئەگەر بەم حاڵەت بزانێ زۆر سەرسام و ڕوخۆش دەبێت.

پیاوچاك: نا نا، تكاتان لێ دەكەم كەس پێی نەڵێت.. من حەز ناكەم بمناسێت.

كرێكارەكان دەستیان كرد بە پێكەنین‌و بڵاوەیان لێكرد..

كرێكارەكان خێرا خۆیان گەیاندە پاشایان‌و هەواڵی پیاوە غەریبەكەیان بە وردی بۆ باس كردو ئەویش وەك گوڵ گەش بویەوەو هاواری كرد بۆچی وەستاون بڕۆن بۆم بانگ بكەن.. زوكەن بیهێنن.. خێراكەن.

كرێكار: بە چاوان گەورەم.

دو پاسەوان‌و كرێكارەكە هاتن‌و داوایان لە پیاوچاكەكە كرد كە بڕوات بۆ لای پاشا چونكە پاشا داوای بینینی دەكات.. بەڵام ئەو وتی داوای لێبوردنی لێ بكەن.. من كرێكارێكی سادەی خشت بڕینم‌و شایانی ئەوە نیم پاشا بنێرێت بە دوامدا..

كرێكارەكەو دو پاسەوانەكە تا سێ جار هاتنەوە بۆ لای پاشاو ئەو هەر دەیوت بۆ بێنن دەمەوێ چاوم پێی بكەوێت!.

بەڵام پاشای هەڵاتو هەر بیانوی دەهێنایەوەو دەیوت داوای لێبوردن دەكەم ناتوانم..

كاتێك پاشا زانی ئەم پیاوە غەریبە ئەوەندە بەڕێزو قورسەو نایەت بۆ لای پاشا.. ئەوەندەی تر خۆشەویست بو لە لای‌و وتی:

دە قەیدی نیە خۆمان دەچین بۆ لای!

وەزیر: گەورەم ئەوە بە ڕاستتە.. تۆ بەم دەسەڵاتو گەورەییەوە دەڕۆیت بۆ لای كرێكارێكی خشت بڕین؟!.

پاشا: بەڵێ ئەڕۆم، ڕێزو پلەوپایە بە جلوبەرگو پۆست نییە بەڵكو بە خواناسی‌و بەندایەتیە بۆ خوای پەروەردگار.. یەڵڵا هەڵسن با بچین بۆ لای..

وەزیرو گزیری خستە دوای خۆی چون بۆ كەناری دەریاو هەر كە گەیشتنە ئەوێ هەمو كرێكارەكان بە ڕاكردن‌و هەناسەبڕكێ چون بە دەم پاشاوە و سڵاویان لێ كردو لە حزوریدا ڕیز بون..

پاشا چاوی گێڕا بە ناویاندا بەڵام کەسی نامۆی نەکەوتە بەرچاو! بۆیە وتی: کوا ئەو کرێکارەی تازە هاتۆتە ناوتانەوە؟

کرێکارەکان سەرێکی خۆیانیان کردو پیاوەکەیان نەدی. وتیان: پاشا نازانین مەسەلە چیە؟ وتمان پاشا تەشریف دێنێت هیچ خۆشحاڵ نەبو بگرە دەمو چاوی تێك چو.. ئەوەتا ئەها لە بنی ئەو دارەدا دانیشتوە..

پاشا ئاماژەی کرد بۆ خەڵکەکە کە نەجوڵێن.. کەسیش لەگەڵم نەیەت من خۆم بۆ لای دەچم..

لە ئەسپەکەی دابەزیو کەوتەڕێ بەرەو لای پیاوچاکەکەو هەر کە نزیکی بویەوەو پێی زانی هەستاو ڕای کردو پاشایش بە دوایدا ڕای کرد بەڵام هەرچی کردو کۆشا نەیتوانی بیگرێتەوە بۆیە لە دواوە بە ئەسپایی بانگی کردو پێی وت: مەڕۆ ڕامەکە پێم خۆشە لەگەڵت دابنیشمو پێکەوە قسە بکەین..

پیاوچاکەکە کاتێك ئەو قسە شیرینەی لە پاشا بیست لە شوێنی خۆی وەستاو پاشا لێی نزیك بویەوەو سڵاوی لێ کردو ئەویش سڵاوەکەی وەڵام دایەوە..

دەستی کردە ملیو تێر ماچی کردو بە یەکەوە بەرەو سێبەری دارەکە ڕۆیشتنو دەستیان کرد بە گفتوگۆ..

پاشا: بۆ ناردم بە دواتدا نەهاتی؟

پیاوچاك: ئاخر گەورەم من کەی شایستەی دیوەخانی ئێوەم من بەندەیەکی خوای گەورەمو هێشتا ڕوی دیوەخانی پەروەردگاریشم نییە..

پاشا: دڵی پڕبو.. ئاو بە چاوەکانیدا هاتە خوارەوە..

پیاوچاك:گەورەم مەگری.. پاشایەتی کارێکی زۆر قورسو گرانە.. ئەگەر مافی خۆی پێ نەدەیت خوا لێت ئەڕەنجێتو دواڕۆژت خەشمو قینی پەروەردگارە..

پاشا: زۆر ڕاستە.. من زۆرم پێویستە بەم قسانە.. تکات لێ ئەکەم بۆم باس بکە تۆ لە کرێکارو هەژار ناچیتو من زۆر سەرناسم.. پێم بڵێ تۆ کێی؟

پیاوچاك: من پاشای بیت المقدس بوم‌و جێگری موسا پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت).

هەر کە ئەوەی وت پاشا پەلاماری دەستی داو دەستەکانی ماچ کردو چاوی پڕبون لە ئاو وتی:

چاك کاری پاشایەتی لە خزمەتکردنی بەرنامەکەی خواو ژیان لە خزمەت موسا پێغەمبەر کردم تا کۆچی دوایی کرد (سەلامی خوای لەسەر بێت).

پاشا: دەی پێم بڵێ گەورەم تۆ بۆچی وات بەسەر هاتوە. خۆ لایان نەبردویت؟

پیاوچاك: پێکەنینێکی کردو وتی: خۆزگە لایان بردمایە.. بەڵام من لە تاریکایی شەوداو لە ترسی خوای پەروەردگارو سزای سەختی دۆزەخ‌و گوناهەکانم.. پاشایەتم واز لێ هێناو ڕام کردو وڵاتم بەجێ هێشت تا بتوانم ئەو تۆزەی تەمەنم ماوە لە پێناو بەندایەتی‌و خواناسیدا بەسەری بەرم.

پاشا: بیری کردەوەو وتی: هەرچی سەیر ئەکەم منیش دەبمە هاوڕێت‌و پێکەوە با لێرەش هەڵ بێین..

دو ئەسپی هێناو سواری بون‌و بە جێگرەکەی وت تۆ لە جێی من پاشا بە تا دەگەڕێمەوەو ئەوەی وت‌و بۆ دواجار نەگەڕانەوە چون بۆ میسرو لەوێ ماوەیەکی زۆر پێکەوە خواناسیان دەکرد تا لە ئاکامدا لە ناوچەی ڕۆمەیلەی میسر گیانی پاکیان بە خوای خۆیان سپارد.. سڵاوی خوا بڕژێت بەسەر گیانی هەردوکیاندا.

## پەندو ئامۆژگاریەکانی ئەم چیرۆکە

١ـ ئەبێ مرۆڤ لە هەر پلەوپایەو کارێکدا هەبو هەوڵو بدات ئیشو کار بەسەر چواردەورەکەیداو ڕایان بهێنێت بۆ دوای خۆی بۆشایی دروست نەبێتو خێرا کەسێکی شیاو هەبێت بخرێتە جێگاکەی.

ئەوەتا موسا (سەلامی خوای لێ بێت) حەواریەکانی وا پەروەردە کردبو کە دوای خۆی زاناو خواناسیان تێدا هەڵکەوتو خەلیفەکەی لە خواترسو زاناش بو.

٢ـ پەروەردەی ئەخلاقیو ئیمانی زۆر ئەساسە لە ئامادەکردنی سەرکردایەتی خەلفی بۆ دانانیان لە جێی سەرکردە کۆچ کردوەکان، تەنها کاری ئیداریو سیاسی مەرج نیەو ئەمەش هەندێ لە لایەنی ئیسلامیەکانی بردوە بە هەڵەداو کۆمەڵێك کەس بەرزکراونەتەوە بۆ سەرکردایەتی کە نوێژی بە کۆمەڵو ڕۆژوی سوننەت نازانن چیە ! !

٣ـ دەبێت کەسانی سەرکردە زۆر لە خەڵکی تر پابەند بن بە خواناسیو بەندایەتیەوەو ئاساری شەونوێژو ڕۆژویان بە ئاشکرا پێوە دیار بێت چونکە ئەوان سەرمەشقن بۆ کەسانی خوار خۆیان.

٤ـ هەندێ سەرکردە هەبون پەنا بە خوا لە ترسی گیانی خۆی نەچوە بۆ مزگەتو بەشداری جمعەو جەماعەتی موسڵمانانی نەدەکرد.. کاتێك لێیان دەپرسی بۆچی دیار نیت لە ڕیزی نوێژی کۆمەڵ.. دەیوت من بەرپرسمو لە خۆم ئەترسم لە نوێژێکی بەیانیدا یەکێك بمکوژێت ! !

بەڵام هەست بەوە ناکات کە بەم کارەی ڕۆحو گیانی خۆی کوشتوەو دەی سەلامەتی جەستەیەکی بێ گیان لە بەندایەتیو خواناسی چ سودێکی هەیە.

٥ـ زۆر گرنگە بۆ سەرکردەکان بە تایبەتی، کە دابنیشنو بیر لە کردەوە خراپەکانیان بکەنەوەو هەوڵ بدەن نەیانکەنو بیر لە کردەوە جوانەکانیان بکەنەوەو لەوە بترسن وەرنەگیرابێتو خۆیانی پێوە گیف نەکەنەوەو هەوڵ بدەن زیاتری بکەن.

٦ـ لە هەمو جیهاندا تەنها باوەڕ بە خواو هەڵگرانی پەیامەکەی خوا ئەتوانن بە سوك سەیری پۆستی سەرکردایەتی بکەن‌و هەر کاتێك لایان بردن زۆر ئاساییە لە لایان‌و هستریا نایانگرێت یان لەوەش زیاتر خۆی لە بەرپرسیارێتی ڕائەکا!..

بە پێچەوانەی سەرکردەکانی ئەمڕۆ (بە ئیسلامیەکانیشەوە)!! شەڕی لەسەر دەکەن‌و دەنگی بۆ دەکڕن‌و کۆی دەکەنەوەو ئەگەر لە کۆنگرەدا دەرنەچێتەوە لەوانەی بە یەکجاری واز لە کارەکە بهێنی‌و بڕواتەوە ماڵەوە.

٧ـ سەرکردەی خواناس (لە پلەوپایەو کورسی) خۆی لادەدات‌و ڕادەکات بە تایبەت ئەگەر بزانێت کەسانی وەك ئەو زۆرن یان لە ئەویش باشتر هەن..

وەك پاشا بیری لەوە نەکردەوە کە وڵات بێ پاشا دەمێنێتەوە چونکە دەیزانی موسا پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) دەیانی تری وەك ئەوی گۆش کردبو بۆ سەرکردایەتی کردن‌و پاشایەتی.

٨ـ مرۆڤی موسڵمان لە هەرجێیەك بێت حەز دەکات بە ئارەقی ناوچەوانی خۆی پارە پەیدا بکات‌و حەزی بەوە نیە دەست لە کەس پان بکاتەوەو بە تەمای مەعاشی بەلاش بێت..

٩ـ نابێت پلەوپایەو پۆست وا بکات لە مرۆڤ کە عەیبی لێ بێت دەست بدات کارو کاسپی‌و ئیش‌و کارو بڵێ من کاتی خۆی سەرکردە بوم ئێستا چۆن کرێکاری ئەکەم!!..

١٠ـ مرۆڤی خواناس‌و دڵسۆز هەوڵ دەدات بە دزیەوەو بە پەنهانی لەگەڵ خوادا بێت‌و بەندایەتی بۆ بکات‌و دور بێت لە ڕیاو ڕوپامایی.. بەڵام ئەگەر ناچار بو بزانن ئەوە قەیناکا چونکە لە مەسەلەی سەرمەشقیدا چاوی لێ دەکەن‌و ئەوانیش باش دەبن.

١١ـ نابێت هیچ جۆرە کارو کاسپیەك ببێتە ڕێگر لەبەر دەم کردنی نوێژەکان لە کات‌و شوێنی خۆیاندا، نەك وەك هەندێ کەس لە فەرمانگەکەی نوێژ دەڵێت بوارم نیە؟!! یان لەوانەیە بترسێت‌و بڵێت پێم ئەزانن‌و بە توندڕەو ئیتر هایی‌و هتد، ڕیزبەندم دەکەن‌و دەمگرن!!

نەخێر بەڵکو دەبێت بەرماڵ یان مەقەبایەکی خاوێنی هەبێتو هەر لەوێ نوێژەکەی بکات ﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتۡ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ كِتَٰبٗا مَّوۡقُوتٗا﴾.

١٢ـ نوری باوەڕ ناشارێتەوە خاوەن پەیامی ڕاستەقینە حەز دەکات خەڵکی پەیامە دروستەکەی ببینن‌و بزانن چ گەوهەرێکی پێیە.. بەڵێ لەوانەیە لە زەمەنێکدا پێویست بکات بە نهێنی کارەکانی بهێڵێتەوە.. بەڵام هەرگیز نابێت تا سەر بە شاراوەیی بیهێڵێتەوە..

نابینی پاشای هەڵاتومان باسی هیچی نەکردو خۆی بە کاریگەرێکی بێ کەسی هەژار دایە قەڵەم بەڵام دوایی کە مەسەلەی نوێژو خواناسیەکەی دەرکەوت پاشان بۆ پاشای باس کرد کە حیکمەت چیە لە دورکەوتنەوەی لە کورسیو خۆ بەدورگرتن لێی..

١٣ـ یەکێك لە سودەکانی پێشکەش کردن‌و نمایش کردنی بۆچون‌و بیروباوەڕە دروستەکەت ئەوەیە دەچێتە دڵی خەڵکیەوەو ئەوانیش هەمان قەناعەتی تۆیان بۆ دروست دەبێت‌و تۆ بە تاکی ناهێڵنەوەو دەورت قەرەباڵغ دەکەن..

نابینی ئەو پیاوچاکە بەو نوێژەی لە کاتی خۆیدا کردی سەرنجی دەوروبەری بۆ لای بیروباوەڕەکەی خۆی ڕاکێشاو پاشایەکی خستە سەری.

١٤ـ مرۆڤ تا بۆی بکرێت لە ژیاندا هیچ هەنگاوی بە تاکڕەوی‌و بێ مشاوەرەی خەڵکی زیرەك‌و زانا ژیان نەباتە سەر، چونکە شەیتان لە یەك کەسەوە نزیکترە تا دو کەس..

نابینی پاشامان چۆن ڕازی بو کە کەسێکی لەگەڵدا بێت هەمان تێڕوانین‌و بۆچونی هەبێت‌و لە ژیاندا هاوکارو پارێزەری بێت..

## القصة الرابع عشرة
## لقطة من الجهاد

عن عبدالله بن مسعود (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ): ((عجب ربُنا –تبارك وتعالى– من رجلٍ غزا في سبيل الله فانهزم –يعني أصحابه– فعلم ما عليه، فرجع حتَّى أهريق دمه، فيقول الله –عز وجل– لملائكته:

(انظروا إلى عبدي رجع رغبةً فيما عندي، وشفقةً ممَّا عندي حتى أهريق دمه).[١]

واتە: عبدالله ی کوڕی مەسعود (خوای لێ ڕازی بێت) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی:

خوای (تەبارەك‌و تەعالا) زۆر سەرسام بوم بە کەسێك کە لە پێناوی خوادا جەنگی دەکرد..

لە گەرمەی جەنگەکەدا هاوڕێکانی توانای بەرەنگاربونەوەیان نەماو ڕایانکردو سەنگەریان چۆڵ کردو ئەویش لەگەڵیان هەڵات.. بەڵام لە نیوەی ڕێگەدا بۆی دەرکەوت کە پێویست بو بەرامبەر دوژمنانی خوا ڕاوەستاو بوایە..

بۆیە بڕیاری دا بگەڕێتەوە ناوجەرگەی شەڕەکەو جەنگا لەگەڵیان تا لە ئاکامدا خوێنی ڕژا (واتە شەهید بو).

خوای (عزّ وجلّ)یش ڕو دەکاتە فریشتەکانی‌و پێیان دەفەرموێت: وەرن بڕوانن بۆ ئەم بەندەیەم چۆن دوای ئەوەی لە جەنگەکە پاشاکشەی کردبو گەڕایەوە ناو جەنگەکەو لەبەر ئەو پاداشتەی منو لە ترسی ئەو سزایەی من دەستی کردەوە بە جەنگ تا خوێنی ڕژا!..

---

١ حسن، رواه أبو داود، سەیری (صحیح الجامع) بکە (٣٩٨١)، لە کتێبی (صحیح قصص الرسول) لاپەڕە (٣/٢٠٠) وەرم گرتوە.

# چیرۆکی چواردەیەم

## لەقتەیەك لە جیهاد

وا گەرمەی شەڕەو سوپای باوەڕ ڕێژەیان زۆر کەمەو تفاقی تەواویشیان پێ نیە.

لە بەرامبەر سوپای بێباوەڕان هێزێکی دڕندەو بێ شمارنو جۆرەها چەکیان لەگەڵ خۆیان هێناوە..

بۆیە لە سەرەتاوە سوپای کوفر تەنگیان هەڵچنی بە موجاهیدەکانو خەریك بو جەنگەکە یەکلایی بکەنەوە..

جەنگاوەرانی بیروباوەڕ زۆر نەبەردانە شەڕیان ئەکر بەڵام زۆر ناڕەحەت بونو تەنگیان پێ هەڵچنراو ناچار زۆرێکیان ڕایان کردو سەنگەرەکانیان چۆڵ کرد...

لەم کاتەدا یەکێك لە موجاهیدەکان بیری لە ترسناکیو گەورەی گوناهی هەڵهاتنو سەنگەر چۆڵ کردن کردەوە.. لە جێی خۆی وەستاو هاواری کرد:

حەیفم بۆ سوپای ئیسلام.. کە ئێمە جەنگاوەرەکانینی.. ئێمەی ترسنۆك..

وەرن.. مەڕۆن.. ڕامەکەن.. ئەوەی لە لای خودایە زۆر باشترو چاکترە لەوەی لەم دنیایە.. وەرن بەهەشت بانگمان دەکات..

بۆچی ڕا دەکەین.. ئەگەر لە مردن دەترسین.. خۆ هەموتان دەزانن کاتی مردن دیاری کراوەو پاشو پێش ناکات..

دەی برایانی جەنگاوەرم وەرنەوە.. با بڕۆینەوە ناو گەرمەی شەڕەکەو ڕیزەکانی سوپای بێباوەڕان تێك بدەین..

لە بیرتان چوە خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێت: هەر کەسێك پشت بکاتە دوژمنانو لە جەنگ هەلبێت غەزەبو لەعنەتی خوای دێتە سەرو سزای سەخت چاوەڕوانی دەکات؟! دەی وەرنەوە...

بە دایکو باوکمەوە بە قوربانتان بم، ئێوە پێشمەرگەکانی بەدرو ئوحودن، خەمتان چییە؟ ئێستا فریشتەکان لە باتی ئێوە دەجەنگن با بڕۆین بۆ هاوکارییان..

توانی کۆمەڵێکی باش بەرەو ناوجەرگـەی جەنگەکـە بەرێتـەوەو جـەنگێکی مەردانـەیان کردو داستانێکی نەبەردانەیان تۆمار کرد..

وەك زەردەواڵە ئالآن لە سوپای بێباوەڕانو بێباوەڕانیان بە جارێ شپرز کرد..

لە ناو جەنگەکەوە هاواری دەکرد: نەکـەن لـە زۆری دوژمنـان بترسـن.. سـەرکەوتن بـە دەستی خوایەو بە کەمو زۆری نییە.. پاشان ئەم ئایەتـەی دەخوێنـد: ﴿كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ﴾..

ئەوەندە سنگی دەناو دەچوە پێشەوە.. تا سەرەنجام شەهیدیان کردو خوێنی ئاڵیـان ڕژاندە سەر زەویەکە..

وێنەی ئەم موجاهیدە گیان لەسەر دەستانەیە.. کە لـە هـەمو سـەردەمێکدا خـوای عز وجل شانازیان پێوە دەکات..

ئەمانەو وێنەی ئەمانەن سەروەری ئەم ئیسلامە ئەپارێزنو سـەرو مـاڵی بـاوەڕداران بـە دور دەگرن لە چەپاوکردن لە لایەن سوپای بێباوەڕانەوە..

بۆیە ئەم موجاهیدە گیان لەسەر دەستەی کە گەڕایەوە ناو جەنگەکەو شەهید بو..

خوای (عز وجل) لەناو هەمو فریشتەکاندا شانازیان پێوە دەکاتو پێیان دەفەرموێت:

ئەی فریشتەکانم وەرن با دیمەنی ئەو موجاهیدەتان پێ نیشان بدەم کە لـە سـەرەتاوە ڕای کردو لە جەنگەکە هەڵات بەڵام دوایی بـیری کـردەوە پەشـیمان بویـەوەو هاتـەوە نـاو جەنگەکەو سەرەنجام خوێنی ڕژاو کوژرا..

ئەزانن لە پێناوی چیدا ئەمەی کرد؟ لە پێناوی ئەو بەهەشتو پاداشتە گەورەیـەی مـن ئامادەم کردوە بۆ ئەو کەسانەی گیانی خۆیان دەکەنە قوربانی بیروباوەڕی ئیسلامەتی.

هەروەها لە ترسی دۆزەخو ئەو سزا سەختانەی من ئامادەم کردوە بۆ ئەو کەسانەی کە لە جەنگ هەڵدێنو پشت لە دوژمن هەڵ دەکەنو دەبنە هۆی شکستی سوپای باوەڕ..

## پەندو ئامۆژگاریەکانی ئەم چیرۆکە

١ـ بە فەرمودەکەدا دیارە کە خوای گەورەو پەروەردگار سەرسامی خۆی رادەگەیەنێتو خۆشحاڵ دەبێت کاتێك موسڵمانێك کارێکی خێرو چاکە ئەنجام دەدات..

ئەبێ چەندێ سەرسام بێ لە گەنجێکی موسڵمان کە میمۆری مۆبایلەکەی پڕیەتی لە قورئانو بە دەنگی زۆرێك قورئان خوێنەکان، لەم سەردەمە دور لە خواییەدا (٥) فەرزە بە کۆمەڵ لە مزگەوت نوێژەکانیان دەخوێنن، یان سەیری کچان ناکەنو سەر کۆڵانەکان ناگرن لێیان..

٢ـ بەخشینی گیان لە پێناوی خوای گەورەدا گەورترین کردەوەی چاکەیەو لەو کارانەیە کە خوای گەورە سەرسامی خۆی دەردەبڕێت بەرامبەری.

٣ـ پاشەکشەکردنو ساردبونەوەو ڕاکردن لە کاری جیهاد یان بانگەوازدا شتێکی ئاساییەو ڕودەداتو لەناو هاوەڵانیشدا ڕوی داوە بەڵام مەرج ئەوەیە لەناو کارەکەدا بیر بکاتەوەو بگەڕێتەوە سەنگەری کارو خەباتی خواناسیو گیان فیدایيو بانگەواز.

٤ـ خوای گەورە زۆر سەرسام دەبێت لەو کەسانەی لە کاتی ئەزمەی کادیرو ئەندامی کاراو سەربازی گیان لەسەر دەستدا. کەسانێك هەڵکەونو نەهێڵن گۆڕەپانەکە چۆڵ بێتو سەرکەوتن ببێتە بەشی ناحەزانی ئیسلامو شوێنکەوتوانی قورئان بە سەرکزیو لاوازی بمێننەوە

٥ـ شتێکی زۆر جوانو سەرکەوتوە لە بواری پەروەردەدا ئەگەر کارێکی چاکەت بە کەسێکەوە بینی لە لای ڕەفیقو برادەرەکانت یان لە لای دراوسێو خزمەکان باسی بکەو شانازی پێوە بکەو بڵێ ئەها من قوباتی ئاوام هەیە، شێرم پەورەردە کردوە شێر..

٦ـ نابێت مرۆڤی پەروەردەکار تەنها بە پاداشت بەکاربهێنێت لە هاندانو کارکردن بە خەڵکی بەڵکو لەگەڵ بەکارهێنانی پاداشتدا دەبێت بە هەمان شێوە سزایشی هەبێت بۆ زیاتر ترساندنیانو لانەدانیان لە کاری چاکەو خێرو پیاوەتی..

# القصة الخامس عشرة
## السَّيدة الماشطة

عن ابن عباس (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ): ((لما كانت الليلة التي أسري بي فيها، وجدت رائحة طيبة، فقلت: ما هذه الرائحة الطيبة يا جبريل؟

قال: هذه رائحة ماشطة بنت فرعون وأولادها.

قلت: ما شأنها؟

قال: بيناً هي تمشط بنت فرعون، إذ سقط المشط من يدها، فقالت: بسم الله، قالت بنت فرعون: أبي ؟ فقالت: لا، ولكن ربي، وربك ورب أبيك الله.

قالت: وإن لك رباً غير أبي؟ قالت: نعم ، قالت: فأعلمه بذلك؟ قالت: نعم، فأعلمته.

فدعا بها فقال: يا فلانة ألك ربٌ غيري؟ قالت: نعم، ربي وربك الله الذي.

فأمر ببقرة من نحاس فأحيمت، ثم أخذ أولادها يلقون فيها واحداً واحداً.

فقالت: إن لي إليك حاجة ، قال: وما هي؟

قالت: أحب أن تجمع عظامي وعظام ولدي في ثوب واحد فتدفنا جميعاً، قال: وذلك لك علينا.

فلم يزل أولادها يلقون في البقرة حتى انتهى إلى ابن لها رضيع، فكأنها تقاعَسَتْ من أجله.

فقال لها: يا أماه اقتحمي، فإن عذاب الدنيا أهون من عذاب الآخرة)).[1]

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەباس (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: ئەو شەوەی شەوڕەویم پێکراو بۆ ئاسمان لەوێ بۆنێکی زۆر خۆشم هەست پێکرد، وتم: ئەی جوبرەئیل ئەم بۆنە خۆشە چییە؟

جبریل: ئەمە بۆنی ئەو ئافرەتەو منداڵەکانیەتی ئارایشتکەری کچی فیرعەون بوە.

پێغەمبەر دەفەرموێت: وتم: مەسەلەی ئەو ئافرەتە چۆن بوە؟

---

١ حديث حسن رواه احمد في المسند (٣٠٩/٣) والبيهقي في (دلائل النبوة (١٢١/٢)، وقال ابن كثير في (التفسير) (٢٦/٣)، إسناده لا بأس ولم يخرجوه

جبریل وتی: لە کاتێکدا کە قژی کچەکەی فیرعەونی دائەهێنا شانەکەی لە دەست کەوتە خوارەوەو وتی: بە ناوی خواوە، کچەکەی فیرعەون وتی: مەبەستت باوکمە؟

وتی: نەخێر، خوای منو خوای تۆو خوای باوکیشت ناوی (الله)یە.

ئەویش وتی: بۆ بێجگە لە باوکم کەسێکی تر بە خوا دەزانی؟

وتی: بەڵێ.. وتی: ئاخر پێی دەڵێم.. وتی: هەر پێی بڵێو ئاگاداری بکە، ئەویش چو ئاگاداری کرد.

فیرعەونیش بانگی کردو پێی وت: ئایا جگە لە من کەسێکی تر بە خوای خۆت دەزانی؟ وتی: بەڵێ، خوای منو خوای تۆیش (الله)یە..

فیرعەون فەرمانی دەرکرد مەنجەڵێکی مسی گەورەیان هێناو تاویان داو گەرمیان کردو پاشان بە بەرچاویەوە منداڵەکانیان هێناو یەك یەك خستیانە ناو ئاوەکوڵ بە کوڵەکەوە..

ئافرەتەکە وتی: یەك داواکاریم لێتان هەیە؟ فیرعەون وتی: چییە؟

وتی: منو منداڵەکانم پێکەوە کفن بکەنو لە یەك گۆڕیشدا بماننێژن..

وتی: باشە ئەوەت بۆ دەکەین.

بەردەوام منداڵەکانیان دەخستە ناو ئاوە گەرمەکەوە تا سەرە گەیشتە منداڵە ساواکەی باوەشیو ئەویش دڵی نەهات.. لەو کاتەدا منداڵەکە وتی بە دایکی:

دایە گیان.. خۆت هەڵدە ناو ئاوەکە چونکە سزای دنیا زۆر سوکە لە چاو سزای ڕۆژی دواییدا.

# چیرۆکی پانزەیەم

## خانمەکەی ئارایشتگاه

کچی فیرعەون بە فیزێکەوە هاواری کرد: کوا قژداهێنەرەکەم؟.. خێرا بۆم بانگ بکەن.. زۆر بە پەلەم.. ئاهەنگم بە دەستەوەیە بانگ کراوم.

خزمەتکار: قوربان خانمی خۆم لەسەرخۆ بە.. ئێستا دەنێرم بە دوایداو دێتەوە خزمەتت.. ئەوە ڕۆیشتەوە شیر بدات بە منداڵە ساواکەی.

کچی فیرعەون: بە گەورەیی باوکم قەسەم ئەم جارە داوای ئەو ژنە بکەمو لێرە نەبێت ئەو کچە ساوایەی ئەدەم بە دەمی سەگەوە.. تێگەیشتن؟ لاچن، ون بن لەبەر چاوم..

پاش کەمێك چاوەڕوانی خانمی ئارایشتکەر دێتە ژورەوەو دەڵێت: گەورەم سڵاو.. دەبێت ببوری کەمێك دواکەوتم..

کچی فیرعەون: نا سڵاو.. تۆ نازانی من بانگهێشت کراوم بۆ ئاهەنگی کچی پاشای شاری (ئیرلی)و زۆر بە پەلەم..

خانم: قوربان.. خانمی گەورەم.. نەمزانی ئاهەنگت بە دەستەوەیە ئەگینا زوتر دەهاتم.

شانەو شتەکانی نزیك کردەوەو قژە درێژە خاوەکەی دادەهێناو بە دەستەکەی تری گوڵاوی لێ دەدا.. لەم کاتەدا شانەکەی لە دەست کەوتە خوارەوە.

دەستی بۆ برد هەڵی بگرێتەوەو وتی: (بسم الله) بە ناوی خوای گەورە..

کچی فیرعەون: مەبەستت ناوی باوکم بو؟ سەرسام بو چونکە باوکی بە (الله) ناوی دەرنەکردبو.

خانم: (زۆر بە باوەڕێکی پتەوو جەرگێکی قایمو چاونەترسیەوەو بەبێ شڵەژانو تێکچونو ترسان وەڵامی دایەوە)و وتی: نەخێر، بەڵکو باوکی تۆی.. گەورەم.. باوکی تۆش مرۆڤێکە وەك هەمو مرۆڤەکانی تر، بەڵکو خوای منو تۆو باوکیشت (الله)یە !

کچی فیرعەون چاوی پەڕیە تەوقی سەریو تا دەستی بگرێت شانەکەی فڕێ داو کەفی ئەچەقاندو وتی: دەستت لابە.. نامەوێ کافرێکی وەك تۆ لەمڕۆ بە دوا قژم دابهێنێت!

خانمی ئارایشتکار: گەورەم بیروباوەڕ شتێکە لەناو دڵدایەو هیچ زیانێك لە باوکتو دەستەڵاتەکەی نادات.. خۆ من جگە لە بچوکی کردنتانو خزمەتکردنتان هیچ زیانێکم نەبوە بۆتان..

کچی فیرعەون: دەم درێژی.. تۆ بەندەی باوکمیو بەندەش ئاساییە خزمەتی خوای خۆی بکات..

کچی فیرعەون: بەڵام لەبەر ئەوەی تۆ لەمەوبەر لە خزمەتماندا بویتو زەمەنێك پێکەوە ژیانمان بەسەر بردوە.. من ئەم مەسەلەیە دەپۆشمو باسی ناکەم بۆ باوکم.. بەڵام تۆش پەشیمان بەرەوەو تەوبە بکە..

خانم: پەشیمان بونەوە لە چی؟ تەوبەکردن لە چی؟ بۆ من چ تاوانێکم کردوە، بۆ ناسینی خوای پەروەردگار تاوانە؟

کچی فیرعەون: بەڵێ بەڵێ تاوانەو سزاکەشی کوشتنە کوشتن..

خانم: مردن لە پێناوی خوادا گەورەترین خەڵاتە بۆ باوەڕداران.. بۆ دادەکەم تۆ وا دەزانی من لە مردن دەترسم؟! نا وانیە.. تۆ زۆر بێ ئاگای لە شیرینیو چێژی باوەڕ..

کچی فیرعەون: قسەکردن.. شیرینیو چێژ! سوپاسی من بکە کە بۆی ناگێڕمەوە..

خانم: هەرگیز سوپاست ناکەم.. بێ منەتیش بەو بۆی بگێڕەرەوە زۆر ئاساییە..

کچی فیرعەون: (هەستاو چو بەرەو کۆشکی باوکی)و لەوێ ڕوخسەتی وەرگرتو چوە ژورەوە.. وتی: سڵاو لە باوکی گەورەمان.. خوای گەلی میسر..

فیرعەون: سڵاو لە کچی نازدارم.. ئەوە خێرە هاتوی بۆ لامان.. ماوەیەکی زۆرە سەردانت نەکردوین.. دیارە شتێك لە ئارادا هەیە.

کچی فیرعەون: شتێکی وا نیە خاوەن شکۆ.. بەڵام حەزم کرد ئەوەت پێ بڵێم کە ئارایشتکەرەکەم باوەڕی بە تاقانە خوایەك هێناوە کە نادیارەو باوەڕی بە خوایەتی تۆ نەماوە..

فیرعەون: بۆ جگە لە من لەم کەونەدا خوایەکی تر هەیە؟

وەزیرەكان: بێگومان نەخێر گەورەو سەردارمان تەنها خۆتی..

فیرعەون: دەی كەواتە: ئەو ئافرەتەم بۆ بهێنن بزانم بۆچی بێباوەڕ بوە لە (سبیل الرشاد) لایداوە..

دەرگەوان: گەورەم ئافرەتەكەمان هێناوە، لەبەر دەرگایە..

فیرعەون: بۆم بێننە ژورەوە.. (ئافرەتە بڕوادارەكە دێننە ژورەوە كە شوێنەواری ئازاردانو ئەشكەنجەی پێوە دیار بو.

خانم: سڵاو لە پاشای شكۆداركامان..

فیرعەون: نا سڵاو.. ڕاستە دەڵێن من بە خوای خۆت نازانیو خوایەكی ترت كردوە بە خوای خۆت؟

خانم: نەخێر گەورەم شتی وام نەكردوە.. من تەنها زاتێك بە خوا دەزانم كە ئەم ئاسمانو زەویەی دروست كردوە.. خوای منو خوای تۆش هەر (الله)یە (الله).

فیرعەون: قسەكردن لەگەڵ تۆدا سودی نیە.. بڕۆن مەنجەڵێكەی گەورەی مس تاو بدەنو خۆیو هەمو منداڵەكانی تیا بكوڵێنن تا ببێتە پەندی زەمانە...

خانم: گەورەم خۆم بكوژن بەڵام منداڵەكانم چ تاوانێكیان هەیە؟ بۆ دەیانكوژی؟

فیرعەون: منداڵێك لە تۆ بێت هەر وەك تۆ كافرو بێباوەڕو سەركەش دەردەچن.. ئەمە جوانە لەناو كۆشكێكی خۆمدا بێباوەڕی سەر هەڵبدا! ئەو سەرە ئەبڕم..

مەنجەڵە ئاوە كوڵەكە ئامادە كراو یەك یەك ئەو منداڵە بێ گوناهو مەزڵومانە هەڵ دەدرانە ناو ئاوە گەرمەكەو ئێسقانو گۆشتیان لە یەك جیادەبویەوە..

ژنەكە بە باوەڕێكی پۆڵاینەوە سەیری ئەو دیمەنە پڕ لە تراژیدیایەی دەكردو هەناسەی بۆ هەڵدەكێشانو بە دەم خۆیەوە دەیوت: ئەم بونەوەرە تەنها یەك خوا بەڕێوەی دەباتو باوەڕم بەو خوایە هێناوەو.. قەیناكات منداڵە چاوگەشەكانم با لە پێناوی خوادا گۆشتو ئێسقانمان لە یەك جیاكەنەوە خۆ لە بەهەشتی خوا جارێكی تر بە یەكتر شاد دەبینەوە..

پاشا: ها ژنەكە ئێستایش باوەڕ بێنیتەوە پێم.. عەفوت دەكەم..

خانم: پێویستم بە عەفوی تۆ نیە.. من تەنها موحتاجی عەفوی پەروەردگارم بەڵام یەك داوام لێت هەیە.. ئەگەر بۆم بکەیت مەمنونم.

فیرعەون: چیە؟ بیڵێ؟

خانم: منو منداڵەکانم لە یەك کفندا کۆبکەنەوەو لە یەك گۆڕیشدا بماننێژن باشە..

فیرعەون: پێکەنینێکی کردو وتی: لەم داواکاریە.. چ جەرگی قایمە وامزانی داوای ئەوەم لێ دەکات لێی خۆش ببم.. باشە ئەوەت بۆ دەکەین، ئادەی بیخەنە ناو ئاوەکەوە.. ئای کە دیمەنێکی خۆشە وەزیرەکان...

دایکەکە زۆر بەزەیی بە منداڵە بچوکەکەی باوەشیدا هاتەوەو دڵی نەها بیخاتە ناو ئاوە گەرمەکەوە.. کەمێ وەستا.. جەندرمەکان لێی گەڕانو وایان زانی لە ترساندا پەشیمان دەبێتەوە.

بەڵام بە ئیرادەی پەروەردگاری بە توانا منداڵەکە هاتە قسەو ڕوی کردە دایکیو پێی وت:

دایە گیان.. خۆت هەڵبدە ناویەوە.. مەترسە.. سزاو ئازاری دنیا زۆر ئاسانترو سوکترە لە سزای سەختی ڕۆژی قیامەت.

خانم: وەی بە ساقەت بم. ئەوە چۆن هاتیتە قسە؟ پاكو بێگەردی بۆ ئەو خوایەی تۆی بێ زمانی هێنایە گۆ..

ئەمەی وتو خۆی هەوادایە ناو ئاوە گەرمەکەوەو چوە ڕیزی ئافرەتانی شەهیدانی ڕێگەی خودا..

## پەندو ئامۆژگاریەكانی ئەم چیرۆكە:

١- ئەگەر شتێكی خۆش‌و سەرسوڕهێنەرت بینی لە گەشتەكانتدا، ئەگەر زانیت باسكردنی پڕپەتی لە پەندو ئامۆژگاری بۆ هاوڕێ‌و كەس‌و كارو قوتابیانت، بۆیان باس بكەو با لوتكەی دانیشتنەكە پڕ بێت لە شتی نوێ‌و لە دەستی تۆدا بێت.

٢- مرۆڤی موسڵمان دەبێت پرسیار بكات لەو شتانەی دەكەوێتە بەرچاوی‌و ئیتر با ئەو كەسەیش ئەو نزمتر بێت.

٣- دروستە كارو كاسپی‌و تەعامول لەگەڵ كافرو بێباوەڕانداو بازرگانی كردن‌و ئیش كردن بۆیان‌و لە بەرامبەردا ڕۆژانە یان مانگانەیان لێ وەربگیرێت لە كاتێكدا كە ئاشكرایە پارەكانیان حەرامی تێكەڵە..

نابینی ئەو ژنە خواناسە بڕواداره بژێوی ژیانی لە خزمەتكردنی كچانی فیرعەوندا مسۆگەر دەكات.

٤- بەڵام نابێت ئەو تێكەڵی‌و كاربۆكردن‌و بازرگانییە لەگەڵیاندا وا لە مرۆڤ بكات لە بیروباوەڕو ئیسلامەتی تەنازول بكات‌و لەبەر ئەوەی تیكە نانەكەی نەبڕێت‌و لەو كارە دەری نەكەن..

نابینی ئەو خانمە كە دیارە چەند هەتیوێكی هەبو بۆ بژێوی ژیانیان پەنای بردوە بەر داهێنانی قژی كچەكانی فیرعەون بەڵام نە لە ترسی نان بڕین‌و نە لە ترسی مردن باوەڕەكەی نەشاردەوەو ئازایانە ئیعلامی باوەڕداری خۆی كرد.

٥- ئەگەر ئەو خانمە مرۆڤێكی ترسنۆك بوایە یان لەو كەسانە بوایە كە دەڵێن جارێ وەختی ڕوبەڕوبونەوە نەهاتوەو كاتی ماوە!! بە كچی فیرعەونی دەوت: توخوا دەرم مەكە! ئەوە قسەیەك بو لە دەمم دەرچو!. جگە لە باوكی ئازیزتان كەی خوای تر هەیە!!

بەڵام نا، بەڵكو فەرموی: خوای من‌و خوای تۆو خوای باوكیشت (الله)یە!.

٦ـ دەبێ مرۆڤی موسڵمان لەوە دڵنیا بێت کە دوژمنانی تا بڵێی دڵڕەقو بێ ئاینو بێ ویژدانن‌و هەر کە بۆیان دەرکەوت تۆ نێی لە ڕیزیان‌و لەگەڵیان نیت ئاوو ڕۆنت بۆ ئەقرچێنن‌و گۆشت‌و ئێسقانت لە یەك جیا دەکەنەوە..

بەڵام باوەڕ زۆر لەوە شیرینترو مەزنترە کە دوژمنان بیانەوێت هەڵگرانی قورئانی پێ پشت سارد بکەنەوە..

٧ـ دوژمنانی ئیسلام زۆر دڵڕەقن‌و زۆر ستەمکارو نادادپەروەرن‌و ئامادەن لە پێناو کورسیەکەی خۆیاندا تاوانبارو بێتاوان، تەڕو وشك پێکەوە بسوتێنن.

ئەی نابینی فیرعەون دەبوایە سزاو ئەشکەنجەی ژنەکەی بدایە کەچی بنەمایەکی ڕەوشتی نەبو کە نەیەڵێ منداڵە بێ تاوانە بچوکەکانی ئەو ژنە بکوژێت..

بەڵام لە ئیسلامی پڕ لە دادا کەس تاوانی کەسی تر هەڵناگرێت‌و: ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ﴾.

٨ـ زاڵم‌و ستەمکاران لەوانەیە لەبەر چاوبەستنی خەڵکی هەندێ چاکەی بچوك‌و بێ ئەهمیەت لەگەڵ بانگخوازان‌و هەڵگرانی بانگی قورئاندا بکەن‌و لەناو خەڵکیشدا خۆیانی پێوە هەڵ بنێن.

بەڵام ئەوە ئەشارنەوە کە ژنێکی بێ تاوان کە تا دوێنێ خزمەتی ئەوانی کردوە لەگەڵ منداڵە ساواکانیدا لەناو ئاوی کوڵ بە کوڵدا بکوڵێن..

نابینی فیرعەون ئەو ژنەو منداڵەکانی زۆر بێ بەزەییانە لەناو برد کەچی لەولاوە پێی دەڵێ تۆ چی دەڵێی وا دەکەین لە کاتی ناشتنتدا!!!

٩ـ هەڵگرانی قورئان چونکە بە ڕاستی‌و دڵسۆزانە خوایان خۆش دەوێ‌و لە پێناوی بانگەوازی هەقدا ئامادەن خۆیان‌و ماڵ‌و منداڵیان دابنێن..

خوایش بەوە پاداشتیان دەداتەوە کە ئەگەر سستیەك یان ساردبونەوەیەکیان بەسەردا هات یەکسەر لە ڕێگەی موعجیزەیەکەوە گەرم‌و گوڕیان دەکاتەوەو ناهێڵێت پێیان بخلیسکێت وەك هاتنەگۆی منداڵی ژنەکە.

# القصة السادسة عشر

## إجتماع خطر

عن جابر بن عبدالله (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ):

((إن إبليس يضع عرشه على الماء ثم يبعث سراياه، فأدناهم منه منزلة أعظمهم فتنة.

ثم يجئ أحدهم فيقول: فعلت كذا وكذا. فيقول: ما صنعت شيئا!

قال: ثم يجئ أحدهم فيقول: ما تركته حتى فرقت بينه وبين امرأته.

قال فيدنيه منه ويقول: نعم أنت!.

قال الأعمش (رحمه الله): أراه: قال: فيلتزمه)).[١]

واتە: جابری کوڕی عبدالله (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی:

ئیبلیس (نەفرەتی خوای لێ بێت) عەرشەکەی بەسەر ئاوەوە دروست کردوەو لەوێوە دەستە دەستە سەربازەکانی دەنێرێت بەملاو بەولادا..

نزیکترین کەسی ئەو دەستانە لێی ئەوانەن کە خراپەی گەورەتر دوچاری مرۆڤەکان دەکەن..

پاشان دێنەوە خزمەتیو یەکێکیان پێی دەڵێت: من توانیم ئەوەو ئەوە بکەم..

ئەویش پێی دەڵێ: هیچت نەکردوە بە دڵم نییە!

دەڵێ: پاشان یەکێکی تریان دەێتەوەو دەڵێ: وازم لە مرۆڤەکە نەهێنا تا توانیم نێوان ئەو خێزانەکەی تێك بدەم!..

دەڵێ بانگی دەکاتە پاڵی خۆیو پێی دەڵێت: تۆ چەند چاكو باشیت (واتە چەندم بە دڵی).

ئەعمەش (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: پێم وایە باوەشی پیا دەکاتو ئەگوشێت بە خۆیەوە..

---

١ رواه مسلم واحمد، لە کتێبی (صحیح قصص الرسول) ، (٣/٩٩) وەرم گرتوە.

# چیرۆکی شانزەیەم

## کۆبونەوەیەکی ترسناك

دەریایەکی گەورەی بێ بنو بە چواردەوریدا باخو باخاتێکی سەوزو چڕو دڵڕفێن بەڵام لە هەمو لایەکەوە بە پاسەوانی ناشیرینو لچ زلو ئەستورو گوێ زل دەورە دراوە..

لە ناوەڕاستی دەریاکەشدا عەرشێکی گەورەو تایبەت دانراوەو بە هەر چواردەوریدا بە هەمان پاسەوانی ناشیرین دەورەدراوەو پارێزگاری ئەکەن..

لەسەر عەرشەکەش (کەسێکی زۆر ناشیرینو زەبەلاح) بە کەشخەو فیزێکەوە دانیشتوەو غەزەب لەناو چاوی ئەبارێتو دەستەکانی بە توندی ئەدا بە یەکداو هاواری ئەکات:

ابلیس: کۆببنەوە کاری گرنگم دەوێ وەرن با ماستەرپلانەکانتان بۆ دابنێم..

هەمو دێنو یەکی لەسەر کورسیەك لەسەر ئاوەکە دادەنیشنو سەر دادەخەنو ناوێرن هیچ بڵێنو ئەلەرزنو سەیری یەکتری دەکەن..

شەیتان: دەزانن بۆ کۆم کردونەتەوە؟ هەمویان: نەخێر گەورەم.

شەیتان: من ناڵێم.. تا ئێستا هیچتان نەکردوەو کارەکانتان زەربی سفر ناکەم.. بەڵام من کاری زیاترم ئەوێ لێتان.. مرۆڤەکان هەمو بەرەو گوێڕایەڵی خوا دەچنو قورئان دەخوێننو سیمای پۆشتەیش لەناو ئافرەتانی موسڵماندا تەشەنەی کردوە..

من نازانم ئێوە خەریکی چین بۆ هێشتوتانە..

یەکێکیان: گەورەم لە بەرامبەری ئەوەشدا هەزاران کەسمان لە ئاینی خوا دورخستۆتەوەو ئافرەتانی موسڵمانمان بەرەو ڕوتیو بێ بەرگی بردوەو بەدڕەوشتیمان بڵاوکردۆتەوە.

شەیتان: ها ها ها هیچتان نەهێشتۆتەوە! بێ مێشك، من ئەمەوێ تاکە کەسێك نەهێڵنەوە لەسەر بەرنامەکەی محمد! ئای محمد چەندم ڕق لێتە..

یەکێکیان: گەورەم زۆر هەوڵ دەدەم منداڵەکانیشیان ناو نەنێن (محمد) کەچی هەر ناوی ئەنێن نازانم چی بکەم..

شەیتان: ئەزانی چی بکەیت؟ نەخێر گەورەم.. شەیتان دەڵێت وەرە پێشەوەو ئەویش دێتە پێشەوەو یەك زللەی توندی لێ دەداتو دەڵێت ناو چییە خۆتی پێوە خەریك دەکەی گەمژە.. برۆ لەسەر ڕێی خواناسی لایان بدەو قورئانیان لەبەر چاو بخەن، باوەڕی ناو دڵیان گوماناوی بکەن.. ئاژاوە بخەنە نێوانیان.. کوڕانو کچانیان تێکەڵ بکەن.. دەی هەستن برۆن دەست بەکار بن..

شەیتان: خوا مەرگی داون بە دەستی بەتاڵ بێنەوە، هەمو پشتو پەراسوتان دەشکێنمو ئاوتان پیا دەکەم..

(هەمو بڵاوەی لێ دەکەن).

شەیتان بە تەنها دانیشتوەو نرخەی سەر سنگی دێتو فوی کردۆتە خۆیو بە دەم خۆیەوە دەڵێت: چی بو نەهاتنەوە؟ من دڵم تەقی خەریکە ڕەنجەکەم بە فیڕۆ دەڕواتو سەر زەوی موسڵمان دەبنو نوێژ دەکەن ئاخ نوێژ! ئاخ سوژدە! تۆ قوڕت کرد بە سەرمدا.. ئاخر بڵێ بۆچی ئەوەندە لار بوم، ئاخر بۆچی سوژدەیەکم نەبرد بۆ ئادەمو خۆم نەجات نەدا وەك هاوڕێ فریشتەکانم؟

پاش کەمێك هەمویان هاتنەوە، پێکەوە: سڵاو گەورەمان..

شەیتان: هەر کاری چاکەتان ئەنجام دابێ باشە، ئادەی، تۆ قرفز چیت کردوە بۆم؟

قرفز: قوربان هەوڵم دا لەگەڵ یەکێکدا تا قەناعەتم پێکردو نوێژی عیشای نەکردو خەوت.. باشم پێکرد؟

شەیتان: بەخێر نەیەیتەوە.. بۆ خۆتو کاری کردوتە.. وام زانی نوێژت پێ تەرك داوە ئەفەنی دانیشە دەی؟ ئادەی یەکێکی تر؟

شەلکم: قوربان، منیش هەوڵم دا لەگەڵ کەسێکدا تا لە ڕەمەزاندا ڕۆژوم پێ شکاند، ئەی چی ئاوای لێ ئەکەم..

شەیتان: دانیشە مردو مرێ ئەوە چیە شەلکم؟ موسڵمانی باوەڕ بتەو پەشیمان دەبێتەوە لێیو ڕیسەکەت دەبێتەوە بە خوری. ئادەی یەکێکی تر؟

زەڕناب: گەورەم من شتێکی زۆر گەورەم کردوە پیاوێك پارەی باشی هەبو، خەریك بو ئەچو بۆ حەج..گوزەرنامەیشی دەرهێنابو.. بەڵام من نەمکرد بە نامەردیو چومە گیانیو

پێم وت: حەجی چی ماڵت ئاوا بێت.. تۆ کەی دەوڵەمەندی، دو پوڵت هەیە، مەیکە بە حەج.. تۆ کوڕت هەیە ژنیان بۆ بێنە.. خانوەکەت نوێ بکەرەوەو ئوتومبیل بکڕە تۆ کەی حەجت لەسەرە خۆ حەمە قەدوەی موسڵ نیت؟

شەیتان: بەس بەس زەڕناب، نامەوێ گوێم لەم قسانە بێت.. حەمەقەدوە.. وام زانی وات لێ کردوە گاڵتە بە کەعبەو قیبلەکەی خۆیان بکاتو باوەڕی پێی نەبێت..

شەیتان: لاچۆ.. با یەکی تر بێت..

شەرقەم: گەورەم.. من توانیم ئەمڕۆ پیاوێکی دەوڵەمەند قەناعەت پێ بکەم کە دەست نەخاتە پارەکانیو زەکات نەداتو خێری لێ نەکاتو پێم وت: کۆی بکەرەوە بۆ ڕۆژی ڕەش، بۆ نەشتەرگەریەك! بۆ شتێك!

ئیتر باش بو بە قسەی کردو یارمەتی کەسی نەداو هەموی شاردەوە.. ئا ئاوا..

شەیتان: لاچۆ.. لاچۆ.. دورکەوە لێم.. توخوا تۆ کارت کردوە بەخێر نەیەیتەوە شەرقەم..

پێینجەمو شەشەمو حەوتەم.... هتد قسەی خۆیان کرد هەر بە دڵی نەبو..

بەڵام یەکێك هاتە پێشەوەو وتی:

+ گەورەم من کارێکی زۆر ترسناکم ئەنجام داوە؟

– چیە؟ بە قوربان ئا دەی بێڵێ؟

+ گەورەم ناکۆکیو ئاژاوەم خستە ناو خێزانێکی موسڵمانو ژنو پیاوەکەم بە جۆرێك دا بە شەڕ کە جنێو نەما بە یەکی نەدەنو لە ئاکامدا شیرازەی خێزانەکەم تێکداو ژنەکەی دەرکردو تەڵاقی دا..

شەیتان: وەرە پێشەوە.. ئەی بۆ زوتر ئەمەت پێ نەوتم.. (باوەشی پیاکردو تێر ماچی کرد)و لە پاڵ خۆیدا دایناو دەستی خستە سەر شانیو وتی:

– گوێ بگرن ئا لەمەم ئەوێ! ئا لەمە! نوێژو ڕۆژو بە خەڵك تەرك مەدەنو ڕێگەی خێریشیان لێ مەگرن.. ئەوانە باشن بەڵام ئەوە کاری بازرگانە بچوکەکانە..

– من ئەمەوێ شیرازەی خێزانەکان تێك بدەنو ڕێز لەناویاندا هەڵگرنو کوڕ بە گوێی باوکی نەکاتو کچەکان سەرپۆشو حیجاب فڕێ بدەنو لەگەڵ دایکانیاندا بەشەڕ بێنو بەدڕەوشتی بخەنە ناویانەوە.. من ئەوەم ئەوێ چاوەکانم دەی هەڵسن دەقە بە زایە مەدەن.. بەردەوام کارم بۆ بکەن..

## پەندو ئامۆژگاریەکانی ئەم چیرۆکە:

١ـ شەیتان خۆی لە ئاگر دروست بوە بەڵام ئەوەتا عەرش لەسەر دەریا دەبەستیو ئازاریشی نادات وەك چۆن مرۆڤ لە گڵ دروستو بوەو لە هەمان کاتدا گڵ ئازاریشی دەدات..

٢ـ شەیتان تەنها نیە بەڵکو زۆر زۆرنو سوپایەکی زەبەلاحی پرچەکی هەیەو سریە سریەی کردونو هەر سریەیەك بۆ شارێك یان بۆ وڵاتێك.

٣ـ پلەبەندی لەناو زرێتی شەیتاندا بەپێی دڵسۆزیو هەوڵدانی شەوو ڕۆژە لە پێناو لادانی نەوەکانی ئادەمدایە لە ئاینی پاكو خواناسیو ڕەوشت بەرزیو پێکەوە ژیان.

٤ـ دیارە شەیتان (بە لەعنەت بێ) بە دڵی نیە گوناهی بچوك بکەینو نوێژێ دوان بفەوتێ یان ڕۆژێ دو ڕۆژ لە ڕەمەزان بخۆین، یان درۆیەك.. نەزەرێك، ئەمانە زۆر بێ بایەخن لە لای شەیتان هەرچەندە لە ئیسلامدا گوناهی کەبیرەنو ئەگەر خاوەنەکانیان تۆبەیان لەسەر نەکات دەخرێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە.

٥ـ ئەبێ ژنو مێردە موسڵمانەکان لەوە دڵنیا بن کە شەیتان ناکۆکی نێوان ژنو پیاوو پچڕاندنی شیرازەی خێزانی بە لاوە گرنگترە تا کەسێك نوێژ بفەوتێنێ یان ڕۆژێك، دوو ڕۆژ لە ڕەمەزان بخوات یان حەج دوا بخات..

چونکە کە شیرازەی خێزان تێك چو هەمو بوارە کۆمەڵایەتیو زانستیو خواناسیەکانی تر بە دوایدا تێك دەچن..

٦ـ زۆر گرنگە بۆ مرۆڤ ئەوەندە دوژمنایەتی شەیتان بکات تا سەر ئێسقانی چونکە تاکە کارێکی ئەو لە ژیاندا دوژمنایەتی کردنی مرۆڤەکانەو لادانیانە لە ڕێبازی یەکتاپەرستیو موسڵمانەتی: ﴿إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّا ۚ إِنَّمَا يَدْعُوا۟ حِزْبَهُۥ لِيَكُونُوا۟ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ﴾.

٧ـ کەواتە زۆر پێویستە لەسەر دایکانو باوکان تەقێ لە یەکتری بکەنو هەڵەی یەکتری بە سنگێکی فراوانەوە قبوڵ بکەنو ژیرانە کێشەکانیان چارەسەر بکەن. گەنجە موسڵمانەکان ڕێز بۆ دڵی دایكو باوکیان دابنێنو دڵیان نەشکێننو داوایش لە باوکانو دایکان دەکەم بە ڕەخنەو جنێوو قسەی سوك کوڕەکەیان یان کچەکەیان دانەگرنەوە بەڵکو وەك هاوڕێیەکی خۆشەویستیان بن.

## القصة السابع عشر

## آدم على الحق

عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ): إحتج آدم وموسى (عليهما السلام) عند ربهما فحج آدم موسى، قال موسى: أنت آدم الذي خلقك الله بيده، ونفخ فيك من روحه، وأسجد لك ملائكته، وأسكنك في جنته، ثم أهبطت الناس بخطيئتك إلى الأرض؟

فقال آدم: أنت موسى الذي اصطفاك الله برسالته وبكلامه، وأعطاك الألواح فيها تبيان كل شيء، وقرَّبك نجياً، فبكم وجدت الله كتب التوراة قبل أن أخلق؟

قال موسى بأربعين عاماً.

قال آدم: فهل وجدت فيها ﴿وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ﴾؟*

قال: نعم.

قال: أفتلومني على أن عملت عملا كتبه الله عليَّ أن أعمله قبل أن يخلقني بأربعين سنة؟

قال رسول الله (ﷺ): فحج آدم موسى)).[١]

واتە: ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (ادمو موسا) (سەلامی خوایان لێ بێت) لەبەردەمی پەروەردگاریاندا گفتوگۆیان دەکردو لە ئەنجامدا ئادەم (سەلامی خوای لێ بێت) سەرکەوت بەسەر موسادا (سەلامی خوای لێ بێت).

سەرەتا موسا بە باوکە ئادەمی فەرمو: تۆ ئەو ئادەمەی کە خوای گەورە بە دەستی خۆی دروستی کردی، لە گیانی خۆی کرد بە بەرتدا، و هەمو فریشتەکانی وا لێ کرد سوژدەت بۆ بەرن،و خستیتیە ناو بەهەشتەکەیەوەو پاشان بە هۆی هەڵەیەکی تۆوە هەمو خەڵکی دەرکرانە سەر زەوی؟

---

* سورة طه (١٢١).

١ رواه مسلم (٢٦٥٢/١٥) صحيح قصص الرسول (٣٦٩/٢).

ئـادەم فـەرموی: ئـەی تـۆ ئـەو موسـایەی کـە خـوای گـەورە پـەیامو وتـەی خـۆی بـۆ ناردویتو ئەلواحی پێ داوی کە هەمو شتێکی تێدا ڕون کراوەتەوەو نزیکی کردویتـەوە لـە خۆی؟

ئەی باشە لە تۆ وایە تەورات چەند ساڵ پێش دروستبونی من نوسراوە؟

موسا فەرموی: چل ساڵ.

ئادەم فەرموی: ئەی ئەم برگەیەت نەبینیوە تیایدا کە دەفەرموێت: ((ئادەم سەرپێـچی خوای کردو سەرگەردان بو))؟

فەرموی: بەڵێ تیایەتی.

ئادەم فەرموی: دەی باشە چۆن لۆمەم ئەکەی لەسەر کارێك کە چل ساڵ پێش دروست بونم لەسەرم نوسراوە کە بیکەم؟!..

پێغەمبـەر (ﷺ) دەربـارەی ئـەم وتووێـژە فـەرموی: ئـادەم تـوانی زاڵ بێـت بەسـەر موسادا..

# چیرۆکی حەڤدەیەم

## ئادەم لەسەر هەق بو

ئادەم پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) کاتێك لەگەڵ موسا پێغەمبەردا یەکتریان بینی ئیتر ئەم یەکتر بینینە لە (قدس) ڕووی دابێت کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە شەوی معراجدا بەرنوێژی پێغەمبەرانی کردو هەمو لە دوای پێغەمبەرەوە نوێژیان کرد..

یان لە ئاسمان ڕۆحی پیرۆزیان گەیشتون بە یەك‌و ئەم دیدارە ڕوی دابێت..

گرنگ نیە لە کوێ‌و کەی ڕوی داوە، گرنگ ئەوەیە فەرمودەکە صەحیحەو (مسلم) ریوایەتی کردوەو باوەڕمان وایە شتێکی ئاوا ڕوی داوەو پێغەمبەریش (ﷺ) لەبەر کۆمەڵێك حیکمەت بۆ هاوەڵانی گێڕاوەتەوە..

موسا (علیه السلام) دەڕوات بۆ لای باوکە ئادەم (علیه السلام)و سڵاوی لێ دەکات‌و پێی دەڵێت:

سڵاوی خوات لێ بێت ئەی باوکی گەورەمان..و دەستی دەگرێت‌و تێر ماچی دەکات..

ئادەم: سڵاو لە کوڕی خۆشەویستم -پێغەمبەری (أولی العزم)- ئەو کەسەی کە ئازایانەو پاڵەوانانە بەرەو ڕوی مەرگ ڕۆیشتیت‌و چویتە کۆشکی فیرعەون‌و باوەڕی هەق‌و یەکتاپەرستیت دا بە گوێی ئەو طاغوتەدا..

موسا: باوکە گیان.. گەردنم ئازاد کە من بەرامبەر بە باوکی گەورەو بەڕێزم هەندێ بۆچون.. یان هەندێ گلەییم هەیە..

ئادەم: هەرچی بڵێن هەقی خۆتانە.. من‌و حەوا بە سوێندێکی شەیتان هەڵخەڵەتاین.. بەڵام ئایا لەو بارەیەوەیە؟

موسا: داوای لێبوردن دەکەم‌و بێ ئەدەبی نەبێت بەڵێ.

ئادەم: ئادەی بۆم باس بکە.. گوێم لێتە.. هەر تۆ نیت وا دەڵێیت؟

موسا: تۆ نەبویت خوای گەورە بە دەستی خۆی دروستی کردیت؟ یان لە ڕۆحی خۆی ڕۆحی کرد بە بەرتدا؟ یان هەمو فریشتەکانی بۆ تۆ سوژدە پێ نەبرد؟ ئەی ئایا بە ڕێزەوە

نەیبردیتە بەهەشتەکەیەوە؟ کەچی تۆ باوکی بەڕێزم بە هۆی سەرپێچیو هەڵەیەکەوە خۆتو هەمو خەڵکیت خستە سەر زەویو لە بەهەشت دەرکران؟

ئادەم: کوڕی خۆم.. ئەو کارە ڕوی داوە.. لە ئێوە زیاتر خەفەتبارمو ناڕەحەتم.. هەرچەندە خوای گەورە لێم خۆش بوە..

بەڵام دەستی منی تیا نەبو.. حیکمەتی خوایی لەوەدا بو کە بە هۆی ئەو کارەی منەوە ژیان هاتە سەر زەویو نەوەکانم خرانە ژێر تاقیکردنەوەی خواییەوە..

موسا: ئاخر بەهەشتمان لە دەست دەرچو کە بێ بەرامبەر بو.

ئادەم: کوڕم ئەوەش ویستی خوا بو کە هەمو دوای مردن بگەڕێینەوە ناو بەهەشت بەڵام هەمومان نا..

بەڵکو تەنها چاکەکارانو خوناسان دەبرێنەوە ناویو ڕۆڵە سەرکەشو خوانەناسەکانم بە داخەوە لەو بەهەشتە بەرینە دور دەخرێنەوەو لە ناو ئاگری دۆزەخدا دەسوتێنرێن.

موسا: کەواتە هەڵەی تۆی تیا نەبو؟

ئادەم: من پرسیارێکت لێ دەکەم.. ئایا تۆ خوای گەورە نەیکردی بە پێغەمبەری خۆیو (الواح)ی پێ نەدایت کە ڕونکردنەوەی هەمو شتێکی تێدایە؟. و لە خۆی نزیکی نەکردیتەوە؟ ئایا بە تۆ دەڵێم تەورات لە لایەن خواوە چەند ساڵ پێش دروست بونی من نوسراوە؟

موسا: (٤٠) ساڵ.

ئادەم: ئەی تیایدا نەهاتوە: ((وعصى آدم ربه فغوى)) واتە: ئادەم سەرپێچی خوای کردو سەرگەردان بو.

موسا: بەڵێ.

ئادەم: دەی ئیتر کەی ڕەوایە تۆ لۆمەی من بکەیت لەسەر کارێك کە خوای گەورە پێش چل ساڵ لە دروست کردنم نوسیویەتی لەسەرم؟ کەواتە ئەو مەسەلەیە نەخشە بو بۆ دروستبونی ژیانو ئاوەدانکردنەوەی سەر زەوی.

موسا: وەڵڵاهی ڕاستەکەی.. من داوای لێبوردن ئەکەم باوکە گیان.

## پەندو ئامۆژگاریەکانی ئەم فەرمودەیە:

١- گفتوگۆکردنو وتوویژکردن لە نێوان مرۆڤەکاندا شتێکی ئاساییەو سودی هەموانی تێدایەو بۆچونە دور لە یەکەکان لە یەکتری نزیك دەکاتەوەو لە یەك حالّی بون دروست دەبێت.

٢- گفتوگۆکردنو وتوویژ ئەگەر کەرەستەی خۆی بۆ ئامادە بکرێت لەگەڵ هەمو کەسدا دەبێتو دەکرێت بەڵام سنوری ڕێزی تێدا پارێزراو بێتو گەورەو بچوك بمێنێت.

٣- گەورەو سەرکردەکان نابێ تێك بچن یان توڕ ببن کاتێ ئاستەکانی خوار خۆیان بیانپێچنو ڕەخنەیان لێ بگرن بەڵکو دەبێت بە گیانێکی لێبوردانەو سنگێکی فراوانەوە (ئادەم) ئاسا بە شێوازی عیلمیو مێژویی مەسەلەکەیان تێ بگەیەنێتو قەناعەتیان پێ بکات..

٤- نابێت کەسانی ئاست نزم شەرم بیانگرێت لەبەردەم گەورەکانداو سەرنجو تێبینیەکانیان نەوێرن دەربڕنو هەر خۆیان بخۆنەوەو لە پشتەملە غەیبەتیان بکەن.

٥- ئەگەر ویستت ڕەخنە لە کەسێك بگریت لەسەر کارێکی یان وتەیەکی دەبێت سەرەتا چاکەو مەزنیو سەروەریەکانی باس بکەیتو پاشان ڕەخنەکەت پێشکەش بکەیتو ئەویش بە سنگی فراوانەوە لێت وەردەگرێتو وەڵامی دروستت دەداتەوە.

٦- ئەگەر بەرامبەرەکەت لەسەر هەق بو.. وتەکانی ئەو بەجێ تر بو لوتبەرزیو خۆبەزلزانی وات لێ نەکات ملەجیڕە بکەیتو هەر خۆت بە ڕاست بزانیت..

ئەوە ئیمامی شافیعیە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: لە سەرەتای گفتوگۆکانماندا داوامان لە خوا دەکرد هەق لەسەر دەستی بەرامبەرەکەمان دەر بکەوێت تا ئاوی دەموچاویان نەتکێت.

# القصة الثامنة عشر

## كلمة خطرة

عن ضمضم بن جَوْس اليماني قال: دخلت مسجد رسول الله (ﷺ) في طلب صاحب لي، فإذا رجل، أدْعَجُ العين، براق الثنايا، فقال لي: يا يمامي، لا تقولن لأحد: والله لا يغفر الله لك، ولا يدخلك الجنة؟

قلت: من أنت يرحمك الله؟ قال: أنا أبو هريرة.

قلت: قد نهيتني عن شيء كنت أقوله إذا غضبت على أهل بيتي وحشمي.

قال: فلا تفعل، فإني سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: ((كان رجلان من بني إسرائيل، كان أحدهما به زُهد والآخر عابدًا، فكان لا يزال يقول له: ألا تكفَّ؟ ألا تُقصرِ؟

فيقول: ما لك ولي، دعني وربي.

قال: فهجم عليه يومًا، فإذا هو على كبيرة، فقال: والله لا يغفر الله لك، والله لا يدخلك الله الجنة.

فبعث الله إليهما ملكًا فقبض أرواحهما، فلما قدم بهما على الله (عز وجل) قال للمذنب: ادخل الجنة برحمتي.

وقال للعابد: حظرتَ على عبدي رحمتي، أكنت قادرًا على ما تحت يدي؟ انطلقوا به إلى النار))

قال رسول الله (ﷺ): ((والذي نفسي بيده لقد تكلم بكلمة أوبقت دنياه وآخرته)).[1]

واتە: ضمضمی کوڕی جرسی یەمامی دەڵێت: چومە ناو مزگەوتەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ هاوڕێیەکم دەگەڕام.. لە ناکاو چاوم کەوت بە پیاوێکی چاو گەورەی چاو ڕەش، کە دانەکانی زۆر سپیو جوان بو ڕوی تێ کردمو پێی وتم: ئەی برای یەمامی هەرگیز بە کەس نەڵێیت: وەڵلاهی هەرگیز خوا لێت خۆش نابێتو نایشت خاتە بەهەشتەوە؟

---

[1] حديث صحيح رواه احمد في (المسند)، (٨٢٧٥)، وقال الشيخ احمد شاكر: اسناده صحيح ورواه ابو داود والحاكم وقال الحافظ العراقي في تخريجه لأحاديث (الاحياء)، (٣/٥١٥) اسناده صحيح. لە کتێبی (صحيح قصص الرسول)، (١/٢٣٦) وەرم گرتوە.

وتم: تۆ کێیت؟ ڕەحمەتی خوات لێ بێت؟

وتی: من ئەبو هورەیرەم.

دەڵێت: وتم تۆ بەرگری هەندێ وتەم لێ دەکەیت کە لە کاتی توڕە بوندا بە منداڵەکانم‌و خزمەتکارەکانمی دەڵێم..

وتی: ئیتر مەیڵێ، چونکە من لە پێغەمبەری خوام بیستوە (ﷺ) کە فەرمویەتی:

دو کەس هەبون لەناو بەنی ئیسرائیلدا، یەکێکیان خۆی بە کەشخەو گەورە دەزانی (یان لە ڕیوایەتی ئەبو داوددا هاتوە: کە یەکەمیان گوناهی دەکردو خۆی لە حەرام لا نەدەدا).

بەلام کەسی دوەم عابیدو خواناس بو. (دیار بو زۆر دەینازی بە خواناسی‌و بەندایەتیەکەیدا)..

بەردەوام بە هاوڕێ گوناهبارەکەی دەوت: ئەرێ بەس نەبو گوناهکردن؟ ئەرێ ئیتر واز ناهێنی؟

هاوڕێکەشی دەیوت: ئەرێ تۆ هەقت چیە بە سەرمەوە؟ بۆ واز لە خۆم‌و خوای پەروەردگارم ناهێنی؟! دە بمدەرە دەستی ئەو.

دەڵێ: ڕۆژێکیان چو بە سەریدا.. دەبینێ خەریکی گوناهێکی گەورەیە.. هاواری کرد بەسەری داو وتی: (تۆ ئەمە کارت بێت) وەللاهی هەرگیز خوا لێت خۆش نابێت! و وەللاهی هەرگیز نایشتباتە بەهەشتەوە!!.

خوای گەورەیش فریشتەی گیان کێشانی ناردو گیانی هەردوکیانی کێشاو کە گەڕانەوە حزوری پەروەردگار بە باوەڕدارە گوناهبارەکەی فەرمو: بچۆرە بەهەشتەوە بە هۆی بەزەییمەوە.

بە خواپەرستەکەشی فەرمو: تۆیت بەزەیی من لە بەندەم قەدەغە دەکەیت؟ بۆ تۆ دەسەلاتی شتێکت هەیە کە بە دەستی منەو بەس؟ دەی بیبەن بۆ ناو ئاگری دۆزەخ.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە وشەیەکی وای لە دەم دەرچو.. دنیاو ئاخیرەتی لە دەست دا.

## چیرۆکی هەژدەیەم

## وتەیەکی ترسناك

لەناو بەنی ئیسرائیلدا شتی زۆر سەیرو سەمەرە ڕویداوەو پێغەمبەرمان (ﷺ) بۆی باس کردوین.. بۆ ئەوەی سود لە هەڵەکانیان وەربگرین و دوبارەی نەکەینەوە.

یەکێك لەوانە لەناو بەنی ئیسرائیلدا دو کەس هەبون.. برادەری یەکتر بون.. بەلام ڕەوشتو هەڵسوکەوتیان زۆر پێچەوانەی یەکتر بو..

یەکەمیان مرۆڤێکی باوەڕدار بو بەلام سەرپێچی خوای زۆر دەکردو هەمیشە لە گوناه خۆی نەدەپاراستو بەردەوام سەرخۆش بو..

بەلام کەسی دوەم مرۆڤێکی باوەڕداری خواناس بو.. نزیکی گوناهو سەرپێچی خودا نەدەبویسەوەو بەردەوام خەریکی بەندایەتی بو.. بەلام هەڵەی ئەم پیاوە ئەوە بو..

زۆر دەینازی بەم بەندایەتی و نوێژو ڕۆژوەی دا.. لەگەڵ هاوڕێ تاوانبارەکەیدا زۆر توند بو..

ڕۆژێك خەریکی خواناسی بو.. لە ناکاو هاوڕێکەی هات بۆ لایو سڵاوی لێ کرد..

عابد: وعلیك السلام.. بە خێر بێی، ئەوە چیە پێت.. قاپێ عارەقت پێ نیە؟! هەر خەریکی داوێن پیسیەکانت دەبیت!!

گوناهبار: دە واز بێنە لەو قسانە، من هاتوم سەردانت بکەمو بیرم کردیتەوە دو قسەی خۆش بکەین. کەچی تۆ هەمو جارێ مێشکم کون دەکەی بۆ وا دەکەیو بۆ وا ناکەی..

عابد: ئەگەر خەریکی ئەو کارە خراپو سوکو سەلیمانەی ئیتر سەرم لێ مەدە تۆ شایانی ئەوە نیت لەگەڵ مندا دانیشیو هاوڕێم بی. هێشتا بۆنی دەمت دێت!

عاصی: دەزانی تۆ زۆر بە خۆتا دەنازی؟! بۆ لە تۆ وایە خوا بەس خوای تۆیە؟ من نالێم تۆ لە من باشتر نیت، بەلام بە گوناهێ دوان وام لێ نەهاتوە گلاو بمو تۆ بێزم لێ بکەیتەوە..

عابد: تۆ ئەو ڕۆژە لە دزیدا نەگیرایت؟!

عاصی: با گیرامو دزیشم کرد..

عابد: دەی هەڵسە لاما.. بڕۆ دەی من هاوڕێ تۆم ناوێو هاوڕێی تۆ نیم.. مـن نەخـەیتـە ڕیزی خۆت.. من شەوو ڕۆژ نوێژەکەمو هەمیشە بە ڕۆژوم.. فەرقم ناکەیت لەگەڵ خۆت؟! بڕۆ نەتبینمەوە تا نەبیـستم بـوی بـە پیـاوو وازت لـە ئـارەق خواردنـەوەو دزیو ڕەوشـتی خراپ هێناوە نەیەی بە لامدا..

عاصی: من گوناهکەرم.. بەڵام لە خۆم بایی نیمو کەس بە گـڵاو نـازانم. بـەڵێ خـۆم بـە تاوانبار دەزانم بەڵام بەم حاڵەشمەوە هەر خـوام خـۆش دەوێـتو بـە تـەمای ڕەحمـی ئـەو دەبم.

عابد: هەڵسە لاما.. ڕەحمی خوا هەواتنە نیە؟ بۆ هەمو کەس نیە؟!.

(گوناهکارەکە خواحافیزی لێ دەکاتو بە غەمباریەوە بەجێی دێڵێت).

ڕۆژێکیان بۆ کارێك پیاوە خواناسەکە بە کۆڵانێکدا دەڕوات.. لە ناکاو چاوی بـە هـاوڕێ گوناهکارەکەی هەڵدەتەقێ.. دەبینێ سەرخۆشەو پاڵی داوەتەوە بە دیوارێکەوە..

عاصی: ئەمە تۆی هاوڕێ باوەڕدارو خواناسەکەم.. باش بو هـاتی زۆر بـیرم ئـەکردی.. چۆنی؟ لەگەڵ نوێژو ڕۆژودا چۆنی؟

عابد: توخوا تۆ عەیب لە خۆت ناکەیت؟ ئەوە سەیری خۆت نەکردوە هـەی سەرخۆشـی پیس.. بۆ واز لەم کارە ناشیرینانە ناهێنی؟ بیرێ بکەرەوە ڕێی خوا بگرەبەر..

عاصی: من ڕێی خوام ون نەکردوە هاوڕێ! من هەرەوەیە حەز دەکەم وەك تۆ خـاوێنو بێگوناە بم بەڵام ناتوانم زاڵ بم بەسەر دەرونی خۆمدا.. چی بکەم؟

عابد: وەك من خـاوێن بـێ!؟ بـە خـوا جوانـە مـن سـی سـاڵە خواناسـی ئەکـەم کەچـی تۆیەکی سەرسەری دەتوانی وەك منت لێ بێت.. جوانە! سەیرە!

عاصی: ئەی کێ دەڵێت وام لێ نایەت؟ ڕەحمی خوا زۆر فراوانە، بەهەشتیش ئەوەندەی ئەرزو ئاسمان پانو بەرینە تۆ بڵێی (انشاء الله) جێی منیشی تێدا نەبێتەوە؟

عابد: دەی گوێ بگرە، وەڵڵاهی ئەم جارەش وەڵڵاهی خوا هەرگیز لێت خۆش نابێت، خۆ لێخۆشبون هەروا هەوانتە نیە، گیانە..

عاصی: سوێند مەخۆ، بۆ خاتری خوا خۆ تۆ وەکیلی خوا نیت لەسەر زەوی‌و تەنانەت پێغەمبەریش (ﷺ) ئەم قسەیەی تۆی نەکردوە.. شتی وا مەڵێ؟!

عابد: ئێ من دڵنیام لەوە، خۆ ڕۆژ لە بنەڕۆژەوە دیارە، ئاکامی منی خواناس‌و ڕەوشت جوان بۆ بەهەشت دەڕۆم‌و تۆیەکی گوناهکاری سەرسەری وەڵڵاهی بەهەشت بە دو چاو نابینی! تێگەیشتی؟

عاصی: کاکە تۆ چی دەڵێی؟ بۆ کلیلی بەهەشت بە دەستی تۆیە؟ وا سوێند دەخۆی؟

عابد: نەخێر بە دەست من نیە، بەڵام کلیلی بەهەشت کردەوەی چاکەیە‌و تۆ نیتە.

عاصی: ئیتر ئەوە حسێب ناکەیت کە خۆم بە بڕوادار دەزانم‌و باوەڕم بە خواو پێغەمبەران‌و ڕۆژی دوایی‌و زیندوبونەوە هەیە؟

عابد (بە لاقرتێوە): چوء.. چوء، ئەوە بەس نیە..

(خوای گەورە بەم وتووێژە ئاگادار بو.. زۆر توڕە‌و نیگەران بو لەو هەمو سوێندە نادروستانە بۆیە فەرمانی دا بە فریشتەی مردن کە هەر ئێستا گیانی ئەو دوانەم بۆ بکێشە..

کاتێك مردن‌و گەڕانەوە بەر دەستی پەروەردگار.. هەردوکیانی وەستاندو بەو کەسەی کە گوناهبار بو، هەمیشە لەناو خراپە‌و تاواندا ژیانی بەسەر بردبو پێی فەرمو:

تۆ بڕۆ ناو بەهەشتی هەتاهەتاییمەوە‌و بە ڕەحمی خۆم لێت خۆش بوم.

پاشان بە کەسە چاکەکارە خواناسەکەی فەرمو:

ئایا تۆ ڕەحمەت‌و بەزەیی من لە بەندەکەم قەدەغە دەکەیت؟ بۆچی تۆ وا دەزانی دەسەڵاتی ئەوەت هەیە کە ڕەحم لە خەڵکی بگریتەوە لە کاتێکدا ئەوە تەنها بە دەستی منە‌و بەس؟

دەی مادام ئەوەندە لەخۆبایی‌و لەخۆی ڕازی بوە ببەن بۆ ناو ئاگری دۆزەخ..

## پەندو ئامۆژگاری ئەم چیرۆکە:

١ـ دروستە بڕۆیتە ناو مزگەوتەوە بۆ کارێکی تریش جگە لە نوێژکردنو ذیکرو قورئان خوێندن.. وەك هەندێ لە فەرمودەکانەوە بە هەڵە حاڵی بون، بەڵکو بۆ چارەسەری مەسەلە کۆمەڵایەتیەکانی وەك: سوڵحو هاوسەرگیریو.. هتد.. بە مەرجێ حورمەتی مزگەوت پارێزراو بێت.

نابینی ئەو پیاوە چوەتە مزگەوتەکەی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ کاری گەڕان بە دوای هاوڕێکەیدا؟

٢ـ دروستە لەناو قسەگێڕانەوەدا وەسفی ڕوخساری ئەو کەسە بکەیت کە باسی دەکەیت بۆ زیاتر سەرنج ڕاکێشانو بە گەورە ڕاگرتنی ئەو کەسە.

٣ـ دروستەو شتێکی جوانە کە خەڵکی بە ناوی شارەکەی یان دێکەی یان هۆزەکەیەوە بانگ بکەیت، وەك هاوەڵی زانای پێغەمبەرمان (ﷺ) ئەبو هورەیرە بە (زەمزەمی) وت ئەی (یەمانی) کە پیاوێکی خەڵکی یەمامە بو.

٤ـ ئەگەر کەسێکی خراپو خوێنڕێژ یان بێباوەڕ خەڵکی هۆزێك بو.. نابێ ڕق لە ناوی ئەو هۆزە هەڵبگریتو ناوی نەهێنی..

نابینی (یەمامە) هۆزەکەی موسەیلەمەی درۆزن بو بەڵام ئەبو هورەیرە بە (برای یەمامی) ئەو پیاوەی بانگ کرد.

٥ـ دەبێت مرۆڤ هەمو کاتەکانی ژیان بە هەل بزانێتو لە هەر کوێدا بە هەر کەسێك گەیشت.. قسەی خێری بۆ بکات.. فەرمودەی پێغەمبەر بدات بە گوێیداو لە وتەو مەسەلە ترسناکەکان ئاگاداری بکاتەوەو خەڵکی لە ئاینی پاکی ئیسلام ڕۆشنبیر بکاتەوە.

نابینی ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێت) بە هەلی زانی کەسێك بۆ کارێکی یەك خولەکی هاتبوە مزگەوت کەچی بانگی کردو لە شتێکی زۆر ترسناك ئاگاداری کردەوە.

٦ـ ئەگەر کەسێك سودێکی پێ گەیاندیت یان وتەیەکی خێری پێ وتیت دیارە دۆستو دڵسۆزی تۆیە، بۆیە جوان وایە بیناسیتو لەناوەکەی بپرسیتو لەو ساتە بەدوا خۆشت بوێتو پەیوەندی پێوە مەبچڕە.

نابینی چۆن ئەو پیاوە پرسیاری ناوی (ئەبو هورەیرە)ی کرد.

٧ـ ئەگەر کەسێك فەرمودەیەکی باس کرد یان ئاگاداری کردیت لە وتەیەکی گەورەی قەدەغە خێرا لە ناوەکەی بپرسە، تا بزانیت کێیە؟ و ئایا شایانی ئەوەیە ڕۆڵی مامۆستایەتی ببینێ ئەو پیاوەی پرسیاری کردو کاتێ زانی یەکێك لە هاوەڵە مەزنەکانی پێغەمبەرە (ﷺ) ئیتر گوێی بۆ گرت.

٨ـ ئەگەر لاوازیەك یان ناتەواویەك یان هەڵسوکەوتێکی ناشایستەت تێدابو مەیشارەوەو لە لای مامۆستاو دڵسۆزانی ئیسلام باسی بکە تا چارەسەرت بۆ دۆزنەوەو خۆت بەبێ عەیب مەزانە.

نابینی (ضمضم) چۆن بە خۆی وت بە خوا من ئەو وتەیە زۆر بەکاردێنم لەگەڵ ماڵو منداڵەکەمدا.

٩ـ ئەگەر بە تەمای خەڵکانی چواردەورت بگۆڕیتو بەرەو ڕاستیو ڕەوشتی جوان بیانهێنیتەوە با بە نمونەو بەسەرهاتی گەلانی پێشو قسەکانت بەهێزتر بکەو زیاتر گوێت بۆ دەگرنو زۆرتر لێت حاڵی دەبن.

١٠ـئەگەر خوای گەورە چاکەی بۆ کردیتو کەوتبویتە سەر ڕێگای خواناسیو بەندایەتیو نوێژەکانت هەمویان بە کۆمەڵ ئەنجامت دەداو ڕۆژوی سوننەتت دەگرتو شەونوێژت دەکرد..

ئیتر خۆت بە خەڵکی بەهەشت نەزانیتو لە خۆت بایی نەبیت ئەوە هاوەڵانە (خوایان لێ ڕازی بێت) دەڵێن: بەس بزانم خوا سوژدەیەکی لێ وەرگرتوم لە هەمو دنیا زیاتر پێم خۆشترە.

ئەوەتا ئەو کەسەی کە عابدو چاکەکار بو لەبەر ئەوەی لە خۆی بایی بوبو خوا لێی وەرنەگرتو خستیە ناو ئاگرەوە.

١١ـ هەرگیز ڕقت لەو کەسانە نەبێت کە لە ناو گوناهو خراپەدا گوزەراون‌و هەرگیز بێ هیوایان مەکەن‌و بە دور لە خواو بێباوەڕ مەیاندەرە قەڵەم چونکە لەوانەیە لە دڵەوە لە تۆ زیاتر خوای خۆش بوێت..

حەسەنی بەسری ئاوا سەیری سەرخۆشەکەی کرد کاتێ کە سەرخۆشێك هاتە ڕێگەی‌و باوەشی پێدا کردو تێر تێر حەسەنی بەسری ماچ کرد.. ئەویش فەرموی: کێ دەڵێ ئەم سەرخۆشە لەبەر ئەم دڵە پڕ لە باوەڕەی ناچێتە بەهەشت‌و حەسەنیش هیچی لێ وەرنەگیرابێت.[١]

١٢ـ هەرگیز لە ژیانتدا نزیکی ئەو کارانە نەبیتەوە کە پەیوەندی بە تۆوە نیەو بە تایبەت ئەگەر کەسێکی سەروی خۆت بو یان بەرپرس‌و گەورەت بو.. نابینی ئەو پیاوە مافی ئەوەی نەبو بە ناوی ڕەحم‌و لێخۆشبون‌و بەهەشتەوە قسە بکات..

١٣ـ ئاگاداری زمانت بە لەوانەیە یەك وتەی جوان خۆی بدات لە چەند ساڵێك خواناسی‌و یەك وتەی خراپیش خۆی بدات لە چەند ساڵێك کردەوەی ناشیرین:

﴿وَتَحْسَبُونَهُۥ هَيِّنًا وَهُوَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمٌ﴾[٢].

---

١ بگە بە کاروانی صالحان، نوسەر.

٢ سورەتی (النور: ١٥).

# القصة التاسع عشر

## الكلب العطشان

عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: أن رسول الله (ﷺ) قال: ((بيناً رجل يَمْشي فاشتد عليه العطش، فنزل بئرا، فشرب منها.

ثم خرج فإذا هو بكلب يلهث، يأكل الثرى من العطش،[1] فقال: لقد بلغ هذا مثل الذي بلغ بي، فملأ خُفَّه ثم أمسكه بفيه، ثم رقي فسقى الكلب، فشكر الله له فغفر له)).

قالوا: يا رسول الله، وإن لنا في البهائم أجرا؟

قال: ((في كل كبد رطبة أجر)).[2]

واتە: ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: جارێك پیاوێك بە ڕێگایەكدا دەڕۆیشتو لە ڕێگا زۆر تینوی بو، بیرێكی پێگەیشتو چوە خوارەوەو تێر ئاوی خواردەوە.

پاشان هاتە دەرەوەو بینی وا سەگێك لە پاڵ بیرەكەدا هەناسەبڕكەیەتیو خۆڵ دەخوات لە تینواندا.

ئەمیش بە خۆی وت: وا دیارە من چیم بەسەر هاتوە لە تینوێتی بەسەر ئەم سەگەش هاتوەو (وەك من تینویەتی).

پاشان چوە خوارەوە بۆ بیرەكەو پێڵاوەكەی پڕ كرد لە ئاو بە دان گرتیو بە دەستەكانی هاتە سەرەوەو خستیە بەردەمی سەگەكەو تێر ئاوی خواردەوەو خوایش لەسەر ئەو كارەی سوپاسی كردو لێی خۆش بو.

هاوەڵان (خوایان لێ ڕازی بێت) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆچی لە ئاودانو نان دان بە گیانلەبەران پاداشتی لەسەرە؟

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: لە هەمو زیندەوەرێكدا ئەجرو پاداشت هەیە.

---

١ رواه البخاري (٢٣٦٣) ومسلم (٢٢٤٤).

٢ لە ڕیوایەتی مسلم (٢٢٤٥)دا دەفەرموێت: ((رأيت كلباً في يوم حار يطيق ببئر، قد ادلع لسانه من العطش)).

# چیرۆکی نۆزدەیەم

## سەگێکی تینو

بیابانێکی گەرمو وشكو بێ ئاو.. پیاوێکی باوەڕداری خواناس بۆ گەشتێك لە ماڵ دەرچو.. ڕێگەی ئەو بیابانەی گرتەبەر..

پاش تێپەڕبونی ماوەیەکی زۆر (تینوی بو) دەستی برد بۆ زەمزەکەی‌و بردی بۆ دەمی‌و قومێکی لێداو وتی:

+ بە ڕاستی لەم بیابانەدا.. هەمو سامانی دنیا هی تۆ بێت.. قومێك ئاو ناهێنێت، قومێکی تری خواردەوە وتی: ئای پەروەردگارم ئاو چەند خۆشە.. سوپاس لەسەر بەخشینی ئاو.. خۆزگەم بەوە نەبێت لە بیابانـدا پێ بگیرێت‌و ئاوی لێ ببڕێت.. زەمزەمەکەم ئاوی تیا نەما..

قەیناکا لەودیوەوە کانیاوو بیری لێیە پڕی دەکەمەوە.. با بڕۆم تا شەوم لێ نەهاتوە.. یاللە.

پیاوەکە ماندوو شەکەتەو لە دورەوە دیارە وا دەڕوات.. هەنگاوەکانی تێك چوەو قاچەکانی لەگەڵی نایەن..

پیاوەکە سەیرێکی ئەملاولای خۆی کردو پاشان وتی: باشە خۆ من لێرەوە تێپەڕیوم‌و جاران بیرێکی لێ بو..

+ ئادەی با کەمێك ئاو بخۆمەوە.. زەمزەمەکەی برد بۆ دەمی قەترەیەك ئاوی تێدا مابو.. خواردیەوە تا دەستی بگرێت زەمزەمەکەی فڕێداو هەستاو ڕۆی..

چاوی دەگێڕا ئاسەواری بیر لە هیچ کوێدا نەبو.. وردەوردە ورەی نەماو هێزی ئەژنۆی شکاو تینوێتی زۆری بۆ هێنا.

بە دەم ڕۆشتنەوە دەیوت: ئای پەروەردگارم ئەوەی لێی دەترسام بەسەر خۆم هات.. قورگم وشك بو.. هێزم تیا نەما..

ماوەیەکی تر ڕۆیشت‌و پاشان کەوت‌و پاڵی دا بە بەردێکەوە.. توانای جوڵەی نەما..

داوای کرد لە خواو وتی: خوایە بگەرە فریام ئەی فریادڕەس.. لەم بیابانەدا لە تینواندا نەمرم.. گەروم وشك بو پەروەردگار.. بگە فریام (یا مغیث اغثني.. یا مغیث اغثني)..

لە دورەوە چاوی کەوت بە بیرێك.. لە خۆشیاندا بەرەو ڕوی ڕای کردو لە ڕێگا دەکەوتو هەڵدەسایەوە تا سەرەنجام گەیشتە بەردەمی بیرەکەو ماچی دارو بەردی بیرەکەی دەکردو پێدەکەنی..

سەیرێکی ناو بیرەکەی کرد دەبینێت بریقەی ئاو دای لە چاوەکانیو دەستی بەرزکردەوە بۆ ئاسمانو سوپاسی پەروەردگاری جیهانی کرد..

پاش کەمێك حەوانەوە هەستاو چوە خوارەوە بۆ ناو بیرەکەو لەوێ تێرو پڕ ئاوی خواردەوەو هەناسەیەکی خۆشی هەڵمژیو سوپاسی پەروەردگاری کردو پاشان دەستی گرت بەم بەرو ئەو بەری بیرەکەوەو هاتە سەرەوە..

کاتێك هاتە سەرەوە.. دەبینێت سەگێك نوزەنوزیەتی لە تینوانداو ئەوەندە تینویەتی زمانی وشك بوەو خەریکی خۆڵ خواردنە لە تینواندا..

سەیرێکی کردو وتی: ئای خوایە، هەرچی سەیر دەکەم.. چی بەسەر من هاتوە بەسەر ئەم سەگە بەستەزمانەشدا هاتوە.. ئێستا دەزانم ئەو داماوە لە چ حاڵێکدایە..

بە خوا وا باشە بچمە ناو بیرەکەو پێڵاوەکەم پڕ بکەم لە ئاو بۆی بێنمە سەرەوەو تێر ئاوی بکەم.. بەستەزمانە. هیچ چارەیەکی نیەو ئەگەر ئاوی نەدەمێ لە تینواندا دەمرێت.

دوبارە چوە ناو بیرەکەو تاکی پێڵاوەکەی پڕ کرد لە ئاو گرتی بە دەمیەوەو بە دەستەکانی هاتە سەرەوەو لەبەردەمی سەگەکەدا دایناو ئەویش پەلاماری داو تێرتێر ئاوی خواردەوە..

دەستی کرد بە کلکە لەقەو بە دەوری پیاوەکەدا دەهات وەك ئەوەی بڵێ ئەگەر زمانی قسەم هەبوایە.. تێرتێر سوپاسم دەکردی..

پیاوەکە سەیرێکی کردو وتی: تێ دەگەم بەستەزمان منیش وەك تۆ بوم پێویست بە سوپاس ناکات. هەردوکمان سوپاسی خوا دەکەین ئەم بیرەی پێ نیشان داین.

خوای گەورەیش بەو دیمەنە پڕ لە سۆزو میهرەبانییەی ئەو پیاوە زۆر خۆشحاڵ بو سوپاسی کردو لە پاداشتیدا لێی خۆش بو..

## پەندو ئامۆژگاریەکانی ئەم چیرۆکە

١ـ مرۆڤ لە ژیاندا توشی ناڕەحەتیو نەهامەتی دەبێت بۆیە دەبێ زۆر خۆگر بێتو بێ هیوا نەبێتو بەردەوام لە گەڕاندا بێتو خوایش لە بیری ناکاتو فریای دەکەوێت.

٢ـ مرۆڤ ئەگەر کەسێکی هەژارو نەداری بینی، یەکسەر بەزەیی پێدا بێتەوەو بڵێ منیش کاتی خۆی ئاوا بومو دەزانم حاڵی چەند ناخۆشەو دەستی هاوکاری بۆ درێژ بکات.

٣ـ بەزەیی هاتنەوە بە گیانداراندا یەکێکە لە سیمای جوانی بەرنامەی ئیسلامو هانی شوێنکەوتوانی دەدات تا وەك دوژمن سەیریان نەکەن بەڵکو بە گیانێکی پڕ لە بەزەییەوە بۆیان بڕواننو پێیان پێدا نەنێنو هێلانەیان تێك نەدەنو نەیاننێنەوە بە نیشانەو هەوڵی کوشتنیان نەدەن مەگەر زیانبەخشو زیانەخۆرەکان نەبێت کە شەریعەتی پڕ لە دادی ئیسلام ڕێگای کوشتنی داون.

٤ـ دەبێ مرۆڤی موسڵمان ترسنۆكو شلو شێواو نەبێت بەڵکو دەبێ کەسێکی ڕۆح سوكو گورجو گۆڵو وەرز شەوان بێت.. وەك ئەو پیاوەی کە ئازایانە خۆی شۆڕکردەوە بۆ بیرێك لە بیاباندا کە لەوانەیە لە (٥٠) مەتر زیاتر بوبێت چونکە لەوێ ئاو زۆر لە خوارەوەیە.

٥ـ ئەگەر هاتو کەسێك یارمەتی هەژارێك یان لێقەوماوێك یان ئاژەڵێکی دا لە لاتدا تۆ زۆر خۆشحاڵ بەو دەستخۆشی لێ بکەو پاداشتیشی بەرەوە ئەگەر پێت کرا.

٦ـ دیارە بەزەیی هاتنەوە بە گیانداراندا و خۆشویستنیانو ئازارنەدانیانو ئاوو خۆراك پێدانیان.. شتێکی زۆر تازە بو ئیسلام هێنایو لەوەوبەر هەر کەس چۆنی بویستایە لە گیاندارانیان دەکوشتو دەیاننانەوە بە نیشانە، یاسایەك نەبو مافی ئاژەڵ دەستەبەر بکات.

بەم کارە ئیسلام لە پێش ئەوروپاوە بە چواردە سەدە مافی ئاژەڵی دەستەبەر کردو هەڕەشەی گەورەی لەو کەسانە کردوە کە ئازاری گیانداران دەدەن.

ئەمەش بە پرسیاری هاوەڵاندا بۆمان دەردەکەوێت کە پرسیاریان کرد کە ئایا پاداشتمان هەیە لەسەر ئاژەڵان!؟..

## القصة العشرون
## القاتل الجنيُّ

عن أبي سعيد الخدري (رضي الله عنه) أن النبي (ﷺ) قال: كان فيمن كان قبلكم رجل قتل تسعة وتسعين نفسا. فسأل عن أعلم أهل الأرض فدل على راهب فأتاه فقال: إنه قتل تسعة وتسعين نفسا. فهل له من توبة؟

فقال: لا. فقتله. فكمل به مائة. ثم سأل عن أعلم أهل الأرض فدل على رجل عالم. فقال: إنه قتل مائة نفس. فهل له من توبة؟

فقال: نعم. ومن يحول بينه وبين التوبة؟

انطلق إلى أرض كذا وكذا. فإن بها أناسا يعبدون الله فاعبد الله معهم. ولا ترجع إلى أرضك فإنها أرض سوء.

فانطلق حتى إذا نصف الطريق أتاه الموت. فاختصمت فيه ملائكة الرحمة وملائكة العذاب.

فقالت ملائكة الرحمة: جاء تائباً مقبلاً بقلبه إلى الله. وقالت ملائكة العذاب: إنه لم يعمل خيرا قط.

فأتاه ملك في صورة آدمي. فجعلوه بينهم. فقال: قيسوا ما بين الأرضين. فإلى أيتهما كان أدنى، فهو له. فقاسوه فوجدوه أدنى إلى الأرض التي أراد. فقبضته ملائكة الرحمة)).[1]

واتە: ئەبو سەعیدی الخدری (خوای لێ ڕازی بێت) لە پێغەمبەرەوە دەگێڕێتەوە (ﷺ) کە فەرمویەتی: لە سەردەمەکانی پێش ئێوە پیاوێك هەبو..

(٩٩) کەسی کوشتبو.. پاشان پرسیاری زاناترین کەسی سەر زەوی کردو لە وەڵامدا (راهب)ێکیان پێ پیشانداو چو بۆ لای.

پێی وت: کە (٩٩) کەسی کوشتوە ئایا بۆی هەیە تەوبە بکات؟

---

١ رواه مسلم (٢٧٦٦).

ڕاهیبەکەش وتی: نەخێر.. ئەویش (لە داخا) ئەو ڕاهیبەی کوشتو کردی بە (١٠٠) کەس..

پاشان دوبارە پرسیاری کردەوە دەربارەی زاناترین کەسی سەر زەویو خەڵکەکەش زانایەکیان پێ پیشانداو (چو بۆ لای)و پێی وت: کە سەد کەسی کوشتوە ئایا بۆی هەیە تەوبە بکات؟

زاناکەش وتی: بەڵێ، جا کێ ڕێی تەوبەکردن دەگرێت؟ بەڵام (ئێرە بەجێ بێڵە)و بڕۆ بۆ فلان ناوچە کە خەڵکانێکی لێیە خوای گەورە دەپەرستن، و تۆش لەگەڵ ئەواندا هواناسی بکە، و جارێکی تر مەگەڕێرەوە بۆ ناوچەکەی خۆت چونکە زەویەکی خراپەکاریە.

ئەویش (بەگوێی کرد)و بەرەو ئەو ناوچەیە کەوتەڕێو لە ڕێگا گیانی سپارد.

فریشتەی چاکەنوسو فریشتەی خراپەنوس ناکۆکی کەوتە نێوانیان، فریشتەی چاکە وتی: تەوبەی کردوەو بەرەو خوا گەڕاوەتەوە.

بەڵام فریشتەی گوناهنوس وتی: تەنها چاکەیەك چیە نەیکردوە لە ژیانیدا.

فریشتەیەك لە شێوەی ئادەمیەکدا هاتە نێوانیانو ئەوانیش کردیان بە ناوبژیوان.

ئەویش وتی: ئەو دو ماوەیە بپێون بزان ئەو ڕێگەیەی لێ هاتوە نزیکترە یان ئەو ڕێگایەی کە بۆی دەڕوات، ئەوانیش پێوانەیان کردو دەبینن لەو ناوچەیە نزیکترە کە بۆی دەڕوات (یەك بست).

فریشتەی چاکەنوس حسابی بۆ کرد.

## پەندو ئامۆژگاریەکانی ئەم چیرۆکە:

١ـ دور نیە خراپترین کەس، کە پیاوکوشتن‌و دزی‌و تاوانی تریش نەمابێ نەیکات، لە پڕ بیربکاتەوەو سنورێ بۆ خراپەکانی دابنێ خوای بکەوێتەوە بیرو بڵێ ماڵم کاول بوە چیم بە خۆم کردوەو تەوبەیەکی پاك‌و جوان بکات.

٢ـ هەر کەسێ لەناو تاوان‌و گوناهدا گەوزابو، شایانی بەزەیی پیاهاتنەوەیە نەك زەمکردنی‌و سلاوی لێ نەکردنی‌و سەردانی نەکردنی‌و ڕق لێ هەلگرتنی..

چونکە لەوانەیە وەك ئەو پیاوەی (١٠٠) کەسەکەی کوشتەوە لە ناکایەکدا دەست هەلگرێ لە تاوان‌و لەگەلّ خوای خۆیدا ئاشت بێتەوە.

٣ـ هەمیشە کۆمەلگە زاهیر بینەو تاقەتی ئەوەی نیە بچێتە بنج‌و بناوانی مەسەلەکان‌و بە دوای ڕاستیەکاندا بگەڕێت‌و زۆر جار هەندێ کەس بە زاناو ئەولیا تێ دەگات کاتێك دەبینێت عەمامەیەکی گەورەی لەسەر دایەو کتێبێکی گەورەی لە بن دەستدایەو دەبینن خواناسی‌و پەرستش دەکات.

ئیتر ئەو کەسە بە زاناترین کەسی سەردەم دەدەنە قەلّەم‌و دەیانناسێنن بە نەوموسلّمانان‌و تازە گەڕاوەکان‌و تەوبەکاران.. نازانن کە لەوانەیە بەبێ زانست‌و زانیاری فەتوای شازو بێ بەلگە ڕەئیان بۆ بدەن‌و مالّ کاولیان بکەن.

٤ـ لە تاوانبارو سەرپێچیکاران بترسەو خۆتیان لێ بپارێزە با بۆ تەوبەکردن‌و وازهێنان هاتبن بۆ لات، چونکە بە نیازن خۆیان چاك بکەن‌و هێشتا پاك نەبونەتەوە سیقەیان پێ مەکەو خۆت‌و نهێنی کارەکان مەخەرە دەستی.. با وەك موفتی یەکەمت لێ نەیات.

٥ـ دەبێت مرۆڤ کە لە شوێن‌و لە لای کەسێك ئاوات‌و داواکاریەکانی نەهاتە دی هەولّ بدات لە لای یەکێکی ترو لایەنێکی دی نیازەکانی بهێنێتەدی.

نابینی ئەم پیاوە تاوانبارە چونکە ڕاست دەکات کۆلّی نەدا زانایەکی تری دۆزیەوە.

٦ـ هەرچیەکت کردوە هیواو ئەمەل دروست بکە بۆ خەڵکانی دەوروبەرتو هانیان بدە بەرەو پێشەوە بڕۆنو سارد نەبنەوە نەکەی وەك مفتی یەکەم کە (عابدێکی جاهل) بو لە ڕوی شەرعیەوە بۆیە بە جۆرێك ئەمەلی لە تاوانبارەدا کوشت کە وتی ئەگەر لێم خۆش نەبێت دەیکەم بە سەد.

٧ـ نەخشەی کار دیاری بکە بۆ چواردەورەکەتو بە دو وشە پاڵی پێوە مەنێو بڵێی: بەڵێ تەوبەت بۆ هەیەو بەس، بەڵکو خۆیشت دەرسی بۆ دابنێو یان بینێرە دەستی کەسانی شارەزاو متمانەدار تا لە ئاینی پیرۆزی ئیسلام جوانتر ئاشنای بکەن یان بینێرە بۆ ناو کەشوهەوایەکی پڕ لە باوەڕو موسڵمانەتی.

٨ـ زۆر گرنگە بۆ بانگخوازو مامۆستاکان کە پەروەردەی خەڵکی دەکەن، هەوڵ بدەن ئەو تازە هاتوانە لەو بیئەو کەشوهەوایەی پێشو بیانپچڕێننو هاوڕێی تازەو بیئەی تازەیان بۆ بڕەخسێنن.

٩ـ زۆر گرنگە مرۆڤ لە ژیاندا بیەوێت هەڵکەوێتو ناو دەر بکاتو ببێتە کەسێکی ڕیزی پێشەوە دەبێت دور بکەوێتەوە لە زێدەکەی خۆیو بچێتە ناوچەیەکی تر..

چونکە خەڵکی زێدەکەی بە پێی پێویست ڕێزی ناگرنو سودی لێ وەرناگرنو شەرمی لێ ناکەنو پرسی پێ ناکەنو هەر بە منداڵەکەی ساڵانی زو دێتە بەر چاویانو گرنگی پێ نادەن.

١٠ـ زۆر ئاساییە لە ژیاندا دەیان ناکۆکیو عاجزیو ڕای جیاواز بکەوێتەوە نێوان تۆو هاوکارەکانی چواردەورت بەڵام مەرج ئەوەیە ئەوەندە یەکترتان خۆش بوێت کە نەبێتە ڕقەبەرایەتیو پاشقولدان لە یەکتری، بەڵکو خێرا بگەنە ئەنجامێکی جوانو بە ناوبژیوانی ڕازی ببەو لە قسەکانی لا مەدە چونکە دەیەوێت بۆچونەکانتان بگەیەنێتەوە یەك.

١١ـ خۆ فریشتەی چاکە دەیزانی بەشی ئەوە چونکە کەسێکی تەوبەکارو پەشیمانەو وازی لە هەمو خراپەیەك هێناوە.. بەڵام لەبەر دڵی هاوڕێکەی کە زویر نەبێت لێی.. وتی: با حەکەمێك بگرین بزانین بۆ کاممان دەبێت!

# القصة الحادية والعشرون
## رسالة من خَشَبْ

عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ): ((إنّ رجلا من بني إسرائيل، سأل بعضهم بني إسرائيل أن يسلفه ألف دينار، فقال: ائتني بالشهداء أشهدهم.

فقال: كفى بالله شهيدا، قال فأئتني بالكفيل، قال: كفى بالله كفيلا، قال: صدقت.

فدفعها إليه إلى أجل مسمى، فخرج في البحر فقضى حاجته ثم التمس مركبا يركبها يقدم عليه للأجل الذي أجله، فلم يجد مركبا، فأخذ خشبة فنقرها، فأدخل فيها ألف دينار وصحيفة منه إلى صاحبه، ثم زجج موضعها، ثم أتى بها إلى البحر.

فقال: اللهم إنك تعلم أني تسلفت فلاناً ألف دينار، فسألني كفيلا فقلت: كفى بالله كفيلا، فرضي بك، وسألني شهيدا فقلت: كفى بالله شهيدا، فرضي بك.

وأني جهدت أن أجد مركبا أبعث إليه الذي له فلم أجد، وإني أستودعكها، فرمى بها في البحر حتى ولجت فيه، ثم انصرف.

وهو في ذلك يلتمس مركبا يخرج إلى بلده، فخرج الرجل الذي أسلفه، ينظر لعل مركبا قد جاء بماله، فإذا بالخشبة التي فيها المال، فأخذها لأهله حطبا، فلما نشرها وجد المال والصحيفة، ثم قدم الذي كان أسلفه.

فأتى بالألف دينار، فقال: والله ما زلت جاهدا في طلب مركب لآتيك بمالك، فما وجدت مركبا قبل الذي أتيت فيه.

قال: هل كنت بعثت إلي بشيء؟ قال: أخبرك أني لم أجد مركبا قبل الذي جئت فيه.

قال: فإن الله قد أدى عنك الذي بعثت في الخشبة، فانصرف بالألف دينار راشدا)).[١]

واتە: ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: پیاوێك لەناو بەنی ئیسرائیلدا، داوای هەندێ پارەی قەرزی کرد لە هەندێ لە بەنی ئیسرائیلیەکان..

---

١ رواه البخاري (٢٢٩١)، صحيح قصص الرسول (٦٤/١).

ئەویش وتی: شایەت بێنە تا بیانکەم بە شایەت؟ پیاوەکەش وتی: خوای گەورە بەسە بیکەم بە شایەت، پاشان وتی: دەی کەفیلێك بێنە تا بچێتە ژێر باری ئەو قەرزەوە؟ وتی: خوای گەورە بەسە بیکەم بە کەفیل، ئەویش وتی: دەی ئەوا قەبوڵم کرد.

کابرا پارەکەی پێدا بۆ ماوەیەکی دیاریکراو، گەشتێکی دەریایی پێ کرد پارەیەکی باشی قازانج کرد.

پاشان چو بۆ کەنار دەریا تا بەلەمێك یان کەشتیەك ببێتو پێی بڕوات بۆ ئەوبەرەوەو پارەی قەرزەکە بەرێتەوە بۆ خاوەنەکەی، بەڵام زۆر وەستاو بەلەمی لێ نەبو..

هەروا مایەوەو تا بیری لە دارێکی گەورە کردەوەو ناوەکەی هەڵکۆڵیو هەزار دینارەکەی تێکرد لەگەڵ نامەیەکداو پاشان کونی دارەکەی جوان داخستەوەو دای بە دەم ئاوەکەوە.

وتی: ئەی خوای پەروەردگارم تۆ ئاگاداری منی هەزار دینارەکەم لە فلان کەس قەرز کردو داوای کەفیلی لێ کردم، وە بە کەفیلی تۆ ڕازی بو، پاشان داوای شایەتی لێ کردمو وتم: خوا بەس نیە بە شایەت؟ وتی: بەڵێ ڕازیم خوا شایەت بێت.

وە من زۆرم هەوڵ دا تا بەلەمێك پەیدا بکەمو پارەکەی بۆ بەرمەوە بەڵام دەستم نەکەوت، دەی من ئەیدەمە دەستی تۆ، و ئەمەی وتو دارەکەی دا بە ئاوەکەدا وەستا هەتا لە چاو ون بو ئینجا گەڕایەوە بۆ ماڵ.

هەر دوای ئەوەش چاوەچاوی ئەوەی بو کە کەی بەلەمێکی دەست بکەوێتو پارەکەی بۆ بەرێت..

ئەو پیاوەی تریش کە قەرزەکەی پێ دابو.. لەبەر خاتری سۆراغ کردنی کابراو بەڵکو لە کەناری دەریا ببینێتو پارەکەی پێ بداتەوە..

زۆر چاوەڕوانی کرد بەڵام کابرا دیار نەبو.. بەڵێنەکەی نەبردە سەر، بەڵام چاوی بە دارێکی ئەستور کەوت.. هاتە بەردەمیو ئەویش هەڵی گرتو بردیەوە بۆ خێزانی تا بەکاری بێنێت بۆ سوتاندن.. لە ماڵەوە دارەکەی داگرتو ویستی وردی بکات هەر کە تەورەکەی لێدا بو بە دو کەرتەوە دەبینێ هەزار دینارەکەو نامەیەکی تێدایە.

پاش ماوەیەك پیاوەكە بەلەمی دەست كەوتو بە خێرایی خۆی گەیاندە پیاوەكە، هەزار دیناری دایە دەستی وتی: بە خوا چەند ڕۆژێكە من ئەوپەڕی هەولّم داوە بەلەمم دەست بكەوێت پارەكەت بۆ بێنمەوە، بەلاّم تا ئەمجارە دەستم نەكەوت.

پیاوەكە وتی: تۆ پێشتر هیچێ لە پارەكەت بۆ ناردم؟ ئەویش وتی: من پێت دەلّێم بەلەمم گیر نەكەوت تا ئەمجارەی كە هاتوم بۆ لات.

پیاوەكەش (بە خۆشحالّیەوە) وتی دەی خوای پەروەردگار هەزار دینارەكەی كە لە ناو تەختەكەدا بۆت ناردم گەیشتە دەستمو تۆش هەزار دیناری خۆت بەرەوە..

# چیرۆکی بیستو یەکەم

## نامەیەك لە تەختە

ئەم پیاوە پیاوێکی بازرگان بو، لە هەمو گەشتە بازرگانیەکانیدا سەرکەوتنی بە دەست دەهێناو قازانجی باشی دەکرد.. بەڵام جارێك جەردە پەیدا دەبێت لە کەشتیەیو هەمو سامانەکەیو شتومەکەکانی تیاچو، هەژار کەوت...

بۆیە وتی: ئای خوای گەورە.. سوپاست دەکەم لەسەر هەمو خۆشیو ناخۆشیەك.. ئای خوای گەورە من کەی ئاوا هەرگیز دەستەباچەو بێ پارە بوم..

کوڕ: بابە گیان ئیتر کاری بازرگانی ناکەین؟

باوك: کوڕم من بەبێ بازرگانی ناتوانم بژیم.. بەڵام یەك دەرهەمم بۆ دەرنەچوە.. بازرگانیش بەبێ پارە ناکرێت..

کوڕ: ئەی ناتوانی لە لای یەکێك هەندێ پارە قەرز بکەیت..

باوك: کوڕم من پارەیەکی زۆرم دەوێت بۆ ئەوەی خۆمی پێ بگرمەوە تەنها یەك کەس شك دەبەم ئەو پارەیەی هەبێت.. بەڵام ئێستا زانیویەتی من تاپول بوم.. قەرزم بداتێ باشە.

کوڕ: باوکە پشت ببەستە بە خواو بڕۆ داوای بکە لێی.. هەمو لایەك خواناسیو ڕەوشتی جوانی تۆ دەناسن..

باوك: کوڕم یاخوا کەس باری لار نەبێت... بەڵام ئەمڕۆ (إنشاء الله) دەچم بۆ لای بەڵکو هەزار دینارم بە قەرز پێ بدات.

پاش ئەوەی داوای قەرز لە هەندێ کەس دەکاتو دەست دەنێن بە ڕویەوە بازرگانە پیاو چاکەکە دەگاتە ئەو پیاوەی کە دەیەوێت قەرزی لێ بکات، سڵاوی لێ دەکاتو هەواڵی دەپرسێتو دەیەوێت داوای قەرزی لێ بکات بەڵام ئەو پێشتر دەڵێ:

براکەم زۆرم پێ ناخۆش بو، بازرگانیەکەت کەوتە دەستی چەتەکانو چەپاویان کردی..

خوا گەورەیە.. خوای گەورە ڕۆزی دەرەو هەر ئەویشە دەیگرێتەوە.. بەلام من پێم وایە هەمو کارەکانی خوا لەسەر نەخشەو بۆ حیکمەتێك ئەنجامی دەدات..

هەمو دەبێت لەوە بێگومان بین.. ئەی ئێستا نیازت چیە؟ دەتەوێت چی بکەیت؟

+ ئەگەر پارەم کەوتە دەست.. دەست دەکەمەوە بە بازرگانی دەلێن لۆکە پارە چاك دەکاتو نرخی بەرز بۆتەوە.. ئەرێ تۆ بێ زەحمەت هەزار دینارم بە قەرز پێ نادەیت؟ بۆ ماوەیەکی کەم.. بە خوا تەنها لە تۆم ڕابینی کە داوات لێ بکەم.

ـ وەك چەندی؟

+ وەك دو مانگ.

ـ بەلام هەزار دینار زۆرە لەوانەیە شتومەکەکانت بەو ماوە کورتە نەفرۆشرێتو نەتوانیت بیدەیتەوە.

+ لە من مەترسە.. ئەو ماوەیە بۆ من زۆرزۆرە چونکە من زۆر شاران گەڕاومو کڕیاری شمەکەکانم حازرن..

ـ من ئامادەم ئەو پارەیەت بدەمێ ئەگەر دلت هیچ نەکات شایەت بێنە با ئاگاداری عەقدەکە بێت..

+ جا شایەت لە کوێ بێنم.. من لەوبەری دەریاکە دەتوانم شایەت پەیدا بکەم بەس لێرە قەناعەتم نیە دەستم بکەوێت.. ئەی چۆنە خوا بکەم بە شایەت؟ قبولتە؟

ـ گیانم بە ساقەی خوا بێ.. ئەمن حەدم چیە قەبولی نەکەم بە شایەتو بەلێ ڕازیم.. بەلام کەفیلێکشیم دەوێت کە بچێتە ژێر ئەم قەرزەوە.

+ برای بەڕێزم.. من دەلێم شایەتم دەست ناکەوێت.. ئەوە کەفیل هەر دەستت ناکەوێت، بەلام ئەگەر قەبولت بێت خوای پەروەردگار دەکەم بە کەفیلی خۆم.

ـ جا چی لە خوا باشترە بکرێت بە کەفیل؟، ئەوا قەبوڵم کرد. کیسەیەك پارەی لە قاسەی دوکانەکەی بۆ دەردەهێنێتو دەیداتە دەستی..

+ زۆر سوپاس، برای هاوبیرم.. زۆر مەمنونتمو هەوڵ دەدەم لە ماوەی دو مانگدا دوای نەخەمو بۆت بنێرمەوە.. دەی خواحافیز.

ـ خوات لەگەڵ.

*　　　*　　　*

پاش ئەوەی لۆکەیەکی زۆری کڕیو خستیە کەشتیو بەرەوە شارو وڵاتەکانی تر خستیەڕێ، و لەوێ فرۆشتیو پارەیەکی باشی قازانج کردو دوجارو سێ جار کاڵای تری کڕیو فرۆشی وەك جاری جارانی لێ هاتەوە.

بەڵام بیری کەوتەوە کە دو ڕۆژی ماوە بۆ کاتی دانەوەی قەرزەکەیو خێرا خۆی گەیاندە کەناری دەریاکە، چاوەچاوی ئەوەی دەکرد بزانێ بەلەمێك حازر بێت تا بچێتە ئەوبەری ڕوبارەکەو پارەکەی بداتەوە بە خاوەنەکەی.

بە هەر خاوەن بەلەمێکی دەوت خێرا جوابیان دەکردو دەیانوت: ئەمڕۆ باو بارانو زریانەو کار ناکەین..

+ بۆ خاتری خوا! زۆر زەرورە بچمە ئەو بەرەوە.. ئەگینا خیلاف وەعد ئەبمو متمانە لە دەست دەدەم.

بەلەمەوان: برا گیان خۆت ماندو مەکە تا سێ ڕۆژی تریش بەلەم ناخرێتە دەریاوە چونکە شەپۆلەکان بەلەمەکان هەڵدەگێڕنەوە سەرنشینەکانی دەخنکێن.. ئێمە مەجبور نین خوێنی بکەینە ملی خۆمان..

+ ئەی چی بکەم! چارم چییە؟ چۆن ئەو پارەیە بنێرمەوەو کەسیش نیە؟ هەزار دینارە..

بەلەمەوان: کاکە ئەمڕۆ مەوەستەو بێ سود وەختی خۆت بە زایە مەدە بەڵام سبەینێ وەرەوە بەڵکو بارانو زریانەکە نەمێنێو دەریا هێمن بێتەوە.

(پیاوەکەش بە خەفەتو نائومێدیەوە بەرەو ماڵ گەڕایەوە).

شەو لە خەودا پیاوەکە هاتە خەوی پێی دەوت: بەیانی دوایین مۆڵەتتەو هەزار دینارەکەم بۆ بێنەوە.. زۆر پێویستم پێیەتیو کاڵای زۆرم کڕیوە، قەرزارم نەکەی دوای بخەیت.. تۆ خوات کردوە بە شاهید، تۆ خوات کردوە بە کەفیل!! زۆر ترسناکە ها... ئەویش پێی وت:

+ ئەمڕۆ هاتم بۆت بهێنمەوە بەڵام بەلەم نەبو بمگەیەنێتە ئەوبەرەوەو ئەگەر بارانو ڕەشەباو زریان بهێڵێت (ان شاء الله) بەیانی دەیخەمەوە خزمەتتو پارەکەت حازرەو لە گیرفانمایە..

پیاوەکە خەبەری بویەوەو وتی: (لا اله الاّ الله) خوایە بەخێری بگێڕی خوایە یارمەتیم بدە بەیانی بڕۆمو ئەو پارەیە بەرمەوە بۆی..

هەستاو چو سەیرێکی ئاسمانی کرد بەڵام هەر بارانو ڕەشەبا بەردەوام بو، بۆیە دەستنوێژێکی گرتو چوە ناو نوێژێکی قوڵ..

کە ڕۆژ بویەوە یەکسەر کیسە پارەکەی خستە گیرفانیو بەرەو کەناری ڕوبار کەوتەڕێو لەوێ هەواڵی بەلەمی پرسی بەڵام کەس کاری بە بەلەمەکانیان نەدەکرد.

چو بۆ لای بەلەمەوانێكو لێی پاڕایەوە بەڵام بێ سود بو..

بۆیە پێی وت: چەند دەڵێی دەتدەمێ بەڵام بمکەرە بەوبەرەوە، ئەگەر خنکایشم خۆم بەرپرسم. چونکە خیلاف وەعدەبم..

بەلەمەوان پێکەنیو وتی: کاکە خۆ بە دەست خۆت نیە؟ جەوەکە تەڕو توشەو ئەویش ئەزانێ خۆ بەشەرەو هەستی هەیە... بچۆرەوە بۆ ماڵ.

پیاوەکە تا درەنگێ هەر وەستا بەڵام کەس هاتوچۆی نەدەکرد بۆیە بیرێك هات بە خەیاڵیداو بە دەم خۆیەوە وتی:

((ئەی پەروەردگارم.. خۆت دەزانی من ناتوانم ئەمڕۆ پارەکەی بۆ بەرمەوە ئەگەر قەرزار نەتوانێت قەرزەکە لە کاتی خۆی بەرێتەوە بۆ خاوەنەکەی کەفیلەکەی خەمی دەخوات..

دەی خوایە تۆ شاهیدی منی.. تۆ کەفیلی منی.. ئەی خۆشەویستم.

گەڕا تا کورتە دارێکی ئەستوری کەوتە بەر چاو لە کەنار ئاوەکەدا هەڵیگرتو بردی بە چەقۆ ناوەکەی هەڵکۆڵیو هەزار دینارەکەو نامەیەکی تێکردو پاشان هەر لەو ناوەدا هەندێ مادەی دەستکەوتو کونەکەی پێ قەپات کردەوەو دای بە ئاوەکەداو تا لە چاو ون بو هەر سەیری دەکردو دەیوت:

ئەی پەروەردگارم تۆ دەزانی کە من هەزار دینارم لە فلان کەس قەرز کردو داوای شایەتیەکی لێ کردمو منیش تۆم شك بردو کردمیتە شایەتو پاشان داوای کەفیلی لێ کردمو منیش تەنها تۆم شك بردو کردمیتە کەفیلو ئەویش بە تۆ ڕازی بو..

بەلام زۆر هەوڵم دا لە کاتی خۆیدا بۆی بەرمەوە بەلام بەلەمم دەست نەکەوت، دەی دەسپێرم بە تۆ... لە هەمان کاتدا خاوەنی قەرزەکە زانی ڕۆژی وەرگرتنی قەرزەکەیەتی ڕۆیشت بۆ کەناری دەریا تا بزانێت پیاوەکە دیار نیەو پارەکەی بۆ نەهێناوەتەوە.. بەلام زۆر وەستا کەس دەرنەکەوت، سەیری کەناری ئاوەکەی کرد کورتە دارێکی ئەستوری بینی دەستی بردو هەڵی گرتەوەو بردیەوە بۆ خێزانی بۆ ئاگر کردنەوە، کاتێك تەورەکەی هەڵگرت لەتی بکات بینی کیسەیەك پارە کەوتە خوارەوەو نامەیەکیشی لەگەڵدایەو نامەکەی خوێندەوە وتی: ئەمە قەرزەکەمەو بۆی ناردومەتەوە، ئەی هەر بژیت چەند سەرڕاستی براکەم.

دوای دوسێ ڕۆژێك بارانو ڕەشەباو زریان دامرکایەوە جیهان ڕوناك بویەوەو باڵندەکانی ناو دەریا بە خۆشیو کەیفەوە مەلەیان دەکردو بەلەوانەکانیش بەلەمەکانیان خستە خزمەتی خەڵکەوە..

بازرگانەکەش هەزار دیناری خستە گیرفانیو سواری بەلەم بو، خێرا دابەزیو خۆی گەیاندە دوکانی پیاوەکەو سلاوی لێکرد.

+ السلام علیکم ورحمة الله.

ـــ وعلیکم السلام ورحمة الله وبرکاته، یاخوا بەخێر بێیت ئەی برای خواناس لە خواترسم.. زۆر خۆشحاڵ بوم بەم سەردانەتو دوکانەکەمت ڕوناك کردەوە.

+ مەبەستت چیە؟ سەردانی چی؟ تۆ چی دەڵێت؟ من پارەكەم بۆ....

ـ دەزانم پارەكەت بۆ هێنامەوە.. بە جوانترین شێوەو زۆر دەستخۆشیت لێ دەكەم كە لە كاتی خۆیدا هێناتەوە.

+ داوای لێبوردن دەكەم بەڵێ؟ ئەوە چی دەڵێت؟ بە خوا ئەوە بۆ هەفتەیەك دەڕوات هەمو ڕۆژێك هاتومەتە كەناری دەریا بەڵام بەلەمم دەست نەكەوت تا پارەكەت بۆ بهێنمەوە.. فەرمو ئەوە هەزار دینارەكەتە..

ـ ئەمە تۆ چی دەڵێی؟ ئەی تۆ هەزار دینارەكەت بۆ نەناردمەوە ماوەیەك لەمەوبەر؟

+ من دەڵێم باران‌و زریان بواریان نەدا بەلەم كار بكات‌و نەمتوانی پارەكەت بۆ بهێنمەوە لە كاتی خۆیدا كەچی تۆ دەڵێی بۆت ناردمەوە لەمەوپێش؟

ـ پیاوەكە بیری كردەوەو تێگەیشت كە ئەمە كاری خوا كردە، بۆیە ڕوی تێكردو پێی وت: یانی هیچت بۆ نەناردوم؟

+ بە خوا بە دەست خۆم نەبو لێم ببورە.. بە هۆی نەبونی بەلەمەوە نەمتوانی پارەكەت بخەمە خزمەتت!..

ـ دەی كەواتە خوای گەورەو پەروەردگار ئەو پارەیەی كە تۆ خستە ناو پارچە تەختەكەوە گەیاندیە دەستم‌و پارەی خۆمم هەر ئەو ڕۆژە وەرگرت كە باران بو.. بۆت ناردم..

+چۆن؟ یانی چی؟ گەیشتە دەستت؟

ـ بەڵێ.. بەڵێ.. ئەی تۆ نەتنارد بۆم؟نامەكە هی تۆ نەبو؟ ئیمزای تۆ نەبو؟

+ با.. با... من لەسەر وەعدی خۆم دام بە ئاوەكەدا.. بەڵام بە تەما نەبوم بگاتە دەستت..

ـ ئەی بۆچی وات كرد؟

+ تا پیشانی پەروەردگارمی بدەم كە من بە دەم پەیمانەوەم‌و پەیمان شكاندن لە لای من گوناهێكی زۆر كەبیرەیە..

ـ دەی خوای گەورە ئاگای لە دڵ‌و دەرونت بو زانی كە ڕاست دەكەیت‌و پیاوێكی بە متمانەی‌و هەر كاتێك پارەكەت پێویست بو.. نە شایەتت لێ داوا دەكەم‌و نە كەفیل.

## پەندو ئامۆژگاریەکانی ئەم چیرۆکە

١ـ قەرزکردن لە نێوان مرۆڤەکاندا شتێکی باشەو خواو پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگەیان پێداوەو شتێکی شورەیی نییە وەك هەندێ بە هەڵە لە ژیان گەیونو وا دەزانن قەرزاری عەیبەیەو دەڵێ لە ژیانمدا قەرزم نەکردوەو نایشی کەم!!.. پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ وەفاتی کرد (درعەکەی) لە لای جولەکەیەك بو لە باتی قەرزدا.

٢ـ هەر مامەڵەیەك یان کڕینو فرۆشتن کرا، با بەبێ شایەت یان کەفیلو بەبێ نوسینو ئیمزای هەردو لا نەکرێتو ئەگەر زیاتر لەوە ترسایت پارەیەکیت دەست نەکەوێتەوە. بیبە بۆ (دادنوس)و لەوێ بە ڕەسمی ئیمزاو مۆری پێ بکە نەوەك پاشان شەیتان زاڵ ببێت بەسەر دەرونیدا یان تێکشان ڕوی تێ بکاتو ئامادەی درۆو ملەجەڕێ ببێتو پارەکەت تیا بچێت.

٣ـ موسڵمان لەسەری فەرزە وەعدی خۆی بەرێتە سەر ئیتر شایەت هەبێت یان نا، بنوسرێت یان بە دەم بێت، چونکە خوای گەورە پرسیارمان لێ دەکات لەسەر پەیمانەکانمان: ﴿إِنَّ ٱلْعَهْدَ كَانَ مَسْـُٔولًا﴾.

٤ـ ئەگەرکاتی دانەوەی قەرز هاتە پێشەوە.. دەبێ هەرچیەکت کردوە لەو ساتەدا بۆی پەیدا بکەیتو ئەگەر هەر نەتبو ماڵی بۆ بفرۆشە یان لە یەکێکی تر قەرز بکە بۆی (بەڵام دەستی دوەمیش نەبڕیت) تا متمانە لەناو مرۆڤەکاندا بمێنێت.

٥ـ هەندێ کەس بە هەڵە تێگەیشتونە لە پەیمان شکاندنو دەڵێ ئەگەر نەتبو بیدەیتەوە، ئەوا وەعد شکاندن نیە!! بەڵکو وەعد شکاندن ئەوەیە کە هەتبێتو نەیدەیتەوە!! ئەمەش یەکێکە لە ناحاڵیبونەکانی شەیتانی (تبلیس إبلیس).

٦ـ دەبێ مرۆڤ بە کەوتنێك یات تێکشکانێك ورەی نەڕوخێتو هەوڵی هەڵسانەوە بداتو مادام عەقڵو مافی کارەکەی تێدایە، دەتوانێت پارە قەرز بکاتەوەو خۆی سەر لەنوێ دروست بکاتەوەو هەڵسێتەوە.

٧ـ ئەگەر ماوەیان بۆ دانایت بۆ دانەوەی قەرز، تۆ (١٠) یان (١٥) ڕۆژ پێش ئەو مەوعیدە هەوڵی پەیداکردنو دانەوەی بدە چونکە با وەك ئەو پیاوەت لێ نەیات کە کێشەی نەبونی بەلەمی هاتە ڕێگەو ئەگەر خوا فریای نەکەوتایەو بەو تەختە دارەدا بۆی نەناردایە (خلاف وعد) دەردەچو.

٨ـ پیاو دەبێت بەردەوام خەمی دەرکردنی پێداویستی ماڵو منداڵەکەی بێتو هاوکاری خێزانەکەی بێت.. غازو نەوتو کارەباو ئاوو هەمو پێداویستیەکانی تریان بۆ پەیدا بکات.

نابینی ئەو پیاوە کۆتەرەیەکی بینی یەکسەر بیری نانو چێشتکردنی کەوتەوەو بردیەوە بۆ خێزانیو لە عەیبیش نەترسا.

٩ـ ئەگەر بۆ کارێکی گەورە چویتو ئەو کارەت دەست نەکەوت بەڵام هەوڵ بدە با بە دەستی خاڵی نەگەڕێیتەوەو شتێك بۆ ماڵو منداڵت بێنەوە وەك ئیمامی عەلی (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: (ئەگەر لە سەفەرێك بێمەوەو هیچ نەبێت بیبەمەوە جگە لە هەندێ لە بەردی سپیو سافی جوان نەبێت دەیبەمەوە بۆ ئەوەی دەستم بەتاڵ نەبێت).

١٠ـ ئەولیاو پیاو چاکانن پێیان ناخۆش بوە خەڵکی بە کەرامەتەکانیان بزاننو هەوڵی شاردنەوەیان داوە..

نابینی ئەو بازرگانە خواناسە چۆن هەر دەڵێ بەلەمم دەست نەکەوت تا پارەکەت بۆ بێنم یانی نەخێر من هیچم نەناردوە بۆت.

١١ـ ئەگەر کەراماتت لە خواناسێك بینی، ئەوە خۆشت بوێتو دڵی خۆش بکەو هاوڕێیەتی بکە، چونکە لەگەڵ خوادا بەینی زۆر تەواوەو دۆستی پەروەردگارە.

بە پێچەوانەی هەندێ کەسەوە کەوا دەزانێ ئەوەی کەرامەتی لێ دەرکەوت دەبێت سوێندی پێ بخورێتو بچیتە سەر گۆڕەکەیو داوای شتی لێ بکەیت یان داوا لە خوا بکەیتو ئەو بکەیتە واسیتەو نێوان (پەنا بە خوا) کە ئەوە بێگومان سەر دەکێشێت بۆ شیرکو بێباوەڕی.

## القصة الثانية والعشرون

## يفتخر بنفسه

عن ابي بن كعب (رضي اله عنه) ان رجلين تفاخرا عند النبي (ﷺ) فقال: احدهما للآخر: انا فلان ابن فلان، فمن أنت لا أم لك؟

فقال النبي (ﷺ):

افتخر رجلان عند موسى (عليه السلام) فقال احدهما: أنا فلان بن فلان حتى عدّ تسعة.

فأوحى الله تعالى الى موسى (عليه السلام) قل للذي افتخر: بل التسعة من أهل النار وأنت عاشرهم)).[1]

واته: ئوبەی کوڕی کەعب (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە، کە دو کەس لە حزوری پێغەمبەردا (ﷺ) شانازیان بە خۆیان‌و باووباپیرانیانەوە دەکردو یەکێکیان بەوی تریانی وت: من فلانی کوڕی فلانم، ئەو تۆ کێیت ئەی بێ بنەچە؟

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: ((دو کەس لە خزمەت موسا پێغەمبەردا (عليه السلام) خۆیان هەڵدەنا بەسەر یەکترداو یەکێکیان بە شانازیەوە بەوی تری وت: من فلانی کوڕی فلانم... تا (٩) پشتی خۆی هەڵدا!!.

خوای گەوریش نیگای نارد بۆ موسا پێغەمبەر (عليه السلام)و فەرموی بەو کەسەی کە شانازی کرد بەسەر ئەوەی تردا: بەڵکو ئەو (٩) پشتەی لەناو ئاگری دۆزەخدایەو ئەویش دەیەمیانە.

---

١ حديث صحيح قال الحافظ العراقي في تخريج الأحاديث (الاحياء) (٣/٥١٩)، اخرجه عبدالله بن احمد في زوائد المسند باسناد صحيح ورواه احمد على معاذ موقوفاً.

# چیرۆکی بیستو دووەم
# بە خۆیدا دەنازێت

گەورەم دوێنێ ئەسپەکەتم ئامادە کرد بۆ ڕاوشکار، کەچی نەڕۆشی گەورە پیاو، ئێمە بە باوباپیر هەر تولەو تانجیمان هەبوەو ئەهلی ڕاو بوین..

قەیناکا تازە سبەینێ دەڕۆم بۆ ڕاوی نێوچیاکان، بۆ دو هەفتە دەڕوات ڕاوم نەکردوە..

ـ گەورەم لەگەڵ کێ دەڕۆی؟

+ لەگەڵ سەرۆك عەشرەتی میران‌و کۆیخای هەردو دێکەی ئەودیومان.. تفاقێکی باش ڕێك بخەن..

مام صالح پیاوێکی هەژارو ڕوخۆش‌و باوەڕدار بو، خانویەکی سادەو ساکاری هەبو تیایدا دەژیاو لەسەر کشتوکاڵو ئاژەڵداری دەژیا، زۆر قانع بو، هەرگیز گلەیی هەژاری خۆی لە لای کەس نەدەکرد.

ڕۆژێکیان لە یەکێك لە وانەکانی موسا پێغەمبەردا (علیه السلام) ئەو دو پیاوە ئامادە بون‌و سەرەتا هەژارەکە زو هاتو دانیشتو گوێی شل کردبو بۆ وتە بە نرخەکانی موسا (علیه السلام).

لەم کاتەدا ژاوەژاوێك دروست بو دەبینین پیاوە ناودارەکە بە خۆی‌و پیاوەکانیەوە هاتن بە زوورداو لە تەنیشتی هەژارەکەوە دانیشتو یەکێك لە خزمەتکارەکانی ئەو کابرایە وتی:

خاڵە گیان لاچۆ برۆ ئەولاوە.. دورکەوە لە تەنیشتی گەورەو ئاغامان دامەنیشە!

هەژار: ئەمە گوێگرتنە لە وتاری پێغەمبەر موساو موسایش وەك یەك بە هەموومان دەبڕێت.. من زوتر هاتومو جێی خۆمە.

ئاغا: ئەوە تۆ دەزانی چی دەڵێی؟ تۆ دەزانی من کێم؟

هەژار: تۆ هەر کەسێك هەبیت بەشەرێکی وەك من‌و هیچ جیاوازیەکمان نیە.. تۆ برۆ ئەولاوە.. لە ئاینی خوادا فەرق‌و سو نیە، خزمەتکارەکە وتی: گەورەم گوێت لێیە چی دەڵێ.. وڕێنە دەکات!

ئاغا: بە دو پەنجە جلەکانی هەژارەکەی گرتو وتی:

تۆیەکی چڵکن کەس نازانێت باوباپیرت کێیەو کوڕی کێیە وەك من وایت؟

هەژار: بەڵێ وەك یەکین ئاینی پاکی خودا لەسەر زمانی ئەو پیاوە پاکە (ئاماژە بۆ پێغەمبەر موسا دەکات) ئەمەی فێرکردوین..

ئاغا: یانی ئاین فێری ئەوەی کردوی ئاگای گەورەو بچوكو هەژارو دەوڵەمەندو خانەدانان نەزانی؟

هەژار: براکەم هەردوکمان مرۆڤینو هەردوکمان برای یەکین.

ئاغا: دەزانی من کێم؟ براگیان!!

هەژار: ئێوە ئاغازادەن..

ئاغا: من کوڕی فلانی کوڕی فلانی کوڕی فلانم کەتا نۆ پشتی گەورەی خۆی ژمارد، کە هەمویان ئاغاو بەرپرسو دەوڵەمەند بون.

پیاوە هەژارەکە سەری داخستو توانای بەرپەرچدانەوەی نەما.. خەریك بو هەڵسێتو بڕواتە ئەولاوە..

لەم کاتەدا خوای گەورە باڵادەست زۆر بێزار دەبێت لە خۆهەڵنانو فشەکەری ئەو ئاغازادەیە بۆیە هەر لەوێدا نیگا دەنێرێتە خوارەوە بۆ موسا پێغەمبەر (علیە السلام)و پێی دەفەرموێت:

بڵێ بەو کەسەی کە شانازی دەکاتو خۆی هەڵدەنێ بەسەر برا هەژارەکەیدا:

کە ئەو نۆ پشتەی ئەو شانازی پێوەکردنو خۆی پێوە هەڵنان دەچنە ناو ئاگری دۆزەخو تۆیش دەیەمیان دەبیت..

پیاوە ئاغاکە داوای لێبوردنی نەکرد بەڵکو هەستاو خۆیو پیاوەکانی بە توڕەییو مۆنیەوە چونە دەرەوە..

## پەندو ئامۆژگاری لەم چیرۆکە

١ـ شانازی کردن بە باوباپیرە یان بە زانستو بڕوانامەیان پلەو پۆستو بەرپرسیارێتی لە ئاینی پاکی ئیسلامدا بە قێزەونو ناشیرین ناوبراوەو پیاوە ئەو پیاوەیە بە تەقواو خواناسیو دڵسۆزیو خزمەتکاری دا بنازێت.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ﴾.

٢ـ بە تەما مەبە هەرگیز لە خزمەتدا کەس هەڵە نەکاتو دەبێت هەموان شەرمت لێ بکەنو شتێك نەڵێن کە تۆ پێت ناخۆش بێت..

ئەی نابینی پێغەمبەر (ﷺ) بەو گەورەییو مەزنییەوە کەچی دو پیاو لە لایدا شانازی بە باوباپیرەوە دەکەن..

٣ـ ژیرو دانا ئەو کەسەیە کە هەڵە کرا لەبەردەمیدا تورە نەبێتو هەڵنەچێتو غەڵەت نەکات بەڵکو وەك مامۆستایەکی دڵسۆز هەڵەکانیان ڕاست بکاتەوەو بۆچونەکانیان چاك بکاتەوە.

٤ـ بەهێزترین هۆکاری پەروەردەیی بۆ ڕاستکردنەوەی بۆچونە هەڵەکان نمونەی زیندو هێنانەوەیە لە گەلو نەتەوەو ئوممەتەکانی پێشتر، نابینی پێغەمبەر (ﷺ) بە بەسەرهاتێکی موسا کێشەکەی چارە کرد.

٥ـ سوننەتی ژیان وایە زۆربەی ئەو کەسانەی کە شەیتان بە زۆری لە خشتەیان دەباتو دەیانکاتە سەربازی خۆی کە پۆستو پلەو پایەو شۆرەتی زلیان بواریان نادات زانستی شەرعی تەواو وەربگرنو لە ڕەوشتی مەزنی ئیسلام بەهرەمەند بنو خواناسیو بەندایەتی بەردەوامو ورد ئەنجام بدەن.

مەگەر کەسانێك خوا بە ڕەحمی خۆی کەشوهەوای ئیمانیان بۆ بڕەخسێنێتو خواناسێکی نمونەیی بن.

# القصة الثالثة والعشرون

## قطة أسيرة

عن ابن عمر (رضي الله عنه) ان رسول الله (ﷺ) قال: ((عُذِّبَتْ امرأة في هرة ربطتها[1] حتى ماتت فدخلت في النار، لا هي أطعمتها ولا سقتها إذ حبستها ولا هي تركتها تأكل من خشاش الأرض))[2].

واته: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوای لێ بێت) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: ئافرەتێك سزا درا لەسەر پشیلەیەك کە بەستیەوە لە ژورێکدا تا مردن و بەو هۆیەوە خوای گەورە خستیە ناو ئاگرەوە.

کە نە خواردنی پێداو نە ئاوی پێداو نە بەڕەڵاشی کرد تا بۆ خۆی گیانلەبەری زەوی ڕاو بکات و بیخوات.

١ رواه البخاري (٣٣١٨) ومسلم (٢٢٤٢).

٢ وفي رواية ابن حبان في (صحيحه) في هرة لها.

# چیرۆکی بیستو دووەم

## پشیلەیەکی دیلکراو

پیرەژنێك هەبو لە دێیەکدا دەژیاو خاوەنی مریشكو جوجەڵەیەکی زۆر بو..

هەمو ڕۆژێك بەیانی زو هەڵدەستاو دەمی کولانەکەی دەکردنەوەو ئەوانیش دەهاتنەدەرو دانی بۆ دادەکردنو دانیان دەخواردو پاشان هێلکەکانی کۆدەکردنەوە..

ئەم ئافرەتە بۆ هاودەنگی خۆی پشیلەیەکی هەبو.. دەستەمۆ بو، کە نانی دەخوارد ئەویش دەهات لە پاڵیدا دادەنیشت.. وەك ئەوەی بڵێ ئەی بەشی من دایەگیان..

ئەویش لە خواردنەکەی خۆی بۆی دەکردە قاپێكو تێرو پڕی لێ دەخواردو پاشان کلکی قنج دەکردەوەو بە حەوشەکەدا دەهاتو دەچو.. ژنەکە زۆری خۆش دەویستو زۆرجار دەیگرتو لە باوەشی دەگرتو دەستی دەهێنا بە سەریدا..

ئەم پشیلەیە زۆر سودمەند بو.. مشكو جرجی لە ماڵەکەدا نەهێشتبو.. پارێزگاری مریشكو جوجکەکانیشی دەکرد لە پشیلەی دەرو دراوسێکانی، وە هەرگیز نەدەهات بە خەیاڵیدا ناپاکی بکاتو دەم بەرێت بۆ جوجکەیەكو بیخواتو ژنەکەش ئەمەی دەزانی بۆیە زۆری خۆش دەویست..

جارێکیان.. هەروەك جاران دەرگای کولانەکەی کردەوەو دانی داکرد بۆ مریشكو جوجگەکانی، وە خواردنیشی لە قاپێکدا دانا بۆ پشیلە سورەکەیو ئەویش تێروپڕی لێ خوارد..

پاشان عەباکەی دا بە سەریداو ویستی لە ماڵ دەربچێت لای کردەوە دەبینێت پشیلەکەی تا دەرگای حەوشە بە دوایەتیو ئەویش دەستی هێنا بە سەریدا وتی:

پشیلە جوانەکەم.. چرای ماڵەکەم.. من تا بازاڕ دەچمو هەندێ شتومەك دەکڕمو دێمەوە.. کەمێك زۆرم پێ دەچێت، تۆش ئاگات لە مرو جوجگەکان بێت..

پشیلەکەش وەك ئەوەی بڵێت هەی بەسەر چاو سەیرێکی پیرەژنەکەی کردو گەڕایەوە بۆ ناو مریشکەکان.. لە سوچێکەوە بەرانبەریان قنج لێی دانیشت..

لە ناكاو لە دیوارەكەوە دو پشیلە بازیان دا ئەمدیو پەلاماری جوجەڵەكانیان دا.. پشیلەكەش زۆر هەوڵی دا كە دوریان بخاتەوە ئەوانیش پەلاماریان داو سەریان خوێناوی كردو چوار پێنج جوجكەیان چەپاو كردو هەندێكیان خواردو هەندێكی تریان لەو ناوەدا بە سەربڕاوی بەجێ هێشت..

پشیلەكەش بە دەنگی غەمناك دەیمیاواناند وەك بڵێ سەرمۆری بۆ گرتونو بۆیان دەگری..

لە ناكاو پیرەژنەكە بە شتومەكەوە خۆی كرد بە ماڵەكەداو هەر كە چاوی كەوت بە جوجكەی خوراوو سەربڕاو.. یەكسەر شتەكانی لە دەست كەوتە خوارەوەو هاواری كرد:

پشە سور.. پشە سور.. ئەوە تۆ لە كوێ بوی وا جوجكەكانم ئاوایان لێ بەسەر هاتوە؟ ها..

پشیلەكەش بێ زمان بو نەیدەزانی چۆن حاڵی بكات لە ڕاستی مەسەلەكەو هەر ئەوەی پێ كرا هات بۆ لایو لە ژێرەوە سەیری پیرەژنەكەی دەكرد، پیرەژنەكە بینی وا دەمو پلی پشیلەكە سورە..

شێت بو لەسەر خۆی نەما.. بە گومانی خۆی وای زانی ئەو مرو جوجكەی خواردوە..

بۆیە وتی: لای خۆی من تۆم كردبو بە پاسەوان! كەچی خۆت هەمویانت خواردوە.. هەی بە زەهرت بێت.. ڕاستە دەڵێن: گورگ هەر گورگەو نەیكەن بە شوانی مەڕەكان..

گسكێكی هەڵگرتو بە گسك هات پیای داو دەیوت: من متمانەم پێ كردی هەی پشیلەی سپڵەی بێ متمانەو پشیلە بێ تاوانەكەش ئەم سوچو ئەو سوچ ڕای دەكرد وای دەزانی سوعبەتی لەگەڵ دەكاتو هەوڵی ڕاكردنو هەڵاتنی نەدەدا..

پیرەژنەكەش بە دەم قۆڵەو بۆڵەوە ڕۆیشتو گەڕا تا سەرەنجام پەتێكی درێژی دۆزیەوە.

كەوتە دوای پشیلەكەو پشیلەكەش هاتە باوەشیو دانیشت.. بەڵام ئەمجارە وەك جاران نەبو.. دەستی نەهێنا بە سەریدا یاری بۆ نەكرد.. بەڵكو پەتەكەی كردو ملیو گرێی لێ داو پاشان بردیە ژورێكو بەستیەوە بە شیشێكی پەنجەرەكەوە..

پشیلەکەش بۆ خۆی سەری داخستو لێی خەوتو وای زانی سزایەکی ئاساییەو پاش ماوەیەکی تر دەیکاتەوەو وەك جاران بە دەوریدا دێتو دەچێتو نانی لەگەڵدا دەخوات..

بەڵام نازانێت ئەم پیرەژنە دڵڕەقە زۆر تورە بوەو لە پێناوی هەندێ جوجکەدا.. دەیەوێت سزایەکی زۆر سەختی ئەم پشیلە بەستەزمانە بدات..

پاش ماوەیەك پشیلەکە تینوی بو.. بەڵام کەس ئاوی بۆ نەهێنا.. و پاشان برسی بو.. بەڵام کەس نەهات بە لای داو نانی بۆ دانەنا لە قاپە ڕەشەکەدا وەك جارانو ئەو هەژارە بێ ئاگا بو لەوەی کە حوکمی لە سێدارەدانی بۆ دەرچوە! بەڵام کە ژنەکەی چاو پێکەوتو خۆشی لێ هاتو دەستی کرد بە میاواندن بەڵام ژنەکە تا دەهات دڵڕەقتر دەبو هەر دەیوت: زەهری مار! تا مردن ئەوە جێتە! ئەوە ئەنجامی ناپاکیو خیانەتەکەتە.. بۆ خۆت بمیاوێنەو منیش ئالێرەدا دادەنیشمو بۆ خۆم سەیرت دەکەم...

دڵڕەقیو بێ بەزەییو دو ڕەوشتی زۆر ناشیرینن و لە مرۆڤ نایەن بۆیە ئەم ژنە بەڕەیەکی داخستو سەیری پشیلەکەی دەکرد کە لە برساندا خۆی دەکێشا بە دارو بەرداو هاواری دەکرد لە کەللەی سەر، میاو، میاو، میاو، میاو!

پشیلە بە دەم ئێشو ئازارەوە لە پەلو پۆو جموجۆڵ کەوت.. جارجار قاچەکانی دەجولاو بە حاڵ هەناسەی دەداو لە ژێرەوە سەیری خاوەنەکەی دەکردو بەڵام بێ ئاگا بو لەوەی کە هاوڕێکەی مرۆڤەو دڵنەرمو، هەست ناسكو لێبوردەی جاران نەماوە.. پاش ماوەیەك ئەو جوڵەیەشی نەماو بە یەکجاری مرد..

لەم کاتەدا کوڕێکی برازای خۆی کرد بە ژورداو وتی: پورێ گیان چۆنی، پیرەژن وتی: بەخێر بێی.. باش بو هاتی.. دەزانی پشیلە سور چی کرد بە جوجکەکانم؟

هەمویانی خوارد..

+ چۆن؟! خۆ جاران ئەو پاسەوانی دەکردن بۆت؟! هەرگیز باوەڕ ناکەم پورێ.. ئەی کوا بۆ نایبینم..

ـ نازانی چی لێ کردوم؟! ئەوە قوڕی کردوە بەسەرمدا.. جوجکەکانی هەمو خواردم منیش ئاوا لە ژورەوەدا حەپسم کرد تا گیانی دەرچو..

+ کورە پورێ گیان ئەو کاری وا ناکات بەڵکو من دو پشیلەم بینی لەمدیو دیوارەوە بازیان دایە دەرەوەو لەوانەیە ئەوان بون!

پیرەژنەکە بیری کردەوەو وتی بۆیە دەمی سور بو.. بە خوا شەڕی کردبو با بچم سەیری بکەم.. چو پشیلەکەی کردەوە دەبینێت بریندارە..

بە هەردو دەستی دای بە تەوقی سەریداو وتی: چیم کرد بە خۆم! ئەو پشیلە بەستەزمانە.. بێ تاوان بو.. من چیم کرد بە خۆم؟ بۆ ئەوەندە دڵڕەقو بێ ویژدان بوم..

+ پورێ گیان ئەگەر جوجکەشی بخواردایە (ئاوەزای نییە) هەر نەدەبوایە بەم سزا سەختە بتکوشتایە..

ـ ژنەکە هاواری کرد خوایە لێم ببورە.. خوایە بمبەخشە.. من نەدەبوا ئازاری ئەو پشیلە بێ زمانە بدەم..

کوڕەکەی وتی: پورێ گیان داوای لێبوردن زۆر بکە.. پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرمویەتی خوای گەورە ژنێکی خستە ناو ئاگری دۆزەخ بەس تاوانی ئەوە بو پشیلەیەکی بەند کردو خواردنو خواردنەوەو پێ نەدا تا لە برساندا مرد..

ژنەکە دای بە سەری خۆیداو وتی: ئەوە منم.. دەرگاکەی کردەوەو پشیلەکەی کردەوەو ویستی فڕێی بدات دەبینێت گیانی تیا ماوەو چاوی هەڵبڕی.. ژنەکە لە خۆشیاندا ماچی کردو ئاوی کرد بە قوڕگیداو هۆشی هاتەوەو سوپاسی خوای کرد کە توشی ئەو تاوانە گەورەیە نەبوە.

## پەندو ئامۆژگاریەکانی ئەم چیرۆکە

١ـ ئافرەتێك سزا دراو خرایە ناو ئاگری دۆزەخەوە لەبەر ئەوەی پشیلەیەکی کوشتو بە مردنێکی ترسناك‌و لەسەرخۆ.. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئایینی پاکی ئیسلام پێش (١٥) سەدە لەمەوبەر مافی ئاژەڵانی داوەو قورئانی پیرۆز فەرمویەتی: ئەوانیش گەلانێکی وەك ئێوەن: ﴿وَلَا طَٰٓئِرٖ يَطِيرُ بِجَنَاحَيۡهِ إِلَّآ أُمَمٌ أَمۡثَالُكُم﴾.

٢ـ ئەم ئافرەتە باوەڕدار بوەو خواناسی‌و نوێژکەرو پابەند بوە بە پەرستشەکانەوە کەچی ئەم هەمو کردەوە جوانانەی ڕێگر نەبون کە بە هۆی پشیلەیەکەوە چوە ناو ئاگری دۆزەخ.

کەواتە دەبێت ئەو کەسانەی چاکن‌و خواناسن.. ئاگایان لە خۆیان بێت نەوەك گوناهێکی بچوك کە جاری وا هەیە خۆیان حیسابی بۆ ناکەن کەچی دەیانباتە ناو ئاگری دۆزەخ پەنا بە خوا: ﴿وَتَحۡسَبُونَهُۥ هَيِّنٗا وَهُوَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمٞ﴾.

٣ـ دروستە مرۆڤ باڵندە یان گیانلەبەری هەبێت‌و ڕای بگرێت جگە لە (سەگو بەران) بەڵام بە مەرجێك برسی‌و تینویان نەکات‌و کاری قورسیان پێ نەکات چونکە لە ڕیوایەتەکەی (ابن حبان)دا کە ژنەکە پشیلەیەکی هەبو (في هرة لها).

٤ـ وەك چۆن ماڵ‌و منداڵ خواردن‌و خواردنەوەیان لەسەر پیاوە هەر بەو چەشنەش هەندێ لە زانایان ئەفەرمون: ئەگەر پشیلەیەکی کوێر هاتە ناو باخەکەشت یان حەوشەکەتەوە، نەفەقەو خواردنی لەسەرت واجب دەبێت تا لەو ماڵەدا بێت.

٥ـ بەم چیرۆکە کورتە، ترسناکە، تراجیدیایە، پێغەمبەرمان (ﷺ) گیانی بەزەیی هاتنەوە بە ئاژەڵ‌و گیانلەبەرانی لەناو هاوەڵاندا دروست کردو ئەوانیش ئەوەندە گیانلەبەرانیان خۆش دەویست کە بە ناوی ئەوانەوە ناویان دەرکرد.

تەنانەت (أبو هريرة) واتە (باوکی پشیلەکان) کە دەگێڕنەوە جارێکیان نوێژی دەکرد، لە کاتی تەحیات خوێندندا پشیلەیەك هات‌و لەسەر عەباکەی خەوی لێکەوت! کاتێك خەبەری بویەوەو بینی دڵی نەهات هەڵی بسێنێت بۆیە مەقەسی هێناو عەباکەی خۆی بڕی‌و دواتر پینەی کردەوە.

## القصة الرابعة والعشرون

## حجر يعدو

عن ابي هريرة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ): ((إن موسى كان رجلا حيّياً ستيراً، لا يرى من جلده شئ استحياءً منه، فآذاه من آذاه من بني إسرائيل فقالوا: ما يستتر هذا التستّر إلاّ من عيب بجلده، أما برص وأما أدرة وأما آفة.

وإن الله أراد أن يبرئه مما قالوا، فخلا يوماً وحده، فوضع ثيابه على الحجر، ثم اغتسل.

فلما فرغ أقبل على ثيابه ليأخذها، وإن الحجر عدا بثوبه، فأخذ موسى عصاه وطلب الحجر، فجعل يقول: ثوبي حجر، ثوبي حجر.

حتى انتهى إلى ملأ من بني إسرائيل فرأوه عريانا أحسن ما خلق الله وأبرأه مما يقولون.

وقام الحجر فأخذ بثوبه فلبسه، وطفق بالحجر ضربا بعصاه، فوالله إن بالحجر لندبا من أثر ضربه ثلاثا أو أربعا أو خمسا فذلك قوله: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ ءَاذَوۡاْ مُوسَىٰ فَبَرَّأَهُ ٱللَّهُ مِمَّا قَالُواْۚ وَكَانَ عِندَ ٱللَّهِ وَجِيهٗا ﴾*.[١]

واتە: ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرمویەتی:

موسا پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) پیاوێکی زۆر شەرمن بووەو هەمیشە خۆی داپۆشیوەو کەس نەیتوانیوە پێستی ببینێ ئەمەش بە هۆی شەرم کردنیەوە.

بەڵام بەنی ئیسرائیلیەکان (خەراپەکانیان) دڵیان ئازار دەداو پێیان دەوت: پێویست بەم هەمو شەرمە ناکاتو دیارە بە هۆی بەخۆشی پێستیەوەیە: ئیتر بزانە نەخۆشی بەڵەکیەتی یان گونی ئاوساوەو قوڕ بوە یان هەر دەردێکی تر.

---

* سورة الاحزاب (٦٩).

١ رواه البخاري في صحيحه، (صحيح قصص الرسول) لا: (٤٧٢/١).

(موسا (سەلامی خوای لێ بێت) زۆری پێ ناخۆش بو بەلاّم قسەی نەدەکردو وەلاّمی نەدەدانەوەو بەرگری لە خۆی نەدەکردو ڕاستی بۆ نەدەسەلماندن).

بەلاّم خوای گەورە زۆری پێ ناخۆشەو بێدەنگ نابێت لەسەر ئاوا زوڵمو ناهەقیەك دەرهەق بە پێغەمبەرێکی ئەنجام بدرێت.

ویستی پاکیی‌و تەواوی لەشی موسا (سەلامی خوای لێ بێت) بسەلمێنێت بۆ هەمو بەنی ئیسرائیل‌و کەسانی تریش (و کارەکانی خوایش بۆ بە پاکی دەرکردنی پێغەمبەران لە ڕێگای موعجیزەوەیەو بۆ پاکی دەرخستنی پیاوچاك‌و بانگخوازانی هەق لە ڕێگەی کەرامەتێکەوەیە.)[1]

ڕۆژێکیان لە چۆلەوانیەکداو لە کەناری ئاوێکدا موسا (سەلامی خوای لێ بێت) جلەکانی داکەندو دای بەسەر بەردێکداو خۆی چوە ناو ئاوەکەوە بۆ ئەوەی کەمێك مەلە بکات یان خۆی بشوات..

کاتێك لێبویەوە هاتە دەرەوەو چو بۆ لای جلەکانی تا بیکاتەوە بەری، (بەلاّم شتێکی زۆر سەرسوڕهێنەری بینی).

ئەویش ئەوە بو بەردەکە بە جلەکانەوە ڕای دەکردو موسایش بەبێ جلوبەرگو بە دار عەساکەی دەستیەوە بە دوایدا ڕای دەکردو هاواری دەکرد..

بەردەکە جلەکانم.. بەردەکە جلەکانم بدەرەوە..

بەلاّم بەردەکە بە ئارەزوی خۆی نەبو تا بە گوێی پێغەمبەر بکات چونکە ئەو لە لایەن دەسەلاّتێکی بەرزترەوە فەرمانی پێ کراوە ئەو جلانە بفرێنێت.

بۆیە هەر گوێی بۆ نەگرت‌و بەردەوام ڕێی دەکردو تا گەیشتە ناو کۆمەلّێك لە پیاوانی بەنی ئیسرائیل (کە دانیشتبون لەبەر خۆرەکەو بۆ خۆیان قسەیان دەکرد).

---

١ وتەی نوسەر.

ئەوانیش کە لایان کردەوە دەبینن موسا بە بێ جلوبەرگو بە ڕوتی بە دوایەوەیەتیو دەبینن جوانترین پێستو لەش ساغترین کەسی دروستکراوەکانی خوایەو خوا لە ڕێگەی ئەو موعجیزەیەوە پاکیو تەواوی پێغەمبەرەکەی بۆ خەڵکەکە ئاشکرا کردو ئیتر بێ دەنگ بون..

بەردەکەش وەك ئەوەی داوای لێبوردن بکات لە پێغەمبەری خۆشەویستی پەروەردگار جلەکانی هێنا بەردەمیو دەستی کرد بە لەبەرکردنی..

بەڵام موسا توڕەبونەکەی دانەدەمرکایەوەو بە دار هات بە بەردەکەداو نە داریێ نە دوان تا پێنج داری لێدا.

لە ڕیوایەتی (مسلم)دا هاتوە کە پێیان وتوە کە ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت:

((والله انه بالحجر ندبٌ ستة او سبعة ضرب موسا بالحجر)) واتە: سوێند بە خوا بەردەکەشی تا حەوت جێ لێدانی دارەکەی موسای پێوە دیار بوە).

ئیتر بەنو ئیسرائیلیە دەم درێژە تالیقبازەکان جوان سەیری هەمو گیانی موسایان کرد کە ڕیوایەتی (مسلم) دا دەفەرموێت: ((حتی نظرت بنو اسرائیل الی سوْأة موسی، فقالوا: ما بموسی من بأس)) واتە: سەیری هەمو گیانی موسایان کرد تەنانەت پێشو پاشی شەرمگەیو پاشان وتیان: سوێند بە خوا هیچ جۆرە عەیبو عارو نەخۆشیەکی نییە.

و ڕاست دەکات کە دەیوت شەرم ڕێگەم پێ نادات بە کۆمەڵ لەگەڵ ئێوە خۆم بشۆم.

لە ڕیوایەتی (مسلم)دا هاتوە (٢٣٧١) کە دەفەرموێت: (کانت بنو اسرائیل یغتسلون عراة ینظر بعضهم الی سواة بعض وکان موسی یغتسل وحده، فقالوا والله ما یمنع موسی ان یغتسل معنا الاّ انه آدرٌ).

واتە: بەنی ئیسرائیلیەکان بە ڕوتیو بە کۆمەڵ خۆیان دەشۆردو مەلەیان دەکردو سەیری پاشو پێشی یەکتریان دەکرد، تەنها موسا نەبێت کە بە تەنها خۆی دەشۆرد، ئەوانیش پێیان ناخۆش بو بۆیە قسەیەکی سەقەتیان خستە دوای کە گوایە مەسەلەکە

شەرمو لە خواترسان نیە! بەڵكو نەخۆشی ئادەری لەگەڵ دایە واتە لای خۆمان (گون ئاوسان یان گونە قۆڕە)!.

ئەوەبو بە هۆی ئەو بەردەوە بەنی ئیسرائیل لەش ساغیو بێ عەیبی پێستی موسایان بۆ دەركەوتو بەو جۆرە خوای گەورە لەو ناتۆرە گەورەو ترسناكە پاكی كردەوە وەك خوای گەورە لەو بارەیەوە دەفەرموێت:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ ءَاذَوْا۟ مُوسَىٰ فَبَرَّأَهُ ٱللَّهُ مِمَّا قَالُوا۟ ۚ وَكَانَ عِندَ ٱللَّهِ وَجِيهًا ﴾.[1]

واتە: ئەی باوەڕداران وەك ئەو كەسانە مەبن كە ئازاری دڵی موسایان داو خوای گەورەش لەش ساغیو بێ تاوانی ئاشكرا كردو بە ڕاستی موسا لە لای خوا زۆر قابیلەتدارە.

---

١ الاحزاب (٦٩).

## پەندو ئامۆژگاریەکانی ئەم چیرۆکە

١ـ شەرمکردن یەکێکە لەو ڕەوشتە بەرزو گەورەو گرانانەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە بەشێکی گرنگی باوەڕ دایناوەو فەرمویەتی: ((الحياء شعبة من الايمان)).[1]

٢ـ بەم چیرۆکەدا دیارە کە ڕەوشتی جوانو ئاکارە بەرزەکان سومبولی هەمو ئاینە ڕاستەقینەکانی پێش ئیسلامەو ئەوەی کە ئەمڕۆ خۆی بە شوێنکەوتەی موسا دەزانێ بەڵام سەرەتاترین بنەماکانی ڕەوشت پیادە ناکات جاڕی ڕوتیو تێکەڵی نێوان ژنو پیاو دەکەن.

٣ـ دەبێت موسڵمان لەوە دڵنیا بێت کە بە دور نیە لەوەی کە خەڵکی تانەو توانجی لێ بدەنو بە هەڵە کارە جوانەکانت بە خەڵکی بناسێنن، بۆ نمونە ئەگەر هەوڵی پۆستو بەرپرسیارێتی نەدەیت.. پێت دەڵێن گێژەو خۆی توانای بەڕێوەبردنی لاوازە!!
نابینی شەرمکردنەکەی موسا پێغەمبەر بە چی لە یەکیان دایەوە؟!.

٤ـ پشت بە خوا ببەستەو لەسەر ئاکارە جوانەکان بەردەوام بەو مەڕو ململانێو بەرگری کردن لە خۆت..

چونکە تۆ ناتپەرژێ ئەو کارە بکەی، تۆ سپاردە گەورەکەی پەروەردگارت بەسەر شانەوەیەو دەبێت بیگەیەنیت.

٥ـ دڵنیا بە خوای گەورە پاکیت دەردەخاتو دوژمنان ناچار دەکات کە دان بە پاکی دەستو دەمو دەستو دڵتدا بنێن ئەگەر لە ڕێگەی کەرامەتێکیشەوە بێت..

٦ـ ناحەزانو نەیاران تا بینە قاقایان لە قوناهو حەرامو خراپەکاریدا چەقیون بۆیە حەز ناکەن کەسێکی پاكو بێ غەلو غەش لە بەرامبەریاندا قووت بێتەوە.. و تا سەر ئێسقان هەوڵ دەدەن ئەویش وەك خۆیان لە گوناهدا بگەوزێننو پاك نەمێنێت.

نابینی خراپەکارانی ناو بەنی ئیسرائیل لە گەرماوی گاگەلیدا خۆیان دەشۆردو سەیری عەیبی یەکتریان دەکرد! و سەیر بو بە لایانەوە کەسێك بێتو بە شەرمو شۆ بێت!..

---

١ سنن ابن ماجة، باب: في الايمان، رقم الحديث ٥٧، ج١، ص٢١.

٧ـ ناحەزانی بیروباوەڕی خاوێنی ئیسلام.. دەزانن کە ناتوانن بەرنامەکە لەکەدارو پوچەڵ بکەنەوە..

بۆیە کە لەوە بێ هیوا بون ئیتر دێنە سەر هەڵگەڕانی ئەو بەرنامەیەو میدیاکان دەخەنە خزمەت ناوزڕاندنو ناشیرینکردنیانو بە جۆرەها ناوو ناتۆرە دەیانەوێت سوکیان بکەن لەبەر چاوی میللەتو دواتر کەس شوێنیان نەکەوێتو ڕێزیان نەگرن.

# القصة الخامسة والعشرون

## العابد العطشان

عن انس بن مالك (رضي الله عنه) عن النبي (ﷺ) قال: ((رجلان سلكا مفازة، عابدٌ، والآخر به رهق.

فعطش العابد حتى سقط، فجعل صاحبه ينظر إليه، وهو صريع، فقال: والله ان مات هذا العبد الصالح عطشاً، ومعي ماء لا أصيب من الله خيرا أبداً.

ولئن سقيته مائي لأموتن، فتوكل على الله وعزم فرّش عليه من مائه وسقاه فضله، فقام فقطعا المفازة.

فيوقف الذي به رهق للحساب، فيؤمر به إلى النار، فتسوقه الملائكة، فيرى العابد فيقول: يا فلان اما تعرفني؟ فيقول: ومنْ أنت؟

فيقول: أنا الذي آثرتك على نفسي يوم المفازة، فيقول: بل أعرفك، فيقول للملائكة: قفوا، فيقفون، فيجيء حتى يقف ويدعو ربه (عز وجل) فيقول: يا رب قد تعرف يده عندي، كيف آثرني على نفسه، يا رب هبه لي.

فيقول: هو لك، فيجيء فيأخذ بيد أخيه فيدخله الجنة)).[1]

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك (خوای لێ ڕازی بێت) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی:

دو پیاو بە بیابانێکدا دەڕۆیشتن، یەکێکیان پیاوچاکێك بو، یەکێکی تریان تاوانبارو گوناهبار بو.

(ڕێگایەکی دورودرێژیان بڕیو پیاوچاکەکە ئاوی پێ نەما)و تینویەتی زۆری بۆ هێناو پاش ماوەیەك بە چۆکدا هات...

---

١ رواه الطبراني في (الأوسط) والبيهقي في (الشعب) بنحو، وقال: وهذا الاسناد ان كان غير قوي فله شاهد من حدثي أنس. (صحيح قصص الرسول)، (١/٥٠).

هاوڕێکەی بۆی دەڕوانی، خەریك گیانی دەداو لە هۆش خۆی چوبو.

هاوڕێکەی وتی: وەڵلاهی پێم وایە ئەگەر ئەم پیاو چاکە لە توێناندا بمرێتو لە کاتێکدا منیش ئاوم پێ بێت لەو باوەڕەدا نیم خوای گەورە هەرگیز خێر بێنێتە ڕێگەم.

خۆ ئەگەر ئاوەکەش بدەم بە ئەو لە تینواندا دەمرم، بەڵام پشتی بە خوا بەستو ئاوی بە دەموچاوی پیاوەکەدا پرژاندو بە هۆشی هێنایەوەو تێر ئاوی کردو بەو جۆرە ئەو پیاوە توانی ئەو بیابانە وشکو بێ ئاوە ببڕێتو (بگاتە شوێنی مەبەست).

لە ڕۆژی قیامەتدا ئەو پیاوەی کە لە دنیادا تاوانبارو خراپەکار بو دەهێنرێت بۆ لێپرسینەوەو لە پاشان فەرمان دەدرێت ببرێت بۆ ناو ئاگری دۆزەخ..

فریشتەکان دەیدەنە بەر خۆیانو دەیبەن.. و لە ڕێگە چاوی بە خواناسەکە دەکەوێتەوەو بانگی دەکاتو پێی دەڵێت:

ئەی فلان کەس، ئایا ئەوە نامناسیتەوە؟ ئەویش دەڵێت: دەی تۆ کێیت؟

دەڵێت: من ئەو کەسە بوم کە تۆم لە خۆم خۆشتر ویستو لە بیابانەکەدا ئاوم پێ دایتو ڕزگارم کردی..

ئەویش دەڵێت: بەڵکو ئێستا دەتناسمەوەو هاتیتەوە بیرم. پاشان بە فریشتەکان دەڵێ: ڕاوەستن. ئەوانیش ڕادەوەستن..

ئەویش دێتو ڕو دەکاتە خوای عز وجل وە لێی دەپاڕێتەوەو دەڵێت: ئەی پەروەردگارم تۆ ئاگاداری کە چ چاکەیەکی لەگەڵ کردوم، و چۆن منی لە خۆی خۆشتر ویست..

دەی خوایە گیان بیبەخشە بە من، خوایش دەفەرموێت: دەی ئەوا بەخشیمان بە تۆ.. ئەویش دەستی ئەو برایەی دەگرێتو پێکەوە دەچنە ناو بەهەشتەوە.*

---

* دەی خوایە گیان نوسەرو خوێنەری ئەم فەرمودەیەش ببەرە بەهەشتەوەو بیانبەخشە بەو دو پیاوە بەهەشتیە.

# چیرۆکی بیست و پێنجەم

## تینوی بیابان

مام شریف پیاوێکی خواناس و چاکەکار بو.. هەمو کاتەکانی ژیانی بە نوێژو ڕۆژوو زیکرو یادی پەروەردگاری بەسەر دەبرد..و کاتی غەفڵەت و بێ ئاگایی نەبو..

بەڕۆژ خەریکی کاسبی حەڵاڵ بو (لە کڕین و فرۆشتندا) بۆ بژێوی خۆی و ماڵ و منداڵەکانی شەویشی دانا بۆ خواناسی و نوێژکردن.

هەر لەو گەڕەکەشدا پیاوێك هەبو.. خوی گرتبو بە گوناه کردنەوەو بەردەوام (مەی) دەخواردەوەو ژنانی ئەو کۆڵانەی هەراسان کردبو.. سەیری دەکردن و دەچوە ڕێگەیان و خۆی دەکردو بە قوربانیان و پەلاماری دەدان...

کە دەیدا بە لای دوکانی مام شەریفی خواناسدا.. توانجی لێ دەداو پێی دەوت: بە خوا تاقەتت خۆشە.. ئاه.. هەر کە لێرەوە دەڕۆم ئەم مام شەریفە نوێژ دەکات...

کاکە تۆش وەرە بخۆرەوە.. لەم جادە گشتیەدا چاو بلەوەڕێنەو بەڵام مام شەریف هیچ وەڵامی نەدەدایەوە بەڵکو پێی دەوت:

عەباس گیان: ئەم کارانەی تۆ گوناهن.. خوا پێی ناخۆشە..مەیانکە گیانەکەم.. دروست نیە..

بەڵام عەباس گوێی لێ نەبو.. بەڵکو دەیوت: خوا گەورەیە مام کەریم انشاء الله لێمان خۆش بێت.. بە خوا من تاقەتی ئەم خواناسی و نوێژو شتەم نیە.. هەرچەندە حەزیشم دەکەم کە وەك تۆ بومایە..

ئەم عەباسە شارەزای کون بە کونی بیابانەکە بو.. بۆیە خەڵکی بە پارە دەیانبرد لەگەڵ خۆیان بۆ دۆزینەوەی ماڵیان یان وڵاخیان یان بۆ ڕێپیشاندان وەك دەلیل..

ڕۆژێکیان هەواڵ هات کە کوڕێکی مام شەریف لە ڕاو نەگەڕاوەتەوەو هەمو هاوڕێکانی گەڕاونەتەوە بەڵام ئەویان پێ نەبوو لە بیابان لێیان ون بو..

مـام شـەریف دەسـتی کـرد بـە گریـانو هـاوارو داوای لـە خـوا دەکـرد بـە سـەلامەتی کوڕەکەی بۆ بگێڕێتەوە..

دەبوایە بچوایە بە دوایداو بۆی بگەڕایە.. بـەڵام نـە بیابـان شـارەزایەو ڕێگـای بیابـانو سەحرای بڕیوە تا ئێستا ئەی چی بکات..

ناچاری ئەوە بو بڕوات بە عەباس بڵێت تا لەم گەڕانەدا لەگەڵیدا بێتو ئەگەر گەڕانـەوە خەڵاتێکی باشی بکات..

عەباس پێی وت: مام شەریف بیابان زۆر ترسناکە.. هەمو تەپو تۆزو لمەو وشـكو بـێ ئاوەو گورگیشی زۆرە..

بۆیە چەكو تەقەمەنیت با پێ بێتو ئاویشت لەبیر نەچێت.. ئاو..

مام شـەریف بـەو جۆرەی کـرد کـە عـەباس پێـی وتبـو.. پێکـەوە کەوتنـەڕێو شـەوو ڕۆژێکیان پێ چو بەڵام لەبەر ئەوەی کە مام شەریف کەم ئەزمون بـو لـە گەشـتی بیابانـدا دەستی بە ئاوەکەیـەوە نـەگرتو لـە هـەر کوێدا مانـدو دەبـو.. دەبـە ئاوەکـەی دەنـا بـە سەرەوەو تێری لێ دەخواردەوە.

هەرچەندە عـەباس ئاگاداری دەکـردەوە پێـی دەوت: مـام شـەریف.. بۆ خـاتری خـوا ئاوەکە هەموی مەخۆرەوە.. دەستت بە ئاوەکـەوە بگـرە ڕێگاکـە دورەو گەرمـەو وشـکەو ئاوت لێ دەبڕێت.

بـەڵام مـام شـەریف بـە بیـانوی ئـەوەی زۆر تینومـەو نـاتوانم ڕێ بکـەم دیسان دەبـە ئاوەکەی دەنا بە سەرەوە تا لە ناکاو هیچی تیا نەماو خاڵی کردەوە..

لە ڕێگا تینویەتی زۆری بۆ هێناو کەوتو نەیتوانی بڕواتو لە هۆشی خۆی چـو بـە دەم هاوار کردنەوە نقەی لێ بڕا.

عەباس گیان فریام کەوە گەروم وشـك بـو.. لـە تینوانـدا مـردم.. ئـاوم بـدێ ئـاو..و لـە هۆشی خۆی چو..

بەڵام عەباس وتی:

ئای پەروەردگارم.. هەرچەندە من ئاوم بەشی خۆم پێ نیە.. خۆم ڕەزیلیم تیا کردوە بۆ ئەوەی ئاوم لێ نەبڕێتو لە تینواندا نەمرمو بەڵام خۆ ناشبێت بهێڵم ئەم پیاوە دڵ پاكو خواناسو ڕەوشت جوانە بە بەر چاومەوە لە تینواندا بمرێتو منیش ئاوم پێ بێت..

خۆ ئەگەر بەو جۆرە بکەم.. دڵنیام خوای گەورە لێم زویر دەبێتو هەرگیز خێر ناهێنێتە ڕێگام..

ئەی باشە ئەگەر بیدەم بەو، ئەی خۆ خۆم لە تێنواندا دەمرم.. بەڵام نا بۆ من جوان نیە.. براکەم لە تێنواندا بمرێت.. با ئاوی پێبدەم خوا کەریمە..

هەندێ ئاوی وەشاند بەدەمو چاویداو هێنایەوە هۆشی خۆیو پاشان وتی: ها رباکەم ئاوەکە من بخۆرەوە.. با لەتێنواندا نەمریت ئەویش تێر ئاوی خواردەوەو پێکەوە دەستیان کردەوە بەگەڕان بەدوای کوڕەکەدا..

ولە ڕێگا ئاویان پێ نەماو هەردوکیان.. لە تێنواندا.. هاواریان ئەکردو ئەکەوتنە زەویەکە..

مام شەریف دەیوت: عەباس چاوەکەم.. بۆچی ئاوەکەت بەمن دا؟ ئەی بۆ منت بەجێ نەهێشت. بۆ گیانی خۆتت ڕزگار نەکرد.. خەتای من بو من ئاوەکەی خۆمم زوو خواردەوە..

عەباس وتی: حەزناکەم ئەم قسانە بکەیت ئێمە برای یەکینو خواچۆن قبوڵی ئەکا لێم کەمن ئاوم پێبێو بەشی تۆی لێنەدەم..

مام شەریف دەستی کردە ملیو ماچی کرد وتی: ڕاستە تۆ گوناه ئەکەیتو خراپەکاریو سەرپێچی خوا زۆر ئەکەیت.. بەڵام خاوەنی دڵێکی پڕ لەباوەڕو بەزەیت خوا ڕزگارت کا وارزگارت کردم..

لەم قسانەدا بون کوڕەکەی مام شەریف هاتو سڵاوی کردو گریاو ووتی: باوکە گیان ئەوە لێرە چی ئەکەیت؟ ناشێ بەدوای مندا هاتبی؟ تۆ چۆن بڕی ئەم بیابان ئەکەی..؟

باوکی: ئۆخەی کوڕی شیرینم جارێکی تر تۆم بینیەوەو ئەمەی وت:

کەوتە سەر زەویەکەو لە هۆشی خۆی چو..

عەباس وتی: وەختی ئەم قسانە نیە، ئەوە دو ڕۆژە بە دوای تۆدا وێڵینو ئاومان پێ نەماوەو لە تینواندا خنکاوین، زوکە ئاو بکە بە دەمی باوکتەوە.. ئەها وەختە دەمرێت..

ئەویش پەلاماری داو تێر ماچی کردو تێر ئاوی کردو دەبەی دا بە عەباسو ئەویش تێر ئاوی خواردەوەو سوپاسی خوایان کردو گەڕانەوە بۆ ماڵەوە بە خۆشیو سەلامەتی..

دیمەنی ڕۆژی قیامەتەو عەباسی تاوانبار بۆ لێپرسینەوە هێنراوەو پاش لێپرسینەوە فەرمان درا کە ببرێت بۆ ناو ئاگری دۆزەخو...

عەباس لەرزی لێ هاتو چموچاری پێکەوت.. فریشتەکان پاڵیان پێوە دەناو دابویانە بەری خۆیان.. ئەویش سەیری خەڵکەکەی دەکرد هەمو وەستابونو ئەوانیش سەیری ئەویان دەکرد..

لە ناویاندا مام شەریفی بەدی کرد.. خۆشی لێهات پێکەنیو هاواری کرد..

مام شەریف؟ مام شەریف؟ ئەوە دەڵێی نامناسیتەوە؟

مام شەریف: لای کردەوەو بە سەرسوڕمانەوە وتی: تۆ کێی بە قوربان جا ئەمە ڕۆژێکە کەس کەس دەناسێتەوە؟

عەباس وتی: مام شەریف بۆ خاتری خوا.. فریام بکەوە من عەباسم.. ئەو کەسەم کە لە بیابانە وشکەکەدا تۆم لە مردن ڕزگار کردو ئاوم پێ دای لە بەشەکەی خۆم..

مام شەریف وتی: بەڕێوەڵڵا دەتناسمەوە.. تۆ گەورەترین چاکەت لەگەڵ من کردو لە تینویەتی ڕزگارت کردم..

بۆیە هاواری کرد وتی: ئەی فریشتەکانی خوا.. تکایە جارێ مەیبەنو بوەستن.. تکایە بوەستن؟ ئەوانیش وەستان..

ئەویش هاتو ڕوی کردو خوای گەورەو میهرەبان وتی: ئەی پەروەردگارم تۆ خۆت باشتر لە خۆم ئاگاداری کە چۆن لە ئاوەکەی خۆی تێر ئاوی کردمو منی لە خۆی خۆشتر ویست.

دەی پەروەردگارم تکات لێ دەکەم.. بیبەخشە بە من؟

خوای گەورەش دەفەرموێت:

ئەوا بەخشیمان بە تۆ.. ئەویش دەڕواتو دەستی دەگرێتو پێی دەڵێت:

ئەی برای هاودینم ئەوە خوا بەخشیتی بە منو فەرمو دەستت بێنە با پێکەوە بچینە ناو بەهەشتەوە..

پێکەوە دەچنە ناو بەهەشتەوە.

# پەندو ئامۆژگاریەکانی ئەم چیرۆکە

١ـ دروستەو شتێکی زۆر ئاساییە لەگەڵ نوێژ نەکەرو گوناهکاراندا بگەڕێیت و گەشت بکەیت بەو مەرجەی بەردەوام باسی چاکەو خواناسی بۆ بکەیت و ئەمر بە چاکەو بەرگری لە خراپە فەرامۆش نەکەیت لەگەڵیدا.

٢ـ ئەوانەی کە موسڵمانن و باوەڕدارن بەڵام دەورووبەری خراپ وای لێ کردون خەریکی گوناهو کاری خراپن.. نابێت فەرامۆش بکرێن و نەفرەتیان لێ بکەین بەڵکو دەبێت بەردەوام دەستیان بۆ درێژ بکەین و خۆشمان بوێن و بەزەییمان پێیاندا بێتەوەو دوعای هیدایەت و چاکەکاریان بۆ بکەین.

٣ـ هەرگیز لە هیچ موسڵمانێك نائومێد نەبین کە دەبینین لە مزگەوت نوێژ ناکات یان لە ڕەمەزاندا بە ڕۆژو نابێت یان خەریکی ئارەق خواردنەوەو قومارە، نەخێر بەڵکو ئەوانەش لە کات و شوێنی خۆیدا ئیسلام و موسڵمانان سودیان لێ وەردەگرن و لەبەر ئەوەی بێباوەڕ نین چەندێ بسوتێن لە دۆزەخدا ڕۆژێك هەر دێت خوا بەزەیی پێیاندا بێتەوەو بیانباتە بەهەشت.

٤ـ ئەبێ گوناهکارو خواناسێکی وەك ئەو پیاوە خراپەی چیرۆکەوە لە کاتی پێویستدا گەیشتە فریای برایەکی موسڵمان و لە تێنویەتی ڕزگاری کرد.

ئەی دەبێت موسڵمانی خواناس هەڵوێستی چۆن بێت لە بەرامبەر برایەکی موسڵمان کە پێویستی تێی بکەوێت و بۆی ئەنجام بدات.

٥ـ دەبێت زۆر وریا بین و باسی خواناسی و پیاوچاکان بە ئەدەبەوە بکەین و بێ حورمەتی بەرامبەریان نەنوێنین. چونکە ئەوانە وەلین و دۆست و ئەحبابی خوان و خوا بڕیاری داوە کە دژایەتی ئەو کەسانی دەکات کە دژایەتیان دەکەن.

ئەوەتا ئاوپێدانێکی لە لایەن فاسقێکەوە دەبێتە هۆی لێخۆشبونی خاوەنەکەی.

٦ـ ئەی دەبێ تاوانی ئەو کەسانە چی بێت کە دژایەتی هەڵگرانی بیروباوەڕی پاکی ئیسلام دەکەن پەنا بە خوا؟ کە نەك پێویستیان تەواو ناکات بەڵکو موچەیان دەبڕن‌و گەمارۆی ئابوریان دەخەنە سەرو لە پلەو پایەو بەرزکردنەوە مەحرومیان دەکەن.

٧ـ (إیثار) واتە تۆ شتێکت بۆ خۆت کڕیوە بەڵام دەبینی برایەکی موسڵمانیشت پێویستی پێیەتی بەڵام پارەی نیە بیکڕێت‌و تۆش لەبەر خوا پێ دەنێی بە جەرگی خۆتداو دەڵێی من قەیناکە با بیدەم بە برا موسڵمانەکەم‌و ئەوەش چلەپۆپەی خێرکردنە.

٨ـ هەرگیز نەکەیت چاکە لەگەڵ خەڵکی بکەیت‌و پاشان بیدەیتەوە بە ڕویداو بیکۆڕێنیتەوەو هەر باسی بکەیتەوەو منەت بخەیتە سەری.. ئەوە تاوانێکی گەورەیەو خێرو چاکە بەتاڵ دەکاتەوە..

بەڵام لە حاڵەتی فەوتان‌و تیاچوندا.. زۆر زەرورە ئەو چاکەیە لە لای ئەو کەسەی کە چاکەکەت لەگەڵدا کردوە باس بکەیت‌و بەڵکو لەو تەنگانەیەدا بگاتە فریات‌و پاداشتەکەیت بداتەوە.

٩ـ ئەگەر یەکێك هات بۆ لات‌و چاکەیەکی خۆی بەسەرتەوە باس کرد، تۆ زۆر سوپاسی بکەو بڵێ چاکم لەبیرەو تا ماوم سوپاست دەکەم‌و ئەگەر توانیشت پاداشتی ئەو چاکەیەی بدەرەوە..

هەرگیز لێی زویر مەبەو مەڵێ ئەمە چاکە کۆراندنەوەیە.

١٠ـ ئەگەر یەکێك چاکەیەکی لەگەڵتدا کردبو کاتی خۆی‌و خستیەوە یادت پێت ناخۆش نەبێت‌و بڵێ ئازۆر چاك لەبیرمەو یەکسەر پاداشتێکی وای بدەرەوە زۆر گەورەتر بێت لە چاکەکەی ئەو..

١١ـ لە کاتی پێویستدا خۆت بناسێنە.. با ڕێزی تەواوت لێ بگیرێت‌و لەو تەنگەژەیە بگەنە فریات.

١٢ـ لەوانەیە مرۆڤ بە یەك کردەوەی چاك لەبەر خواو بە تەنهاو بە نهێنی بیکات خوا لە هەمو گوناهو سەرپێچیەکانی پێشوی خۆش ببێت.

١٣ـ کردەوەی جوانو بەندایەتی کردنو خواناسی مرۆڤ ڕزگار دەکات لە ڕۆژی قیامەتداو نەك هەر ئەوە بەڵکو خوای گەورە مەجالی ئەوەشیان پێ دەدات کە ئەوانەشی لە دنیا چاکەیان لەگەڵ کردون تکای لێخۆشبونیان بۆ بکەنو خوایش داواکانیان ڕەد ناکاتەوە.

١٤ـ بە فەرمودەکەدا دیارە دۆستو ئەحبابانی خودا هێشتا سەرەی لێپرسینەوەشیان نەهاتبێت لە گۆڕەپانی مەحشەردا (تکا بکەن) خوای گەورە تکاکایان ڕەد ناکاتەوە.

١٥ـ بە فەرمودەکەدا دیارە کە مرۆڤ ئەگەر لە شوێنی ناسراو بو، دەستی دەڕۆیشت دەتوانی کارئاسانی بکات بۆ ئەو کەسانەی کە وەك ئەو، ئەو ڕێزو ناسراویەیان نیە..

بە مەرجێك زوڵمو ناهەقی دەرهەق بە کەسانی تری تێدا نەبێتو نەچێتە ڕیزی واسیتەکردنەوە کە ئەوە حەرامە لە ئیسلامداو مافی کەسانی دیکە پێشێل دەکرێت تیایدا.

١٦ـ ئەگەر کەسێك ئەوەندە ڕێزی لە لای تۆ هەبو کە بە خۆیدا دەنازی کە سکاڵای خەڵکی بەرز دەکاتەوە بۆ لاتو لە ڕێگەی تۆوە شتێکیان بۆ بکات، تۆش نائومێدی مەکەو سوکی مەکە لەبەر چاویانو داواکانی ڕەد مەکەرەوە.

١٧ـ ئەگەر ویستت لە لای بەرپرسێکی گەورە تکایەك بۆ کەسێکی هەژارو بێ دەست بکەیت کە چاکەیەکی بە سەرتەوە هەیەو تۆش دەتەوێ بەو کارە پاداشتی بدەیتەوە..

تا بۆت دەکرێت شێوازی داواکاریەکەت لەو بەرپرسە زۆر جوانو پڕ لە ئەدەب بێت.

نابینی پیاوچاکەکە بە خوای گەورەی وت: (بەڵکو بیبەخشی بە من) چەند شێوازێکی جوانە..

سەیر بکە وەك ئەمر پێی نەوت: فەرزی نەکرد لەسەر خوا! و بە مانایەك پێی وت کە ئەگەر بۆی بکات چاکەو ئەگەر بۆشی نەکات زۆر ئاساییە.. واتە سەربەستی کردنو نەکردنەکەی گەڕاندەوە بۆ خوای گەورە.

١٨ـ ئەمەو چەندان پەندو ئامۆژگاری تر کە من پەیم پێ نەبردوە.

## القصة السادسة والعشرون
## المذنب الخائف

عن ابي سعيد الخدري (رضي الله عنه) عن النبي (ﷺ): ((ذكر رجلاً فيمن كان سلف أو قبلكم، آتاه الله مالاً وولداً)) قال: فلما حُضِرَ قال لبنيه: أيُّ أب كنت لكم؟

قالوا: خير أبٍ، قال: فإنه لم يبتئر عند الله خيراً، وإن يقدم على الله يُعذبه، فانظروا، فإذا انا مت فأحرقوني، حتى إذا صرتُ فحماً فاسحقوني، أو قال: فاسهكوني.

ثم إذا كان ريح عاصف فأذروني فيها، فأخذ مواثيقهم على ذلك وربيّ، ففعلوا.

فقال الله: كنْ، فإذا رجُل قائم، ثم قال: أي عبدي، ما حملك على ما فعلت؟

قال: مخافتك، أو فرقٌ منك، فما تلافاه أن رحمه الله)).[1]

واتە: ئەبو سەعیدی خودری (خوا لێی ڕازی بێت) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی:

دەگێڕنەوە لە ئومەتەکانی پێشو یان ئومەتانی پێش ئێوەدا پیاوێك هەبو خوای گەورەماڵو سامانو کوڕی زۆری پێ بەخشیبو..

لە کاتی سەرەمەرگیدا کوڕەکانی کۆکردەوەو پێی وتن: من چۆن باوکێك بوم بۆتان؟

هەمو وتیان: باشترین باوك بویت، وتی: بەڵام پێم وایە هیچ کارێکی خێرم بۆ خوا نەکردوە، وا دەزانم بگەڕێمەوە بۆ لای خوا سزام دەدات، سەیرکەن، هەرکاتێ مردم لاشەکەم بسوتێنن، کاتێك بوم بە خەڵوز، بیهاڕن (وەکو ئارد).

پاشان لە ڕۆژێکی ڕەشەبادا بمدەن بە دەم ڕەشەباوە.. و لەسەر ئەو وەسیەتە بەڵێنی لێ وەرگرتنو سوێندی پێ خواردن، و ئەوانیش بەو جۆرەیان کرد (کە باوکیان وەسیەتی بۆ کردبون).

---

١ رواه البخاري (٦٤٨١).

خوای گەورەیش فەرموی: ببەرەوە بە مرۆڤەکە، خێرا بویەوە بە پیاوەکەی جارانو لێی پرسی: ئەی بەندەکەم بۆچی ئەمەت کرد؟

ئەویش وتی: لە ترسی تۆ! لە حەیبەتی تۆ، هەر لەوێدا خێرا خوا لێی خۆش بو.

# چیرۆکی بیستو پێنجەم
# گوناهبارێکی تۆقیو

مام رسول پیاوێك بو.. زۆر دەوڵەمەند بو.. خاوەنی ماڵو سامانو کوڕو کاڵێکی زۆر بو..

ئەم پیاوە لە سەرەتای ژیانیدا خێرو خێراتی نەدەکردو دەستگرۆیی هەژارانو نەدارانی نەدەکرد مەگەر زۆر بە کەمی..

و بە بۆنەی خەریك بونی بە بازرگانیو پرۆژەکانیەوە بە شێوەیەکی شایستە خواناسیو بەندایەتی تەواوی بۆ خوا نەدەکرد..

ڕۆژان ڕۆیشتنو ڕۆژان تێپەڕین.. پیاوەکە پیر بو.. نەخۆش کەوتو گەیشتە کاتی سەرەمەرگو بە خۆی وت:

ئای پەروەردگارم.. من چەند کەمتەرخەم بوم دەرهەق بە تۆو فەرمانەکانی تۆ..

بە تەما نەبوم ڕۆژێك بێتە پێشەوەو ئاوا وەك لاك لەسەر جێگا بکەوم ولات نەما بۆی نەڕۆمو کالا نەماوە بازرگانیم پێوە نەکردبێت، کەچی ئەمە پاشەڕۆژمەو ئاخۆ دەبێت قیامەتم چۆن بێت پەنا بە خوا..

دەبێ بە چ ڕویەکەوە بگەڕێمەوە بۆ لای پەروەردگارم.. بە خێرو چاکەکانمەوە.. بە شەونوێژو ڕۆژومەوە.. شتێکم نیە شانازی پێوە بکەم لە ساحەی مەحشەردا، ئاەە.. دەبێت شتێك بکەم نەچمە بەردەمی لێپرسینەوەی خواییو زیندوم نەکەنەوە.. ئا بیرم کەوتەوە.. با کوڕەکانم بێن پێیان دەڵێم چیم لێ بکەن لە دوای مردنم..

مام رسول لەسەر قەرەوێڵەکە ڕاکشاوە باری تەندروستی زۆر زۆر خراپ بوە، کوڕەکانی بە چواردەوریدا دانیشتونو دوکتۆر فەحصی سنگی دەکاتو پاشان پێی دەڵێت: مام رسول ان شاء الله باش دەبیت.

مام رسول: زۆر سوپاست دەکەم.. لەبەر دڵی من وا دەڵێی بەلام من دوادواییمە سەد حەکیم ئەوەندەی دەردەدارێك نازانێت کوڕی پورم.

دوکتۆر دەڕواتە دەرەوەو باوکە ڕو دەکاتە کوڕەکانیو بە غەمناکیو پەژارەیەکەوە سەیریان دەکاتو دێتە قسەو دەڵێت:

کوڕە جوانەکانم... ئازیزەکانی ناو دڵم.. وەرنە پێشەوە..

هەمو کوڕەکان لێی کۆدەبنەوەو دەڵێن: گوێمان لێتە فەرمو چیمان پێ دەڵێیت؟

مام رسول: کوڕەکانم: من چۆن باوکێك بوم بۆتان؟

کوڕە گەورە: باشترین باوك بویت بۆمان.

مام رسول: بەلام لەگەڵ خودا بەو جۆرە نەبوم.. زۆر دەترسم لێم زویر بێتو سزایشم بدات چونکە ئیشوکاری دنیاو بازرگانی لە دنیا جوانەکەی خواپەرستیو بەندایەتیان کردم. قەد ڕوی بەردەمی پەروەردگارم نیە.. زۆر شەرمەزارم..

کوڕ: باوکە گیان تۆ شوکر خاوەنی بیروباوەڕێکی پاكو دڵێکی سافیو بڕوا ناکەم خوای گەورە لێت زویر بێت..

باوك: کوڕم سامانی دنیام لەبەردەستدا بو دەستم تێنەچوە خێر بکەم.. حەج بکەم.. یارمەتی هەژارانو هەتیوانو بێوەژنان بدەم.. زۆر دەترسم..

کوڕ: باوکە وا مەڵێ.. خوا زۆر بە ڕەمو بەزەییە..

مام رسوڵ: کوڕم کەسێك خۆی ڕەحمی بە خۆی نەکردبێتو کاری چاکەی بۆ قیامەت پێش نەخستبێت.. مەحاڵە ڕەحم شمولی بکات.. گوێ بگرن.. هەمو گوێ قوڵاخن..

مام رسول: کوڕم من مردنم نزیك بۆتەوە.. ئەگەر مامو چاك بومەوە.. دەست دەخەمە سامانەکەمو خێری زۆری لێ دەکەم.. بەلام ئەگەر مردم ئێوە خێرو خێراتی لێ بکەن بۆمو لە سامانەکەمان هەژاران دلخۆش بکەن.

کوڕ: بەسەرچاو باوکە گیان درهەمی ناهێڵین.. هەموی دەکەینە خێر بۆت..

باوك: واش نا.. بەڵكو بەشێكی بهێڵنەوە بۆ خۆتان.. بەلام من بۆ ئەوەم كۆ نەكردونەتەوە..

كوڕ: ئەی بۆچی؟ گیانمان فیدات بێت؟

مام رسول: ئەگەر مردم..

كوڕ: خوانەكا باوكە گیان (بە گریانەوە).

مام رسول: كوڕم مردن بەشی هەمو زیندەوەرێكە..و قسەم پێ مەبڕن.. ئەگەر مردم لاشەكەم مەبەن بۆ گۆڕستانو كفنو دفنم مەكەن..

كوڕ: چۆن؟ ئەی چیت لێ بكەین؟ هەمو كەس كە دەمرێت دەبرێت بۆ گۆڕستان وا نیە برایان؟ هەمویان: با..

باوك: كوڕەكانم لێم تێبگەن.. من ڕوی قەبرم نیە.. كردەوەی چاكم نیە.. دەترسم گۆڕ وەرم نەگرێتو هەڵم بداتە دەرەوە..

كوڕ: باوكە گیان.. خۆ تۆ نە پیاوت كوشتوە نە زینات كردوە؟!

باوك: ڕۆڵە خوا سامانی زۆری پێدام بەلام لە ڕێی خوا سەرفم نەكرد ئەوە گوناه نیە؟! بۆیە ئەگەر مردم.. لاشوكەم بسوتێننو پاشان: لاشەی خەڵوزینم بهاڕن وەك ئارد وردی بكەنو پاشان لە ڕۆژێكی ڕەشەبادا بیدەن بە دەم باكەوە با هەر زەرەیەكی بە لایەكدا بڕواتو خوا زیندوم نەكاتەوە..

كوڕ١: باوكە چۆن دڵمان دێت لاشەی نەرمو شلت بە دەستی خۆمان بسوتێنین تۆ چی دەڵێی من هەرگیز ئەوە ناكەم.

كوڕ٢: منیش جورئەتی ئەوە ناكەم.. باوكە گیان تۆ بێ گۆڕ دەبیو سەردانی گۆڕەكەت نەكەین؟! نانا..

باوك: من ئەمە دوا وەسیەتمە بۆتان.. دەبێ جێبەجێی بكەن.. توخوا.. تو گەورەیی خوا.. جێبەجێی دەكەن؟..

كوڕەكان سەیرێكی یەكتریان كردو وتیان: بەڵێ..

مام رسول: بە بەڵێ ڕازی نابم سوێندم بۆ بخۆن ئەگینا وەسیەت دەکەم لە سامانەکەم مەحرومتان دەکەم؟

کوڕ١: بەڵێ بە عەزەمەتی خوا تۆ چۆنت پێ خۆشە جەستەکەت وا لێ دەکەین.

پاش ئەوەی پیاوەکە مرد، و کوڕەکانی وەسیەتەکەیان بۆ خەڵکی خوێندەوەو پاشان ئاگرێکیان کردەوەو خستیانە ناوی، پاشان ئێسكو پروسکی سوتاویان ورد کردو هاڕیو دایان بە دەم باوەو بە گریانەوە چونەوە بۆ ماڵەوە.

کاتێك کە ئەم کارانەیان ئەنجام داو بە گومانی خۆی وای دەزانی ئەگەر وا بکات ئیتر خوای گەورە لاشەکەی کۆ ناکاتەوەو زیندوی ناکاتەوە، بۆیە خوای گەورە بۆ ئەوەی بۆی بسەلمێنێت زیندوبونەوە بۆ خوا کارێکی زۆر ئاسانەو سوتانو وردو خاش کردنی جەستە ڕێگر نیە لە بەردەم کرداری زیندوکردنەوەیدا سەر لە نوێو لە دوای مردن..

بۆیە خوای گەورە پێی دەفەرموێت: (كُنْ) واتە ببەرەوە بە مرۆڤەکەی جاران..

یەکسەرو هەر لەوێدا پیاوەکەی جاران زیندو دەبێتەوەو سەیرێکی خۆی دەکاتو دەست دەهێنێت بە خۆیدا بە دەم خۆیەوە دەڵێت:

ئای کوڕە ناصاڵحەکانم وا دیارە نەیانسوتاندومو بەو جۆرەیان نەکردوە کە خۆم پێم وتون..

دەنگ: با.. کوڕەکانت ناصاڵح نینو وەسیەتنامەکەتیان جێبەجێ کردو سوتاندیتیانو پاشان دایتیان بە دەم باوە بەڵام دەسەڵاتی پەروەردگار زۆر لەوەش مەزنترە کە لاشەی وردو هاڕاوی سوتاو زیندو بکاتەوەو ئەو زیندوی کردویتەوە.

مام رسول: ئاخر من بۆ زیندو کرامەوە؟!.. کەی ڕوی بەردەمی خوای گەورەم هەیە.. من بێزم لە خۆم دێتەوە.. من شەرمەندەم.. بۆ زیندو کرامەوە من کەی ئەو پیاوە چاکەم کە بتوانم لە بەردەمی زاتی پەروەردگار ڕابوەستم..

دەنگ: باشە تۆ پێمان بڵێ بۆچی هەستای بەم کارەو بۆ نەتویست بخرێیتە ناو گۆڕ؟

مام رسول: ئاخر من بە ڕویەکەوە بچمە بەردەمی خوا؟ من لە ترسی پەروەردگارم ئەوەم کرد وتم بەڵکو زیندوم نەکاتەوەو پرسیارم لێ نەکات!

ئاخر چی وەڵام بەمەوە؟

دەنگ: دەی مژدەت لێ بێت.. کە مادەم ئەوەندەو تا ئەو ڕادە بەرزە لە خوا دەترسیو شەرم لە پەروەردگارت دەکەیت ئەوا خوای گەورە لێت خۆش بو.. لێت خۆش بو..

بە ڕاست.. بە ڕاست.. سوپاسی بێ پایان بۆ تۆ پەروەردگارم (لە خۆشیاندا لە هۆش خۆی دەچێت).

## پەندو ئامۆژگاریەکانی ئەم چیرۆکە

١ـ دیارە بونی ماڵو سامانو کوڕی زۆر بەخششێکی گەورەیەو پەروەردگار دەیدات بە بەندەکانیو تاقیان دەکاتەوە تا بزانێت سوپاسگوزارنو پاشان یارمەتی هەژارو لێقەوماوانی لێ دەدەن.

٢ـ باوك دەبێت ناوەناوەیەك منداڵەکانی کۆبکاتەوەو ڕاستەوخۆ دەربارەی خۆیو شێوازی بەڕێوەبردنی ماڵەکە پرسیاریان لێ بکاتو لەوانەیە ئەو هەندێ شت بکات ئەوان پێیان باش نەبێت وەك سەردەمی نوێیان.

٣ـ مرۆڤ هەرچەندە خواناسو موسڵمانێکی دروست بێتو کردەوەی جوانیش بکات هەر دەبێت بێ خەم نەبێت لە قیامەتو سزای سەختی خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا..

و وابزانێت کردەوەکانی لێ وەرنەگیراوەو کردەوەی نوێ ئەنجام بداتو تا بۆی بکرێت دڵسۆزی تیا بنوێنێتو لە ڕیاو ڕوپامایی بە دوری بگرێت.

٤ـ لە سوننەتی پێغەمبەرماندا (ﷺ) هاتوە کە موسڵمان دەبێت هەردەم وەسیەت بنوسێت یان بیکات چونکە مردن کتوپڕیەو شتێکی چاوەڕوان نەکراوەو لە ناکاو ناوت لەسەر زەوی دەسڕێتەوە.

تا وەك چاوڕۆشنیەك بێت بۆ نەوەکانی لە دوای خۆی کاری پێ بکەن چ لە ڕوی پارێزگاری لە بیروباوەڕی ئیسلامەتیو چ لە لایەنی ڕەوشتی بەرز یان مەسەلەی پارەو سامانو قەرزو شتەکانی ترەوە بێت.

٥ـ بۆ کەسانی مامۆستاو پەروەردەکار پێویستە لە دوای هەمو کارێکی جوان کە قوتابیو نەوەکانیان ئەنجامی دەدەن پرسیاری لێ بکات لە هۆی کردنی ئەو کارە.

ئیتر با خۆیشی هۆکارەکەی بزانێت، وەك چۆن خوای عز وجل لە بەندەکەی دەپرسێت بۆچی ئەو کارەت کرد لە دنیا؟

٦ـ کردەوە چاکەکانتو هۆکاری کردنی ئەو کردەوانە لە لای کەس باس مەکەو بە نهێنی لە نێوان خۆتو پەروەردگاردا بیهێڵەوە، بەڵام ئەگەر زۆر پێویست بو باسکردنی، دەتوانی لە شوێنو کاتی گونجاودا باسی بکەیتو خۆتی پێ ڕزگار بکەیتو یان حەقێکی پێ دەربخەیت.

## القصة السابعة والعشرون

## التائب احب الى الله

قال النبي (ﷺ): ((لله أشد فرحاً بتوبة عبده حين يتوب إليه من أحدكم كان على راحلته بأرض فلاةٍ، فانفلتت منه، وعليها طعامه وشرابه، فأيس منها، فأتى شجرة فاضطجع في ظلها قد آيس من راحلته.

فبينا هو كذلك إذ هو بها قائمة عنده، فأخذ بخطامها ثم قال: من شدة الفرح: اللهم أنت عبدي وأنا ربك، أخطأ من شدة الفرح)).[1]

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: ((خوای گەورە بە ئەندازەیەکی وا خۆشحاڵ دەبێت بە تەوبەو گەڕانەوەی بەندە تاوانبارەکان بۆ لای خوا، لەم مەسەلەیەدا لەو کەسە خۆشحاڵترە کە بە وڵاخێكو بارێکەوە ڕودەکاتە بیابانو لەو بیابانەدا حوشترەکەی بە بارەکەوە لێ ون دەبێت کە هەمو خواردنو ئاوو تفاقی بەسەر پشتی ئەو وڵاخەوە بو، زۆر گەڕا بە دوایدا بەڵام دواجار بێ هیوا بو ناچار ڕۆیشتە بنی درەختێكو لێی ڕاکشا تا چاوی بچێتە خەو چونکە زۆر بێ هیوا بو لە دۆزینەوەی.

ئەو لەو حاڵەتەدا بو کە چاوی کردەوە دەبینێ حوشترەکەی لەبەردەمیدا وەستاوەو لە خۆشیاندا پەلاماری ڕەشۆکەی داو گرتیو لە تاو خۆشیو سرور دەمی تەتەڵەی کردو وتی: ((ئەی پەروەردگارم تۆ بەندەی منیتو منیش خوای تۆم!))، لە خۆشیاندا زمانی هەڵەی کرد.

---

[1] رواه مسلم (٢٧٤٧).

# چیرۆکی بیستو حەوتەم

## تەوبەکار خۆشەویستترە لە لای خوا

ماڵی کاك ئەحمەد خەریکی ئامادەکردنی ئاوو خواردن سازکردنو دەیخەنە سەر حوشترەکە.. چونکە وا دیارە گەشتێکی قورسو دورو وشکی بیابانی لە ڕێدایە..

کوڕ: باوکە گیان.. هەمو شتێك حازرەو بارەکەت ئامادەیەو دەتوانی تەشریف بەریت.

کاك ئەحمەد: دەستتان خۆش بێت.. یاالله، با زو بڕۆمو دەبێت لەگەڵ خۆرئاوابوندا بگەمە دێیەکە.. با بڕۆم.. دەی خواحافیز ڕۆڵەکانم..

هەمو بنەماڵەکە خواحافیزی لێ دەکەنو چاویشیان بە فرمێسکە چونکە بڕینی بیابانێکی گەرمو وشك هەر وا ئاسان نییە، کە لەوانەیە جەردەو ڕێگر یان گورگ پەلاماری بدەن..

لە ڕێگە کاك ئەحمەد تینوی بوەو دەستی برد مەتارەیەکی لە پشتی حوشترەکەی داگرتو کەمێك ئاوی خواردەوەو بە دەم خۆیەوە دەیوت: ئەم بیابانە سەختو وشکە بە چی ببڕدرێت ئەگەر ئاوت پێ نەبێت، ئەمەی وتو مەتارەکەی خستەوە شوێنی خۆی.

کاك ئەحمەد ڕێگایەکی زۆر دورودرێژی بڕیوەو بە تەواوی ماندوو شەکەت بوەو ئاسەواری ڕێبواری پێوە دیارە.. بە دەم خۆیەوە وتی: زۆر ماندو بومو بە تەواوی برسیشمە با کەمێك لە بنی ئەو دارەدا سەرخەوێك بشکێنم دواتر نانێکی لێ دەخۆم.. یاالله.

کاك ئەحمەد حوشترکەی لە پاڵ خۆیدا بەرەڵا کرد.. بۆ خۆی بلەوەڕێت چونکە حوشترێکی هێمن بو نەدەترسا لەوەی بڕوات.

کاتێك خەبەری بویەوەو سەیرێکی ئەملای کرد وتی: ئای کە برسیمە بەڵام سەرەتا با کەمێك ئاو بخۆم خۆ گەروم وشك بو لە تینواندا.. ئەی ئەوە حوشترەکەم کوا؟ چی لێ هات؟

ئەملاو ئەولای درختەکە دەگەڕێت.. بەڵام نەیدۆزیەوە.

وردەوردە بۆی دەرکەوت کە حوشترەکەی هەڵاتوەو دیار نەماوە بۆیە قەڵەمی دەستو ئەژنۆی شکا..

دواتر چو پشتی گردۆلکەکان گەڕا بەڵام حوشترەکەی لەوێش نەبو.. دای بە تەوقی سەریدا دەستی کرد بە دوعاو پاڕانەوەو دەیوت:

پەروەردگارم.. ئەی فریادڕەسی هەمو لێقەوماوان.. من لەم بیابانەدا نەکوژی لە برسێتیو تینوێتی..

وا خەریکە لە تینواندا دەمرم.. خوایە بگەرە فریام.. هەمو ئاوو خواردنەکە بەسەر کۆڵ حوشترەکەمەوە بو.. هەموی بردو منیش بە دەستی بەتاڵ ماومەتەوە..

بە دەم خۆیەوە: خوا گەورەیە.. انشاء الله دەیدۆزمەوە.. چی لێ دێت.. خۆ هەر لەم ناوەدایە..

دەڕواتو دەکەوێت.. زۆر تینویەتی.. شەکەت بو. کەوتە زەویەکەو لە حەیبەتی برسێتیو تینوێتی نەیدەتزانی چی بکاتو هەر غیرەتی بە خۆی دەدا بەڵام بێ سود بو هەر دەکەوتەوە..

ئەوەبو بڕیاری دا بچێتەوە بنی دارەکەی خۆیو یەکەمجارو لەوێ ڕاکشێتو بەڵکو خەوی لێ بکەوێت..

کاك ئەحمەد چوە خەوێکی قوڵو لە ناکاو خەبەری بویەوەو چاوی کردەوە بە دەم پرمەی حوشترەکەیەوە..

دەبینێت وا حوشترەکەی بە بارەکەیەوە لەبەردەمیدا سەری داخستوەو وەستاوە..

کاك ئەحمەد وتی: ئەرێ ئەمە خەوە یان ڕاستیە؟ چو پەلاماری حوشترەکەی داو تێر ماچی کردو پاشان خواردنو خواردنەوەکەی لێ داگرتو بە دەم ئاوخواردنەوە وتی:

ئەی پەروەردگارم نازانم چۆن سوپاست بکەم.. بە چ زمانێك سوپاست بکەم. ئەمە منم وا حوشترەکەت بە بارەکەیەوە بۆ گێڕامەوە؟ بە ڕاستی ئەی خوای پەروەردگارم تۆ بەندەی منیو منیش خوای تۆم!

هەر خۆی دوبارەی کردەوە: خوا خوا.. لە خۆشیاندا لێم تێك چو (استغفر الله، استغفر الله) ئەوە من چیم وت؟ ئەی پەروەردگارم بە ڕاستی تۆ خوای منیو منیش عەبدو بەندەیەکی بێ دەستەڵاتی تۆم،و ئەمەی وتو دەستی کرد بە نان خواردنو زۆر بە کەیفو دەم بە خەندە بو.

## ئەو پەندو ئامۆژگاریانەی لەم چیرۆکە وەردەگیرێت

١ـ خوای گەورە (جل جلاله) زۆر خۆشحاڵ دەبێت کاتێك بەندەیەکی گوناهبارو یاخی دەگەڕێتەوە بۆ لای‌و واز لە کاری زەشت دەهێنێت‌و ڕێگای چاکەو خواناسی دەگرێتەبەر.

ئەمەش ئەوپەڕی مانای بەزەیی‌و سۆزی تیایە بۆ نەوەکانی ئادەم‌و حەز ناکات سزایان بدات‌و بیانسوتێنێت.

٢ـ ئەگەر خەڵکی هەڵەیان کرد بەرامبەرمان‌و ئازاریان دەداین‌و گاڵتەیان پێ کردین‌و لەمپەریان دەخستە بەردەم کاروانەکەمان..

بەڵام پاشتر وازیان هێنا لەو کارەو دانیان نا بە هەڵەی خۆیاندا دەبێت زۆر خۆشحاڵ بین‌و هەمو هەڵەکانی پێشویان لە یاد بکەین‌و لێیان ببورین.

٣ـ نمونە هێنانەوە بە شتێکی زیندوو بەرجەستە زۆر گرنگە بۆ تێگەیاندنی خەڵکانی چواردەورمان.. نابینی پێغەمبەر (ﷺ) دەیەوێت ئاستی خۆشحاڵی خوا بۆ هاوەڵان دەربخات نمونە بەو پیاوە دەهێنێتەوە کە چەند خۆشحاڵ بو بە دۆزینەوەی حوشترەکەی.

٤ـ لە کاتی خۆشی چاوەڕواننەکراودا دەبێت ئاگامان لە خۆمان بێت‌و هەندێ کاری سەیر یان هەندێ وتە نەیەت بە دەمماندا‌و دوایی ببینە جێگەی لاقرتێی خەڵکەکە، من خۆم ئەوەم دیوە لە کاتی پرسەدا گریان‌و خۆدان بە زەویدام دیوە لە کەسانێك کە دوایی دەیانوت ئێمە شتی وامان نەوتوە؟!..

٥ـ دیارە لە دو حاڵەتدا مرۆڤ ئاگای لە خۆی نامێنێت‌و کۆنترۆڵی خۆی پێ ناکرێت:

یەکەم: بیستنی هەواڵێکی زۆر خۆشی چاوەڕوان نەکراو، یان هەواڵێکی زۆر ناخۆشی چاوەڕوان نەکراو..

# القصة الثامنة والعشرون

## أيوب مريض

عن أنس بن مالك (رضي الله عنه) قال: أن النبي (ﷺ) قال: ((إن نبي الله أيوب (عليه السلام) لبث به بلاءه ثماني عشرة سنة، فرفضه القريب والبعيد، إلا رجلين من إخوانه كانا يغدوان إليه ويروحان.

فقال أحدهما لصاحبه ذات يوم: تعلم والله لقد أذنب أيوب ذنباً ما أذنبه أحد من العالمين.

قال له صاحبه: وما ذاك؟

قال: منذ ثمان عشرة سنة لم يرحمه ربه فيكشف ما به.

فلما راحا إلى ايوب لم يصبر الرجل، حتى ذكر ذلك له، فقال أيوب: لا أدري ما تقولان؟ غير أن الله يعلم أني كنت أمرّ بالرجلين يتنازعان، فيذكران الله، فأرجعُ إلى بيتي، فأكفر عنهما، كراهية أن يذكر الله إلا في حق.

قال: وكان يخرج إلى حاجته، فإذا قضى حاجته، أمسكته امرأته بيده حتى يبلغ، فلما كان ذا يوم، أبطأ عليها، وأوحى الله إلى أيوب أن: ﴿ٱرْكُضْ بِرِجْلِكَ هَٰذَا مُغْتَسَلٌۢ بَارِدٌ وَشَرَابٌ﴾[1].

فاستبطأته، فتلقته تنظر وقد أقبل عليها قد أذهب الله ما به من البلاء وهو أحسن ما كان.

فلما رأته قالت: أي بارك الله فيك، هل رأيت نبي الله هذا المبتلى؟ والله على ذلك، ما رأيته أشبه منك إذ كان صحيحًا ! فقال: فإني أنا هو.

وكان له إندران أي، أندر للقمح، وأندر للشعير، فبعث الله سحابتين، فلما كانت إحداهما على أندر القمح أفرغت فيه الذهب حتى فاض، وأفرغت الأخرى في أندر الشعير الورق حتى فاض)).[2]

---

١ سورة ص (٤٢).

٢ صحيح ابن حبان، باب: ما جاء في الصبر والثواب، برقم: ٢٨٩٨، ج٧، ص: ١٥٧.

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەری وا (ﷺ) فەرمویەتی:

((پێغەمبەری خوا ئەیوب، هەژدە ساڵ لە ژێر تاقیکردنەوەی نەخۆشیدا بو، تا وای لێ هاتبو خزمو بێگانە لێی بێتاقەت بوبون جگە لە دو برای (موسڵمانی) نەبێت کە بەردەوام بەیانیانو ئێواران سەریان لێ دەدا.

تا کار گەیشتە ڕادەیەك کە یەکێکیان بە هاوڕێکەی تری وت: دەزانی سوێند بە خوا لەوانەیە ئەم ئەیوبە بەرامبەر کەسێك تاوانێکی کردبێت کە تا ئێستا کەس تاوانی وای نەکردبێت!

هاوڕێکەی وتی: بە چیا دەزانیت؟

ئەویش وتی: ئەوە بۆ هەژدە ساڵ دەڕوات خوا بەزەیی پیا نایەتەوەو شیفای نادات.

کاتێك ڕۆیشتنە خزمەت ئەیوب ئەو پیاوە خۆی نەگرتو ئەو قسەیەی گێڕایەوە بۆی.

ئەیوب (سەلامی خوای لێ بێت) فەرموی: نازانم ئێوە باسی چی دەکەن. بەڵام ئەوەی تێدایە کە خوای گەورە باش دەزانێت کە هەر کاتێك دابێتم بە لای دو کەسدا کە شەڕو ناکۆکیان بوبێت، و ناوی خوایان دەهێنا، واتە سوێندنیان پێ دەخواردو منیش دەگەڕامەوە بۆ ماڵەوەو کەفارەتی سوێندەکانیانم دەدا چونکە زۆر پێم ناخۆش بو ناوی خوا بەناهەق ببرێت (دەمزانی یەکێیان درۆ دەکات).

دەفەرموێت: کاتێك ئەیوب دەچو بۆ سەرئاوو پاشان دەهاتە دەرەوە خێزانەکەی دەستی دەگرتو دەیبردەوە بۆ سەر جێگاکەی خۆی.

ڕۆژێکیان درەنگ هات بۆ لای ئەیوبو خوای گەورەیش نیگای بۆ ناردو فەرموی: ئەمە ئاوێکی سازگارە خۆتی پێ بشۆو لێی بخۆرەوە.

ڕۆژێکیان خێزانی دوکەوتو کاتێك هاتەوە دەبینێت زۆر جوان بۆوەو دەردو بەڵاکەی پەڕاندوەو چاك بۆتەوە.

کاتێك بەو حاڵەتەوە بینی: هاواری کردو وتی: ئەی (بارك الله فیك) تۆ ئەیوب پێغەمبەرت دیوە کە نەخۆشە؟ دەی سوێند بە خوا تۆ هەر دەڵێی ئەویت کاتێك لەشی ساغ بو وەك ئێستا نەخۆش نەبو.

ئەیوب فەرموی: دەی ئەوە منم.. من ئەیوبم.

ماڵی دو کەنویان هەبو.. دانەیەکیان گەنمیان تێ دەکردو دانەکەی تریان جۆیان تێ دەکرد.

خوای گەورەیش دو هەوری نارد یەکەمیان چوە ڕاسەری گەنوی گەنمەکەو ئاڵتونی تێ باراند تا پڕ بو.

ئەوی تریشیان چوە ڕاسەریگەنوی جۆکەو زیوی تێ باراند هەتا پڕ بو.

# چیرۆکی بیستو هەشتەم

## ئەیوب نەخۆشە!

دو هاورێ دڵسۆزی ئەیوب پێکەوە لە قەراغی ئاوێکدا دانیشتونو قاچیان خستۆتە ئاوە ساردەکەوەو پێکەوە قسە دەکەن..

یەکەم: دەزانی ئەو خەڵکە زۆر بێ وەفان؟

دوەم: بۆچی؟

یەکەم: ئەیوب پێغەمبەرێکی مەزنی پەروەردگارە.. بەڵام هەر بەوەی نەخۆشەو لە جێگەدایەو جومگەکانی ئێشو ئازاریان هەیە.. لێی دورکەوتونەتەوەو بایەخی پێ نادەن..

یەکەم: دەی وایە برای شیرینم.. خەڵکی بە گشتی لە کاتی خۆشیو فەرحانیو سەرکەوتندا بانگخوازانیان خۆش دەوێتو شوێنیان دەکەونو دێنە ڕیزیانەوە..

دوەم: ئاخر چۆن دەبێ براکەم، ئاینی خوا پێویستی کردوە لە خۆشیو ناخۆشیدا لە خزمەت بانگەوازی پەروەردگارو بەرنامەکەیدا بین..

یەکەم: ئەی دەزانی زۆرینەی خەڵکی ئا بەم تێگەیشتنەوە ناڕوانن بۆ پێغەمبەرانی خواو ئاینە پاکەکانیان..

دوەم: کەواتە ڕاست ناکەن لە ئاینداریو خواناسیاندا!

یەکەم: نا من وای بۆ ناچم.. بەڵکو هەمو موسڵمانان باشنو (انشاء الله) خوا لێیان خۆش دەبێتو دەچنە بەهەشت!

دوەم: دەی کەواتە منو تۆ بۆچی بەردەوام شەوو ڕۆژ لە خزمەت ئەیوبدا بین کە مادەم ئەوانیش وەك ئێمە دەچنە بەهەشتەوە..

یەکەم: بەڵام پلەی ئەوان لە لای خوا ناگاتە پلەی دڵسۆزانو لێبڕاوانو ئەوانەی وەك مۆم خۆیان دەسوتێنن لە پێناو گەیاندنی پەیامی خواو بەردەوام درێژە بە کاروانی موبارەکی پێغەمبەران دەدەن..

دوەم: با بڕۆین.. ئەوەك پێستا پێغەمبەری ئازیزمان ئەیوب (سەلامی خوای لێ بێت) کەسی لا نەبێت‌و پێویستی پێمان بێت..

لەم دیمەنەدا ئەیوب نەخۆشەو لەسەر قەرەوێڵەیەك لەناو جێگەکەیدا ڕاکشاوەو سەری بەستوەو خێزانەکەی سەری دەشێلێت..

دو هاوڕێکەی لە دورەوە ئەو دیمەنە دەبینن دەست دەکەن بە گفتوگۆ:

یەکەم: دەزانی هاوڕێکەم.. وا بۆ هەژدە ساڵ دەڕوات پێغەمبەری ئازیزمان ئەیوب لەناو جێگەدایەو نەخۆشە.. بە ڕاستی سەبرو ئارامی ئەوێ هەژدە ساڵ!! بە دەم خۆشە!!

دوەم: ئەمە تەنها لە پێغەمبەران دێت.. من موچەتایەك دەگرم هاوارم لێ هەڵدەستێت‌و خێرا داوای شیفا لە خوا دەکەم‌و خۆم ناگرم.

یەکەم: پێغەمبەرمان (سەلامی خوای لێ بێت) وانەی خۆگری‌و ئارامی دەدات بە گوێی شوێنکەوتوانیداو فێری سەبرو ئارامییان دەکات.

دوەم: ئەی سەیری خێزانەکەی بکە.. ئەوە نمونەی خوشکی باوەڕداری بە وەفایە بۆ هاوسەرەکەی.. زۆر ژن هەیە لە کاتی دەستکورتی یان نەخۆشیدا مێردەکانیان پشتگوێ دەخەن یان لێیان جیادەبنەوە.

یەکەم: بەڵام ئەم خێزانەی ئەیوب پەروەردەی دەستی باوکیەتی یوسف پێغەمبەرەو (مەنشا) بە ڕاستی ڕێبازی باوکی ون نەکردوە.[1] تەنانەت ئیشی دەرەوەشی بۆ دەکات‌و بژێوی ژیانی مسۆگەر کردوە.

دوەم: ئایا دەزانی سەرەتا پێغەمبەرمان چەند جوان‌و پێکەوتو بو.. چەند دەوڵەمەندو کوڕو کچدار بو.. کەچی بە هۆی ئەم نەخۆشیەوە هەموی لە دەست داو هەژار کەوتوە..

یەکەم: هەندێ جار (خوا بە گوناه لە دڵم نەینوسێت) ختورەیەك دێت بە خەیاڵمدا..

---

١ ابن کثیر لە (البدایة)دا لاپەڕە (٣١٧/١)دا دەفەرموێت ئەمە ڕاسترینی ڕیوایەتەکانە واتە کچی یوسف پێغەمبەرە.

دوەم: چیە؟ پێم بڵێ. منو تۆ دو هاوڕێی دڵسۆزین بۆ یەکتری؟

یەکەم: دەڵێم بۆچی خوای گەورە (١٨) ساڵە شیفای نادات؟ لەوانەیە (خوایش دەزانێت) گوناهێکی وای کردبێت کە تا ئێستا هیچ کەس گوناهی وای نەکردبێت.

دوەم: استغفر الله، ئەوە تۆ چی دەڵێی؟ ئازیزەکەم.. ئەوە قسەی تۆ نییە؟ شتی وا نەڵێی! مەرج نیە هەر کەسێك چاك نەبێتەوە لە نەخۆشی ئەوە خوا تۆڵەی لێ دەکاتەوەو هەڵەی کردوە..

باشە با بڕۆین بۆ لای ئەوەتا هەر خۆیەتی خێزانی چوە دەرەوە.

هەردوکیان دەچنە خزمەت ئەیوب سڵاوی لێ دەکەن..و ئەویش سڵاویان وەڵام دەداتەوەو هەردوکیان بە نۆرە ناوچاویو دەستی ماچ دەکەنو لە لای سەریدا دادەنیشن..

ئەیوب: یاخوا بەخێر بێن.. نازانن چەند دڵم پێتان دەکرێتەوەو لێتان ڕازیم.. تەنها ئێوەن کە فەرامۆشتان نەکردومو بەردەوام سەردانم دەکەنو لە تەندروستیم دەپرسن..

دوەم: قوربان ئازایەتی ناکەین.. ئێمە خزمەتکردنی تۆو سەردانی تۆو دڵخۆشکردنی تۆ بە واجبی سەر شانی خۆمانی دەزانینو فەرمانی پەروەردگارمان جێبەجێ دەکەین..

یەکەم: ئێمە هەمو تکایەکمان لە خوا گەورە ئەوەیە کە شیفای خێرات بۆ بنێرێتو چاك بیتەوەو لەگەڵماندا پێکەوە پەیامی خوا بگەیەنینە مرۆڤەکان.. هەرچەندە سوپاس بۆ خوا ئێمە بەو کارە هەستاوینو بەردەوام فەرمایشتی خواو وتەکانی تۆ دەدەین بە گوێی مرۆڤە سەرگەردانەکانداو قسوریمان نەکردوە.

ئەیوب: دەزانم.. دەزانم.. خوای گەورە سەربەرزی دنیاو قیامەتتان بکات ئەگەر چاك بومەوە ئەوە کاری سەرشانتان سوك دەکەمو خۆم لەگەڵتاندا پێکەوە ئاینی یەکتاپەرستی بڵاودەکەینەوە بەڵام چی بکەم من ئاوا کەلەلامو لەناو جێگادام.. بەڵام خوایەگیان لەمە نارەحەتترم مەکە تا سەبرم لێ نەبڕێتو لە پاداشتی ئارامگران بێ بەش نەبم..

دوەم: قوربـان (ئێمـە بڕیارمـان داوە) هیـچت لێ نەشـارینەوەو هـەمو شـتێکت بـۆ بگێڕینەوە تا ئامۆژگاری‌و ئاراستەی جوانمان بکەی..

ئەیوب: هیچ ڕوی داوە کە من نەمزانیبێت؟

دوەم: بەڵێ.. ئەم هاوڕێیەمان گومـانێکی بـۆ دروست بـوەو دەڵـێ بۆچـی (١٨) سـاڵە خوای گەورە ئەیوب چـاك ناکاتـەوە دەترسـم گونـاهێکی کردبێـت کـە کـەس گونـاهی وای نەکردبێت..

ئەیوب: ئەی پەروەردگارم تۆ شایەتی حاڵی منـی.. تـا ئێـستا نـە گونـاهم کـردوەو نـە دڵیشم بۆ گوناه لێی داوە.. (سوپاس بۆ خوا) بەڵام پێ بزانم ئـەوەی مـن کردومـە ئەوەیـە کە هەرکاتێك دابێتم بە لای دو کەسدا.. کە دەستیان دابێتە یەخەی یەکترو لەسـەر شـتێك سوێندیان خواردبێت.. من چومەتەوە بۆ ماڵو لەبەر ئەوەی پـێم نـاخۆش بـوە نـاوی خـوا ببرێت با ناهەق‌و سوێندی درۆی پێ بخورێت..

کەفارەتی سوێندی هەروکیانم داوە..

هەردو هاوڕێکەی هەڵدەسن‌و دەڕۆنە دەرەوە.

ئـەیوب (سـەلامی خـوای لێ بێـت) بـە ئێـشوئازارەوە هەڵدەسـێتە سـەرپێ‌و خەریکـە دەکەوێت بەلا.. خێرا خێزانەکەی دێت‌و دەچێتە ژێر باڵی‌و دەیبات بۆ سەرئاو..

لە دەرەوە دەوەستێت هەرکە دێتە دەرەوە خێرا دەچێتەوە ژێر بـاڵی‌و دەیباتـەوە بـۆ سەر جێگاکەی‌و ڕادەکشێتەوەو خێزانەکەی بـە دەم خۆیـەوە دەڵـێ: (ئـەی پـەروەردگارم ئەوە (١٨) ساڵە ئەم هاوسەرەم لەناو جێگەدا نەخۆشی ڕۆمـاتیزم‌و جومگـە ئێـشە تـەنگی پێ هەڵچنیوە.. خوایە شیفای بۆ بنێریت‌و لـەم تاقیکردنەوەیـە ڕزگـاری بکـەیت.. بـە دەم ئەم قسانەوە (مەنشا) زەمیلەکەی هەڵگرت‌و بەرەو بازاڕ چوە دەرەوە..

کەمێ زۆری پـێ چو لەو کاتەدا خوای (عز وجل) هات بە دەمیـەوەو شـیفای داو ڕێگـای چارەسەری بۆ دیاری کردو پێی فەرمو: لەم ڕوبـارە خـۆت بـشۆرەو ئاویـشی لێ بخـۆرەوە چاك دەبیتەوە، کاتێك (مەنشا)ی خێزانـی گەڕایـەوە شـتێکی زۆر سـەیری بینـی، بینـی وا

ئەیوب زۆر لە جاران جوانتر بۆتـەوەو لـە نەخۆشـیەکەی ڕزگـاری بـوەو خـوا شـیفای بـۆ ناردوە..

بۆیە بە خێرایی بەرەو ڕوی ئەیوب ڕۆیشتو پێی وت:

ئەك بارك الله فیك! ئایا تۆ ئەم پێغەمبەرەی خوات بینیوە کە دوچـاری نەخۆشـیە؟ بـە ڕاستی بێ کەمو زیاد تۆ دەڵێی ئەیوبی‌و پێش ئەوەی نەخۆش بکەوێت..

ئەیوب بە دەم پێکەنینەوە فەرموی: جوان سەیرم بکە هاوسەرە خۆشەویستەکەم.. من ئەیوبم.. سوپاس بۆ خوا چاك بومەتەوە.. من خۆیم..

خێزانەکەی دەستی هەڵبڕی بۆ ئاسمان سوپاسێکی بێ پایانی پـەروەردگاری کـردو لـە خۆشیاندا دەستی دەهێنا بەسەرو لاشـەی هاوسـەرەکەیداو پـەلاماری داو هـەردو دەسـتی ماچ کردو چاوەکانی هەردوکیان پڕبون لە ئاو..

دو کەنویان دانابو (یەکێك بۆ ئاردی گەنمو یەکێك بۆ ئاردی جۆ)و خوای گەورە دو پەڵە هەوری ناردو یەکەمیان ئاڵتونی باراند بەسەر کەنوی یەکەمدا تا پڕ بو.. دوەمیشیان زیوی باراند بەسەر کەنوی دوەمدا تا پڕ بو..

هـەردوکیان دەسـتیان بـەرزکردەوەو سوپاسـی خوایـان کـردو دو هاوڕێکەشـی وەك شێتیان لێ هاتو لە خۆشیاندا پەلاماری ئەیوبیان داو ماچیان دەکرد..

## پەندو ئامۆژگاریەکانی ئەم چیرۆکە

١ـ نەخۆشکەوتنی پێغەمبەرێکی خوا (سەلامی خوای لەسەر بێت) بۆ ماوەیەکی درێژخایەن، ئەوەمان تێدەگەیەنێت کە ئەگەر خوا کەسێکی نەخۆش خست بەڵگەی ئەوە نیە کە ڕقی لێیەتی‌و خۆشی ناوێت..

٢ـ نەخۆشی پلەوپایەی خواناسان بە ڕادەیەك بەرز دەکاتەوە کە پێشتر بە خەیاڵی کەسدا نەهاتبێت.

وەك پێغەمبەرمان (ﷺ) دەفەرموێت: ((ان العبد اذا سبقت لە من الله منزلة لم يبلغها بعمله ابتلاه الله في جسده او في ماله او في ولده، ثم صبر على ذلك حتى يبلغه المنزلة التي سبقت له من الله تعالى)).[١]

واتە: ئەگەر خوا جێگەیەکی زۆر بەرز لە بەهەشتدا ئامادە بکات بۆ کەسێك‌و کەچی کردەوەکانی بایی ئەوە نەبێت، دوچاری نەخۆشی‌و نەبونی‌و کوڕ مردنی دەکات‌و ئەویش خۆی دەگرێت‌و بەو ئارامیەی دەگاتە ئەو پلەوپایەیەی کە زوتر بۆی بڕیار دراوە.

٣ـ مرۆڤی بانگخواز دەبێت ئەوەی لە لا ڕون بێت کە هەندێ وەزعی دێت بەسەردا لایەنگرو شوێنکەوتوانی وەك پێویست لە خزمەتیدا ئامادەباش نابن‌و ژمارەیەکی زۆر کەم دەمێننەوەو ناهێڵن ئاڵاکە بکەوێتە زەوی.

٤ـ لەوانەیە هەندێ قوتابی‌و لایەنگرانت لە ڕوی تۆدا هەندێ قسە بکەن کە لایەقی پلەوپایەی تۆ نیە بەڵام نابێت زویر ببی، توڕە ببی بەڵکو وەك ئەیوب (سەلامی خوای لێ بێت) بە نەرمی وەڵامیان بدەرەوەو بۆیان ڕاست بکەرەوە.

٥ـ موسڵمانی تێکەیشتو دەبێت پێی ناخۆش بێت کە خەڵکی قەدرو ڕێزی تەواو نابەخشنە پەروەردگارو کە هەق‌و ناهەق سوێندی پێ دەخۆن.

٦ـ دەبێ پێت ناخۆش بێت‌و حەز نەکەیت برا موسڵمانەکانت دوچاری گوناهو تاوان ببن‌و بەڵکو دەبێت بەردەوام داوای لێخۆشبونیان بۆ بکەی لە پەروەردگارو ئەوە ئەیوبە

---

١ صحيح، (سەیری) صحيح ابن داود بکە، ژمارە (٢٦٤٩).

(سەلامی خوای لێ بێت) کەفارەتی سوێندی ئەو دو کەسە دەدات چونکە دەزانێ سوێندی یەکێکیان درۆیە بەڵام نازانێت کامیانە.

٧ـ ئەگەر هەواڵت پێ گەیشت کە برایەکی موسڵمانت لە زانکۆ وەرگیراوە یان لە نەخۆشی چاك بۆتەوە یان لە بازرگانیدا قازانجی باشی کردوە، خێراو بەبێ دواکەوتن زۆر پێویستە خۆشحاڵی خۆتی بۆ دەربخەیت وەك چۆن خێزانی ئەیوب (سەلامی خوای لێ بێت) خۆشحاڵ بو کە بینی ئەیوب وەك جاران چاك بۆتەوە.

٨ـ دەبێت ئافرەتی موسڵمان زۆر خۆگرو بە ئارام بێت بەرامبەر هاوسەرەکەیو نارەحەتیەکانی قبوڵ بکات ئیتر هەژاری بێت یان نەخۆشی یان بونی دایكو باوکی پیرو بەساڵاچوی بەسەریەوە بێتو ئەوە تاقیکردنەوەیەو ئاگادار بێت نەکەوێتو خەسارۆمەندی هەردو دنیا نەبێت.

٩ـ هەرکەسێك خوا بەڵایەکی بەسەردا بهێنێتو ئەویش باوەڕ پۆڵایین بێتو هەر شوکر بێتو ناشکوری دەرنەبڕێت ئەوە لە قیامەتدا پاداشتی نەبڕاوەی بۆ هەیە: ﴿إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّـٰبِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾و لەوانەشە هەر لە دنیا خێرو چاکە بڕژێنێت بەسەریدا.

نابینی ئەیوب (سەلامی خوای لێ بێت)، (١٨) ساڵ بە دەم ئێشو ئازارەوە دەیناڵاند کەچی هەر صابرو بە ئارام بو.. خوایش هەر لە دنیادا کەنوی ئاردو جۆکەی بۆ پڕ کرد لە ئاڵتونو زیو.

١٠ـ لە بەسەرهاتی ئەیوبدا دەردەکەوێت کە نەخۆشیەکەی ڕۆماتیزم بوەو ئازاری جومگەکانی هەبوەو هەرگیز گول نەبوەو کرم لێی نەداوەو لە لادێ دەرنەکراوە وەك لە ئیسرائیلیاتەکاندا هاتوەو هەموی درۆو بوختانەو دەم هەڵبەستی جولەکەو گاورەکانەو بە داخەوە هەندێ لە وتاربێژە موسڵمانەکانیش دەیگێڕنەوە بەو شێوە هەڵبەستراوە.

١١ـ مەرج نیە هەر شتێك نەچوە نیتاقی عەقڵەوەئیتر وەرنەگیرێتو فەرمودەکە لاواز بکرێت! بەڵکو دەچێتە خانەی موعجیزەوەو خوای گەورە لە توانایدا هەیە فەرمان بە هەور بکات لە باتی باران، ئاڵتونو زیو ببارێنێت یان چۆن مرۆڤ لەسەر قاچ دەبات بە ڕێوە.. هەر بەو شێوەیەش بەردیش بەرێت بە ڕێوە.

# القصة التاسعة والعشرون

## جُرة ذهب

عن ابي هريرة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ): ((اشترى رجلاً من رجلٍ عقاراً له، فوجد الرجل الذي اشترى العقار في عقاره جرة فيها ذهب.

فقال له الذي اشترى العقار: خذ ذهبك منّي، إنما اشتريت منك الأرض، ولم أبتع منك الذهب.

وقال الذي له الأرض: إنما بعتك الأرض وما فيها ! فتحاكما إلى رجل.

فقال الذي تحاكما إليه: ألكما ولد؟ قال أحدهما: لي غلام، وقال الآخر: لي جارية.

قال: أنحكوا الغلام الجارية، وأنفقوا على أنفسهما منه وتصدقا)).[1]

واتە: ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: پیاوێك پارچە زەویەك لە پیاوێك دەکڕێت،و ئەو پیاوەی زەویەکەی کڕیبو لەناو زەویەکەدا گۆزەیەکی پڕ لە ئاڵتونی دۆزیەوە.

ئەوەی زەویەکەی کڕیبو بە فرۆشیاری زەویەکەی وت: ها ئاڵتونی خۆت بەرەوە چونکە من زەویم لێ کڕیبویت نەك ئاڵتون.

خاوەن زەویەکەش وتی: من زەویم پێ فرۆشتویت بەوەشی کە تیایەتی. بۆیە بۆ ناوبژیکردن پەنایان بردە بەر پیاوێك.

ئەو پیاوەش کە دادوەر بو لە نێوانیاندا وتی بە یەکەمیان: تۆ کوڕت هەیە؟ وتی: بەڵێ، بەوی تریشی وت: ئەی تۆ؟ ئەویش وتی من کچم هەیە..

ئەویش وتی: دەی کچەکە لە کوڕەکە مارە بکەنو ئەو گۆزە ئاڵتونەش خەرج بکەن لە شاییەکەیانداو پاشان لێشی بکەن بە خێر.

---

١ رواه البخاري (٣٤٧٢) ومسلم (١٧٢١).

# چیرۆكی بیستو نۆیەم

## گۆزەیەك ئاڵتون

مام كریم لەگەڵ تاقە كوڕەكەیدا پێكەوە خەریكی دار وردكردنو بە دەم خۆیەوە دەیوت:

مام كریم: كوڕم دەمەوێت لە نزیكی خۆم پارچەیەك زەوی بكڕمو تۆ بیكەیت بە خانو.. چونكە تۆ هەروا نامێنیتەوەو دەبێت ژن بهێنی.. كوڕ: باوكەگیان من لە چاكەی تۆ دەرناچمو تۆ زۆر چاكی لەگەڵمدا بەڵام باوكە گیان تۆ دەزانی ئێمە هەژارینو كەسیش كچ بە هەژارێكی وەك من نادات.. واز لەو باسانە بێنە..

مام كریم: كوڕم ڕاستە ئێمە هەژارین بەڵام چونكە خوامان هەیە زۆر دەوڵەمەندینو هەمو كارێكیش بۆ خوا زۆر ئاسانەو هیچی تێ ناچێت.

كوڕ: وایە زۆر تەواوە بەڵام باوكە گیان خەڵكی بۆ ڕواڵەتو بە دەوڵەمەندی دەڕوانن‌و سەیری چاكی‌و لێهاتویی‌و ڕەوشتی بەرز ناكەن..

باوك: كوڕم من چاكی‌و لێهاتویی تۆ بە هەمو پارەی دنیا ناگۆڕمەوە بەڵام ئێستا واز لەم قسانە بێنەو بڕۆ بۆ لای مام رحیمو بزانە ئەو پارچە زەویە نافرۆشێت. زۆر نزیكە لە خۆمەوەو حەز ناكەم لێم دوركەویتەوە.

كوڕ: بەسەرچاو هەر ئێستا دەڕۆم..

مام ڕحیم: سلام علیكم برای بەڕێزم.. ئەی چاكترین هاوڕێ‌و چاكترین دراوسێم..

مام كریم: وعلیك السلام ورحمة الله، تۆ خواناس‌و شەونوێژگەری من چاكیم كوانێ.. ئا كوڕەكەم هات بۆ لات؟

مام رحیم: بەڵێ پێی وتم كە تۆ داوای ئەو پارچە زەویەت كردوە، نەمدەفرۆشت بەڵام بۆ تۆ كە چاكترین دراوسێمی قسەم نیەو لە خزمەتت دام..

مام كریم: زۆر مەمنونی ئەو متمانەیەتو دەستەكانت خۆش بێت بەڵام نرخێك بخەرە سەری با مانگاكانم بفرۆشمو پارەكەیت پێ بدەم..

مام کریم: تەنها دو مانگام پێ بدە لە بەرامبەریدا..

مام کریم: زۆر باشەو هەر ئەم ئێوارەیە دو مانگاکە دەخەمە خزمەتت.

مام کریم زەنگنێکی پێیەو بناغە هەڵدەکەنێتو کوڕەکەشی بە خاکەناسەکەیەوە دەری دەداتو پێکەوە ئیشیان دەکرد..

لە ناکاو کوڕەکەی هاواری کرد باوکە گیان مەکە.. زەنگن مەوەشێنە ئەوە گۆزەیەکە با نەشکێت..

مام کریم: گۆزەی چی کوڕم؟ کوا کوا؟

کوڕەکەی بە هێمنیو بە دەست گۆزەکە دەردەخاتو دەری دەهێنێت بەڵام زۆر قورسە.. دەستی پێیدا دەکاتو چنگێك ئاڵتون دەردەهێنێتو هاوار دەکات باوکە گیان پڕە لە ئاڵتون.. ئاڵتون.. باوك: کوڕم ئاڵتونی چی بە ڕاستتە ئا دەی بمدەرێ..

کوڕ: فەرمو باوکە گیان وا دیارە خوای گەورە دەروی لێ کردوینەتەوەو دەوڵەمەند دەبین..

باوك: لا حول ولا قوة الاّ بالله.. بە ڕاستی موصیبەتە.. ئەمە چییە بۆ خاتری خوا؟

کوڕ: باوکە بۆچی موصیبەتە؟ ئەمە ڕەحمەتە، ڕەحمەتەو حەڵاڵو زەڵاڵە!

باوك: کوڕم هەستە بڕۆ مام رحیم بانگ بکە، هەر ئێستا با بێت..

کوڕ: مام رحیمت بۆ چیە؟ چ پەیوەندی بەم گۆزەیەوە هەیە؟

باوك: تکا دەکەم زۆر قسە لە قسەمدا مەکەو بڕۆ بانگی بکە؟

کوڕ: بە چاوان بابە گیان.. دەڕوات بە دوایدا.

مام رحیم بە هەڵەداوان دێتو لە دورەوە دەڵێ:

مام کەریم گیان کارێکت هەیە وا بە دوامدا ناردوتە.. کوڕەکەت وتی زۆر بە پەلە وەرە.. چی بوە؟ منو تۆ برای یەکین چ پێویستیەکت هەیە لە خزمەتتدام.. خۆ خوا نەکردە شتی خراپ ڕوی نەداوە..

مام کەریم: زۆر سوپاسی بە دەمەوە هاتەنەکەت دەکەم‌و بە ڕاستی نمونەی دراوسێی چاکیت خوا وێنەی تۆ لەناوماندا نەبڕێت..

ها ئەم گۆزە ئاڵتونەم لەناو زەویەکەی تۆدا دۆزیەوەو بۆیە بانگم کردی تا ببیەیتەوە، چونکە بۆ من حەڵاڵ نیە، من زەویم لە تۆ کڕیوە نەك ئاڵتون‌و زیو، فەرمو ببیەرەوە یاخوا پیرۆزت بێت..

کوڕ: باوکە گیان ئەوە چی دەڵێی؟

مام کەریم: وس.. تۆ دەم نەکەیتەوە.. مافی ئێمەی پێوە نیە.. ڕۆڵە گیان

مام رحیم سەیرێکی گۆزەکەی کردو چنگی پێدا کردو پاشان دەری هێناو سەیرێکی کردو پاشان خستیەوە شوێنی خۆی‌و هات ناو چاوی مام کەریمی ماچ کردو وتی:

ئای لە ئاینی خوا چەند مرۆڤی ئەمین‌و دەستپاك دروست دەکات خۆ تۆ دەتتوانی قسەت بۆ نەکردمایەو هەمویت بۆ خۆت هەڵبگرتایە..

مام کەریم: شتی وا چۆن دەکەم.. ئەی پەروەردگارم چاوی لێ نیە؟ زوکە ببیەرەوە تا خەڵکی نەیزانیوە..

مام رحیم: منیش نایبەمەوەو نامەوێت..

کوڕ: چاوی ئەبڵەق بو.. وتی: ها.. ها.. تۆش ناتەوێت!؟

مام رحیم: بەڵێ نامەوێت چونکە ئەمە هی کەریمی برامەو هیچ مافێکی منی پێوە نیە..

مام کەریم: بۆ خاتری خوا ئەی ئەم زەویە هی تۆ نەبو..

مام رحیم: با..

مام کەریم: ئێ کەواتە هەرچی تێدا بێت هی تۆیە..

مام رحیم: نا نا وانییە.. من زەویەکەم پێ فرۆشتویت‌و هەرچی تێدایە حەڵاڵی تۆیەو هیچ پەیوەندیەکی بە منەوە نەماوە..

هەردوکیان بو بە دەمەقاڵەیان‌و کوڕەکەش لەو نێوانەدا واقی وڕمابو لە خۆشەویستی ئەو دوانەو دنیانەویستیان..

کوڕ: باوکە با ئەم قاڵە قاڵە بەس بێت، بۆچی نەچم بە دوای مامۆستا مەلا احمددا تا بە ژێری خۆی ئەم کێشەیەتان بۆ چارەسەر بکات.

هەردوکیان: زۆر باشە، بڕۆ بانگی بکە من زۆر زۆر بە شەرع ڕازیم‌و خۆشحاڵم پێی.

مامۆستا مەلا احمد لەگەڵ کوڕەکەدا گەڕایەوەو ڕوی کردە مام کەریم‌و وتی: لە ڕێگادا بڕوای کوڕت هەمو شتێکی بۆ گێڕامەوە.. ئەمە گیانی خۆشەویستی‌و برایەتی ڕاستەقینەیەو تەنها بیروباوەڕ دەتوانێت نمونەی وا پێشکەشی مرۆڤایەتی بکات.

مام کەریم: مامۆستا گیان، خۆ ئەمە ناڕەحەت نیەو زۆر ئاسانە.. ئەم گۆزە ئاڵتونە هی مام رحیمی برامە چونکە من زەویم لەو کڕیوە نەك ئاڵتون!

مامۆستا: وایە..

مام رحیم: چی وایە مامۆستا گیان تۆ بفەرمو گوێیەکیش لە من بگرە..

مامۆستا: فەرمو.. چۆن گوێش لە تۆ ناگرم.. هەردو چاوەکەم..

مام رحیم: من ئەم زەویەم بە هەمو شتێکیەوە فرۆشتوە بەم پیاوەو مافی هیچ شتێکم نەماوە تیایدا.. ئاڵتون‌و هەرچی تری تێدا بێت هی خۆیەتی.

مامۆستا لەسەر بەردێك دانیشت‌و دەستی خستە ژێر چەناکەی‌و دەستی کرد بە بیرکردنەوە لە مەسەلەکە بە دەم خۆیەوە دەیوت:

مامۆستا: خوای گەورە دەبێت چی بکەم کە هەردوکیان لەم ئاڵتونە سودمەند بن‌و وەری بگرن‌و بە حەرامی نەزانن؟!.. خۆ هەردوکیان کوڕو کچیان هەیە.. ئاهـ..

مامۆستا: مام کریم.. مام رحیم.. جوان گوێم لێ بگرن.. من زۆر بیرم کردەوە کە ئەم ئاڵتونە بە کامتان دەبڕێت بەڵام گەیشتمە قەناعەتێکی باش..

هەردوکیان: ئادەی مامۆستا گیان چیە پێمان بڵێ ئێمە لەبەردەم شەرعدا ملمان لە مو باریکترە..

مامۆستا: مام کەریم تۆ کوڕت هەیە؟و ئەوە کاکە بڕوایە گەورە بوە.

مام کەریم: بەڵێ مامۆستا گیان.. ئەوە ماشەڵا گەورە بوە پیاوێکە..

مامۆستا: ئەی تۆ مام رحیم کچت هەیە؟ گەورە بێتو وەختی شوی بێت؟

مام رحیم: بەڵێ کچێکی لەسەرخۆو نەرمو نیانم هەیەو پێگەیشتوە..

مامۆستا: دەی من پێشنیار دەکەم ئەم کچەت بدەیت بە کوڕی مام کەریمو ئەو گۆزە ئاڵتونەش خەرج بکەن لە شاییەکەیانداو پاشان چی مایەوە هەندێکی بدەن بە هەردوکیان بۆ ژیانیان.

مام کەریم: پێشنیارەکەت جوانەو من شانازی پێوە دەکەم کچی مام رحیم ببێت بە بوکم.

مام رحیم: ئەی باشە هەندەکەی تری چی لێ بکەین؟

مامۆستا: پێکەوە بەخێر دابەشی بکەن بەسەر هەژاراندا..

هەمو دەست دەکەن بە پێکەنینو دەڕۆنەوە بەرەو ماڵ.

## پەندو ئامۆژگاریەکانی ئەم چیرۆکە

١ـ کڕین‌و فرۆشتن هەر هەبوە لە پێش ئیسلامداو هیچ ئاینێك قەدەغەی نەکردوەو سود لە یەکتر وەرگرتنە بە حەڵاڵی بە پێچەوانەی سوەوە کە لایەك قازانج دەکات‌و لایەك زەرەر دەکات.

٢ـ مرۆڤی لە خواترس‌و موسڵمان هەر شتێکی دۆزیەوە خێرا حەرام‌و حەڵاڵی لێك دەداتەوەو بە ترسەوە دەستی بۆ دەبات بەڵام لەخوانەترسەکان لە خۆشیاندا بە پەلە هەڵیدەگرن‌و بەبێ لێکۆڵینەوە حەبەلوشی دەکەن.

٣ـ بەم چیرۆکەدا دیارە لەناو ئومەتەکانی پێش ئیسلامدا کەسانی خواناس‌و خۆلە حەرام پارێز هەبون‌و هیچ سەردەمێك لەو جۆرە کەسانە خاڵی نەبوە.

٤ـ دنیانەویستی‌و دورکەوتنەوە لە پولەکی‌و پارەپەرستی، پیاوی خۆی دەوێت‌و تەنها بەرنامەی پەروەردگارو بیروباوەڕ لەو جۆرە پیاوانە دروست دەکات کە دنیاپەرستان گاڵتە بە عەقڵیان دەکەن‌و بە گێلیان دەزانن.

٥ـ موسڵمان لە کاتی ناکۆکی‌و جیاوازی ڕادا، نابێت لەسەر ڕای خۆی سور بێت‌و ڕای بەرامبەرکەی بە هەڵەو پوچەڵ بزانێت.. بەڵکو وا جوانە پەنا بەرن بۆ یەکێك لە خۆیان زیرەکتر یان گەورەتر کە مەسەلەکەیان بۆ یەکلایی بکاتەوەو هەردولا پێی ڕازی بن‌و ناکۆکیەکە نەمێنێت..

٦ـ مامۆستایانی ئاینی هەمیشەو بە درێژایی مێژو ئامێری ئاشتەوایی‌و ڕەوینەرەوەی جەنگ‌و ناکۆکی‌و ڕقەبەرایەتیەکان بون لە نێوان خەڵکیداو خەڵکی لە کاتی دروستبونی ناکۆکی‌و کێشەدا گەڕاونەتەوە بۆ لایان.

٧ـ مامۆستاو زانایانی ئاینی کە بە (مەلا) ناو دەبرێن، ئەرکی سەرەکیان زۆر قورسەو دەبێت لەو ئاستەدا بن‌و نابێت وا بزانن تەنها بەرنوێژی کردنێك یان ژن مارەبڕین یان تەلقینی یان وتارێکی هەینی کاری سەرشانیان جێبەجێ کردوە بەڵکو دەبێت ببنە

ئامێری ئاشتەوایی نێوان خێزانو بنەماڵە ناکۆکەکانو بەردەوام خەو لە خۆیان حەرام بکەن لەو پێناوەدا..

٨ـ دەبێت دادوەران چارەسەرێکی وا بدۆزنەوە بۆ کێشەکان کە سودی بۆ هەردولای ناکۆك هەبێتو دڵی هەردولا خۆش بکاتو هەرگیز نەبێتە تەرەفێك لە دژی تەرەفی دوەم حوکم دەربکات مەگەر مافەکە خۆی هی یەك لایان بێت.

٩ـ زانایانی ئاینیو غەمخوازانی میللەت هەمیشە بۆ هەلێك دەگەڕێن تا بە هۆیەوە پرۆسەی هاوسەرگیری دروست ببێتو کچو کوڕە عازەبەکان نەمێننەوە چونکە هۆی تێکچونی ڕەوشتی کۆمەڵگا لەوەوە دروست دەبێت کە کوڕانو کچان نەتوانن بە شێوەی شەرعیو حەڵاڵ بگەن بە یەك ناچار (پەنا بە خوا) پەنا دەبەن بۆ کاری ناشایستەو حەرام بۆ گەیشتن بە یەك.

١٠ـمامۆستایانی ئاینی لە ڕێگەی وتارو کۆڕو دانیشتنەکانیانەوە دەبێ بنەمای خێرکردنو پارەبەخشین فێری موسڵمانان بکەنو خۆیشیان لەم کارەدا بە کردەوە سەرمەشق بن.

١١ـ دەبێ بەزەیی هاتنەوە بە هەژاراندا.. وەك ئەرکی شەرشان سەیر بکرێتو لە هەمو چارەسەرەکاندا لە یاد نەکرێت چونکە هەر کاتێك هەژاران نەمانو دەوڵەمەند بون زۆربەی کێشە کۆمەڵایەتیەکان بەرەو چارەسەر دەڕۆنو بنەبڕ دەبن.

هەر لەبەر ئەم هۆشەیە کە ئیسلام لە کەفارەتی هەمو تاوانەکاندا خێرکردنو دەستگرۆیی هەژارانی بڕیار داوە ئەمەش بۆ ئەوەیە کە ئەو چینە وردەوردە نەمێننو ئەوانیش وەك خەڵکی تر هەست بە چێژی ژیان بکەن.

١٢ـ لە شەریعەتی ئیسلامدا ئەو کەنزانەی کە لە ژێر زەویدا دەدۆزرێنەوە وەك ئەوانەی لە گردۆلکە ئاساریەکاندا هەن.. نابێت مرۆڤەکە هەموی بفرۆشێت بۆ خۆی بەڵکو دەبێت (١/٥)ی بکات بە خێر یان ئەگەر دەوڵەتی ئیسلامی (انشاء الله) هاتە کایەوە ئەو پێنج یەکە دەدات بە بەشی زەکاتو دارایی وڵاتو دەوڵەتیش دەیداتەوە بە چینی هەژارو نەداران.

# القصة الثلاثون
# غار سُدَّتْ على أصحابها

عن ابن عمر (رضي الله عنه) قال: سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: ((انطلق ثلاثة نفر ممن كان قبلكم حتى اواهم المبيت الى غارٍ فدخلوه، فانحدرت صخرة من الجبل فسدت عليهم الغار.

فقالوا انه لا ينجيكم من هذه الصخرة، الاّ ان تدعوا الله تعالى بصالح اعمالكم..

قال رجل منهم: اللهم كان لي أبوان شيخان كبيران، وكنت لا اغبق قبلها اهلا ولا مالاً، فنأى بي طلب الشجر يوماً، فلم فلم أرح عليهما حتى ناما.

فحلبت لهما غبوقهما، فوجدتهما نائمين، فكرهت ان أوقضهما، وان أغبق قبلهما اهلا أو مالاً، فلبثتَ والقدحُ على يدي أنتظر إستقاظهما حتى برق الفجر، والصبية يتضاغون عند قدمي، فاستيقظا فشربا غبوقهما.

اللهم إن كنت فعلت ذلك ابتغاء وجهك فافرج عنا ما نحن فيه، من هذه الصخرة، فانفرجت شيئاً لا يستطيعون الخروج منه.

وقال الآخر: اللهم كانت لي ابنة عَمّ كانت أحب الناس اليَّ، وكنت أحبها كاشد ما يحب الرجال النساء، فأردتها على نفسها فامتنعت مني.

حتى الّمت بها السنةٌ من السنين فجاءتني فأعطيتها عشرين ومائة دينارٍ على أن تخلي بيني وبين نفسها، ففعلت فلما قعدتُ بين رجليها.

قالت: اتق الله ولا تفض الخاتم إلا بحقه، فانصرفت عنها وهي أحب الناس إلي وتركت الذهب الذي أعطيتها، اللهم إن كنت فعلت ذلك ابتغاء وجهك فافرج عنا ما نحن فيه، فانفرجت الصخرة غير أنهم لا يستطيعون الخروج منها.

وقال الثالث: اللهم استأجرتُ أجراء وأعطيتهم أجرهم غير رجلٍ واحدٍ ترك الذي له وذهب، فثمرت أجرهُ حتى كَثُرتْ منه الأموال، فجاءني بعد حين فقال: يا عبد الله أدِّ إليّ أجري، فقلت: كل ما ترى هو من أجرك من الإبل والبقر والغنم والرقيق.

فقال: يا عبد الله لا تستهزيء بي، فقلت: لا أستهزيء بك، فأخذه كله فاستاقه فلم يترك منه شيئاً، اللهم إن كنت فعلت ذلك ابتغاء وجهك فافرج عنا ما نحن فيه، فانفرجت الصخرة فخرجوا يمشون)).[1]

واتە: عبدالله ی کوڕی عومەر (خوایان لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: لە پێغەمبەری خوام بیست (ﷺ) دەیفەرمو: لەناو گەلانی پێش ئێوەدا سێ کەس چون بۆ گەشتێكو لەوێ شەویان بەسەردا هاتو ناچار پەنایان برد بۆ ئەشکەوتێك.

دوای ئەوەی چونە ژورەوە بەردێکی گەورە لە چیاکەوە خلبویەوەو دەمی ئەشکەوتەکەی گرتو ئەوانیش هاواریان لێ هەڵسا وتیان چار نیە لەم بەردە ڕزگارمان نابێت مەگەر هەریەکەیان بەکردەوەیەکی چاکی خۆی لە خوا بپاڕێتەوە.

یەکێکیان وتی: ئەی پەروەردگارم من دایكو باوکێکی پیرم هەبو هەمو جارێك تا ئەوانم تێر شیر نەکردایە، نەمدەهێشت منداڵەکانی خۆم لێی بخۆن.

ڕۆژێکیان لە داربڕین درەنگ هاتمەوەو تا هاتمەوە خەویان لێکەوتبو، منیش شیرەکەم بۆ بردن دەبینم خەویان لێکەوتوە. پێم خۆش نەبو خەبەریان بکەمەوەو پێشم خۆش نەبو پێش ئەوان شیر بە منداڵەکانم بدەم.

بە پێوە وەستام بە سەریانەوەو جامە شیرەکەم بە دەستەوە بو تا بەرەبەیانو منداڵەکانم لە برساندا لەبەر پێمدا هاوارهاواریان بوو هەر پێم نەدەدان تا دواجار دایكو باوکم بە خەبەر هاتو شیرەکەم پێدانو خواردیانەوە..

وتی: ئەی پەروەردگارم ئەگەر ئەو کردەوەیەم لەبەر خاتری تۆ کردوە دەی فریامان کەوەو لەم بەردە ڕزگارمان بکە، بەردەکەش کەمێك دورکەوتەوە بەڵام نەیاندەتوانی بچنە دەرەوە.

---

[1] رواه البخاري (٣٤٦٥) ومسلم (٢٧٤٣)، صحيح قصص الرسول (٢/٧٠).

یەکێکی تریان وتی: ئەی پەروەردگارم من کچێکی مامم هەبو زۆر حەزم لێ دەکرد بە ئەوپەڕی حەزکردنی پیاوان لە ژنان، ڕۆژێکیان داوام لێکرد کاری خراپەم لەگەڵ بکات، بەڵام ئەو ڕازی نەبو، نەیهێشت..

تا ئەوەبو ساڵێك لە ساڵان نەبونیو هەژاری ناچاری کرد هات بۆ لامو داوای هاوکاری لێ کردم، بەڵام منیش (١٢٠) دینارم پێدا هەر بۆ خۆی بەو مەرجەی ڕازی ببێت کاری ناشەرعی لەگەڵدا ئەنجام بدەم.

ئەویش (ناچار) ڕازی بو، کاتێك چومە پاڵی ویستم ئەو کارەی لەگەڵدا بکەم پێی وتم: لە خوا بترسەو بەو شێوەیە ئەم کارە لەگەڵدا مەکە مەگەر بە شێوەی ئاساییو شەرعی..

یەکسەر هەستامو خۆم کۆکردەوەو بەجێم هێشت کە خۆشەویسترین کەسم بو.. پارەکەشم پێداو بردی.

وتی: ئەی پەروەردگارم ئەگەر ئەو کارەم لەبەر خاتری تۆ کردەوە دەی فریامان کەوەو لەم بەردە ڕزگارمان بکە، بەردەکەش کەمێکی تر جوڵاو دورکەوتەوە بەڵام هەر کەسی نەدەکێشاو نەیاندەتوانی بچنە دەرەوە.

کەسی سێیەمیشیان وتی:

ئەی خوای پەورەردگارم من ڕۆژێکیان چەند کرێکارێکم هەبو بە پارە کاریان بۆ دەکردمو ئێوارە پارەی هەمویانم دا تەنها یەك کرێکاریان نەبێت کە پێش ئەوەی کرێکەی بدەم ڕۆیشتبویەوە..

پارەکەی ئەوم خستە کاسبیەوە هەتا زۆر بو.. پاش ماوەیەك هاتەوە بۆ لامو داوای کرێکەی لێ کردم..

وتی: ئەی بەندەی خوا، من پارەی فلان ڕۆژم لە لاتانە کە کارم بۆ کردن لە برتانە؟

منیش پێم وت: چاك لە بیرمە هەمو ئەم حوشترو مەڕو بزنو خزمەتکارەی تۆ دەیانبینی هەمو هی تۆیە..

ئەویش وتی: ئەی بەندەی خوا دەڵێی گاڵتەم پێ دەکەی؟

وتم: بە ڕاستمەو گاڵتەت پێ ناکەم.

ئەویش هەر هەمو حوشترو مەڕو ماڵاتەکەی دایە بەرو هەموی بردو یەك شتی بۆ بەجێ نەهێشتم..

وتی: دەی، ئەی پەروەردگارم ئەگەر ئەو کارەم لەبەر خاتری تۆ کردوە دەی لەم بەردە ڕزگارمان بکە..

بەردەکە بە تەواوی چوە دواوەو هەرسێکیان چونە دەرەوەو دەستیان کرد بە ڕۆیشتن.

# چیرۆکی سییەم
# بەردێکی زل

(احمدو محمدو حبیب) لە لادێیەکدا بە ئاسودەیی دەژیانو هاوڕێیەتیان زۆر خۆش بو.. هەردەم هەواڵی یەکیان دەپرسیو سەردانی یەکتریان دەکرد..

خێزانو ماڵو منداڵی هەریەکە لەم سیانە زۆر بەختەوەر بونو بژێوی ژیانیان زیاتر بەسەر ڕاوشکارەوە بو..

ئێوارە خێزانەکانیان چاوەڕوانی دەستی ئەم سێ هاوڕێیە بون تا کەروێشکێك یان کەڵێك یان هەر شتێکی تر ڕاوبکەنو بیهێننەوەو ژەمێکی پێ ڕایی بکەن..

ئەم سیانە زۆر خواناسو لەخواترس بونو بە ڕادەیەك یەکتریان خۆش دەویست ئەگەر یەکێکیان نەیتوانیایە لەگەڵیان بڕوات بۆ ڕاو لە پاش گەڕانەوەیان لە نێچیرەکەی خۆیان بەشیان بۆ دەناردو ئەگەر کەسێکیشیان هیچی نەکوشتایە ئەوان لە نێچیرەکەی خۆیاندا دەیانکرد بە شەریك..

شەوێك لە ماڵەوە بڕیار دەدەن پێکەوە سبەینێ بچن بۆ شاخە بەرزەکانو لەوێ ڕاوی کەڵەکێوی بکەن..

بەیانی کۆڵو بار دەگرنو بە شمشێرو تیروکەوانو ڕمەوە دەڕۆن بەرەو چیابەرزەکانو ماوەیەك دەڕۆنو هەندێ تیر دەگرنە نێچیرەکانو کەروێشکێك ڕاو دەکەن.

بەڵام بارانو ڕەشەبا ناچاری کردن کە پەنا بەرن بۆ ئەشکەوتێکی نزیکیانو بە نیازی ئەوەی ئەو شەوە لەوێ بنو لە بەیانی ڕۆژی داهاتودا دەست بکەنەوە بە ڕاوەکەیان.

هەرکە چونە ژورەوەو کۆڵو بارەکەیان داناو لەبەر ئەوەی زۆر ماندو بونو لێی ڕاکشانو یەکێکیان وتی: بە خوا ئەم ئەشکەوتانەش شتێکی باشنو جێدەستی باوباپیرانماننو ئێمە سودی چاکیان لێ وەردەگرینو ئەگەر ئەم ئەشکەوتە نەبوایە لەبەر ئەو بارانە ڕەق دەیبردینەوەو دەمردین..

یەکێکی تریان بە پێکەنینەوە وتی: بەڵام بێ قەزا بن دەرگاکەیان زۆر بچوك دروست کردوەو بە حاڵ نەفەرێك دەکێشێت..

یەکێکی تریان (دەستی کرد بە پێکەنین‌و وتی): ئەشکەوت تا دەرگاکەی بچوك بێت باشە بۆ ئەوەی سەرماو زوقم نەیەتە ژورەوە، ووی چەند سەرمایە خوای گەورە..

لەم قسانەدا بون هەورە بروسکەیەك دای لە شاخەکەو بەردێکی گەورە خل بویەوەو دەمی ئەشکەوتەکەی کەپس کرد..

یەکێکیان هاواری لێ هەڵساو وتی: خوایە بمانپارێزە لە تورەبونت ئەم دەنگە زۆر گەورە بو (برایان) هەستەکەم ئەشکەوتەکە تارلایك بو.

یەکێکی تریان وتی: ڕۆشنایی دەرگای ئەشکەوتەکە نەما.. تۆ بڵێی دنیا تاریك بوبێت؟! ئا کاك ئەحمەد برۆ سەیرێك بکە تا من ئاگرێك دەکەمەوە زۆر سەرمامانە..

ئەحمەد: بە چاوان.. ڕۆیشت بۆ لای دەرگای ئەشکەوتەکەو دەبینێت بەردێکی زل دەمی ئەشکەوتەکەی بە تەواوی گرتوە..و بە حاڵ لە درزەکانیەوە ڕوناکی دەداتو دەرەوە دیارە.. بۆیە هاواری کرد:

ئەحمەد: لا حول ولا قوة الاّ بالله.. وەرن کاك محمد.. کاك حبیب کارەست ڕوی داوە..

محمد بە هەڵەداوان دێت بۆ لای دەرگای ئەشکەوتەکەو دەبینێت بە بەردێکی زل دەمەکەی گیراوە.

بۆیە محمد وتی: ئا دەی برایان با بە هەرسێکمانەوە پاڵی پێوە بنێین بەڵکو دوری بخەینەوە.. خۆ ئێمەی زیندان کردوە.. دەی حبیب وەرە..

حەبیب: لە دورەوە هاوار دەکات.. کورە خۆتان پاڵی پێوە بنێن.. بەردێك چیە؟ با من ئاگرەکە خۆش بکەم‌و چاکەتان بۆ لێ بنێم..

محمد: چای چی‌و هیچی چی.. خەریکە خەفە ئەبین‌و ئەم ئەشکەوتە دەبێتە گۆڕمان کەچی کاك حبیب مێشێك میوانی نیەو چا لێ دەنێت!!..

احمد: حەبیب گیان.. ڕاکە هاوکاریمان بکە.. با پاڵ بنێین و دوری بخەینەوە.. حەبیب بە ڕاکردن دێت و هاوار دەکات.. باوکە گیان ئەم بەردە لە کوێوە هات خۆ کەپسی کردوین.. ئادەی پاڵنێن یاالله..

هەرسێکیان زۆر هەوڵیان داو شانیان دایە ژێری بەڵام بێ سود بو بەردەکە لە جێی خۆی چرکەی نەدەکرد.. بۆیە بە نائومێدی هەریەکە لە جێی خۆی دانیشت و شەکەت بون.

احمد: برایان با ئەمشەو لێی بخەوێن.. خۆ ئاوو خواردنمان پێیەو بەڵکو سبەینێ شوانێك لێرەوە بڕوات و ئێمە هاوار دەکەین و دێن بە دەممانەوە و بۆمان دەکەنەوە.. خوا گەورەیە.. خوایش پشتوێمان ناخات..

هەمو بە قسەکەی ئەحمەد دڵخۆش بون و چون بە دەم نان دروستکردن و نوێژکردنەوە.. پاشان لێی خەوتن..

بەڵام ئەحمەد خەوی لێ نەدەکەوت.. و خەریکی نوێژکردن بو.. چاوەکانی پڕ بوبون لە ئاو.. دەستی بەرزکردبویەوە بۆ لای پەروەردگارو بە دەم خۆیەوە دەیوت:

ئەی پەروەردگارم خۆت ئاگاداری.. ئێمە بۆ دابینکردنی خۆراکی منداڵەکانمان لە ماڵ دەرچوین.. دەی پەروەردگارم.. مەگەر خۆت ڕزگارمان بکەیت..

بە خوا کێوەکەی ئەوەندە سەخت و دورەدەستە.. گومان نابەم سبەینێ کەس لێرەوە تێپەڕ بکات.. مەگەر خۆت ڕەحممان پێ بکەیت ئەی ڕەحمان و ڕەحیمی زەوی و ئاسمانەکان..

هەرچۆنێك بێت ئەمشەو قەناعەتم پێ کردن کە بێخەم بخەون بەڵام سبەینێ مەگەر خۆت یارمەتیمان بدەیت و ئەم بەردە زلە دور بخەیتەوە یاالله..

لە سبەینێدا کە ڕوناکی خۆر لە درزی دەرگای ئەشکەوتەوە هاتە ژورەوە مژدەی ڕۆژێکی نوێی هێنا بەڵام بۆ ئەمان بۆ ئەمان چ سودی هەیە خۆ هەر وەك شەو تاریکەو لە زینداندان.

بەڵێ وا کات بەرەو چێشتەنگا دەڕوات و دەنگی هیچ شوان و گاوان و ڕاوچیەك نایەت.

حەبیب بە دەنگی بەرز هاوار دەکات: هۆ خەڵکینە.. ئێمە لەناو ئەم ئەشکەوتەداینمو دەمەکەی گیراوە لێمان.. وەرن بە دەممانەوە..

احمد: بە خوا گومان نابەم کەس گوێی لێت بێت جگە لە پەروەردگار ئیتر خۆت ماندو مەکەو هاوار هاوار مەکە..

محمد: ئەی هەروا دانیشین.. بێدەنگو کپوکپ تا دەمرین؟

احمد: نەخێر.. کێ وای وتوە.. هەرگیز بۆ بڕواداران ڕەوا نیە.. نائومێد بن لە خودایانو خۆیان بدەنە دەستی مردنو لەناوچون..

محمد: ئەی بە ڕای تۆ چی بکەین.. چارمان چیە؟

احمد: با هەستین دەستنوێژ بگرینو دو ڕکات نوێژ بکەینو پاشان داوا لە خوای میهرەبان بکەین کە دەرویەکمان لێ بکاتەوەو لەم زیندانە ڕزگارمان بکاتو بگەڕێینەوە بۆ ماڵەوە..

هەمویان دوعایان دەکردو لە ناکاودا (احمد) بیرۆکەیەکی جوانی بۆ هاتو وتی برایان دۆزیمەوە !

هەردوکیان: چیت دۆزیەوە کاك ئەحمەد.. وتی: تۆ ئەگەر بچیت بۆ لای پاشایەكو داواکاریەکی پێشکەش بکەیت.. لەوانەیە خێرا بۆت جێبەجێ بکات لەوانەشە لەو کاتەدا جێبەجێی نەکات..

حبیب: خۆ لەوانەیە پێویستیش بێت بۆت جێبەجێ بکات بەڵام ئەی چی بکات؟

احمد: زۆر ڕۆڵی هەیە ئەگەر چاکەیەکی لەبەر خاتری پاشا کردبێتو بیخاتەوە یادیو بڵێ ئەها من فلان کاری جوانم بۆ کردی دەی تۆش ئەمڕۆ فریای من بکەوە.

محمد: مەبەستت ئەوەیە ئێمەش هەریەکەو کردەوەیەکی چاکەی خۆمان باس بکەینو داوا لە خوا بکەین کە بە هۆیەوە ڕزگارمان بکات؟

حبیب: ئەی ئێمە ئەو کارانەمان لەبەر خاتری خوا کردوەو حەز ناکەم باسی بکەمەوەو خۆمی پێوە هەڵبنێم.

احمد: خۆهەڵنانی تێدا نیە حبیب گیان خۆ ڕیابازیو باسکردنی چاکە نیە لەناو خەڵکدا ئێمە لە قەراغی مەرگداینو خەریکە تیادەچین با سۆزو بەزەیی پەروەردگار بجوڵێنین بەرەو خۆمانو خوایش خۆی ئەمەی پێ خۆشە.

محمد: خوای پەروەردگارمان زۆر بە بەزەییە، بەڵام وای پێ خۆشە لێی بپاڕێینەوەو لێی بلاڵێینەوە...

احمد: سەرەتا من کاتی خۆی چاکەیەکم کردوە لەگەڵ دایكو باوکە پیرو بەساڵاچوەکەمدا کە لە ناو کردەوە چاکەکانمدا شانازی پێوە دەکەمو هیوام وایە لەبەر ئەو کارەشم بێت خوا لێم خۆش بێت لە ڕۆژی قیامەتدا إنشاء الله.

حبیب: ئەو چاکەیە چیە کە لەگەڵ دایكو باوکتدا کردوتە وا ئەوەندە دڵت پێی خۆشە؟

احمد: دەیەوێت باسی بکات بۆیانو لە فلاش باکدا وەك فیلم دێتەوە یادیو دەڵێت پێش (٢٠) ساڵ لەمەوبەر دایكو باوکم لە لای من بونو لە جموجوڵ کەوتبون دەبوایە خواردنم بکردایە بە دەمیانەوەو بمبردنایە بۆ سەرئاوو بمگۆڕینایە..

دیمەنی ژنو پیاوێکی پیر دەردەخات کە هەر دەمیان ماوە قسەی پێ بکەنو توانای ڕۆیشتنو هەڵسوکەوتیان نەماوەو لاوازو سیس بون..

باوك: کوا ئەحمەدی کوڕم با بمبات بۆ دەستنوێژگرتن لە کوێیە.

دایك: پیاوەکە هاوار هاوار مەکە خۆ ئەحمەدمان فەوتاوە بە دەست ئەركو ئاگاری منو تۆوە.. تەنانەت خواردنیش دەکات بە دەممانەوە..

باوك: ڕاست دەکەی ژنەکە بە ڕاستی کوڕێکی ڕاساڵە، خوا دەست بگرێت بە عومریەوە..

دایك: تا منو تۆ تێر شیر نەخۆین بە دەستی خۆی ناهێڵێت منداڵەکانی دەمی بۆ بەرن.. ئای خوایە من چەند لێی ڕازیم تۆش (١٠٠) ئەوەندە لێی ڕازی بە..

احمد لەو کەژەو خەریکی دار بڕینەو کەرو بارەکەی ئامادەکردوەو دەیەوێت بگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە..

احمد: ئای پەروەردگارم کات زۆر درەنگ بوەو ئێستا دایكو باوکم چاوەڕوانی منن شیریان پێ بدەم.. بە ساقەتان بم.. بمبورن دواکەوتم ئای کە ئێستا برسیان بوە.. بە دەم ئەم قسانەوە بەرەو ماڵەوە هاتەوە..

دایكو باوکەکە لە برساندا چمو چاریان پێ کەوتبو.. هەر سەیری ئەملاولایان دەکردو هاواریان دەکرد:

باوك: رۆڵە (بڕوا گیان) باوکت نەهاتەوە.. چی بو وا دواکەوت وا خەریکە لە برساندا دەمرم.. کوا بۆ نەهات شیرەکەمان پێ بدات خەریکە وام لێ دێت دوعای لێ بکەم..

دایك: دوعای لێ نەکەیت..کەمی کردوە لە پێناوماندا.. خۆشی ژیانمان لە خۆیو ماڵو منداڵی تێکداوە کەچی دەتەوێت دوعای لێ بکەیت؟! ها.

باوك: ئاخر هەرگیز ئاوا پشتگوێی نەخستوین.. برسیمە، لە برساندا لاربومەوە..

بڕوا: باوا گیان باوکم چوە بۆ دارو خۆت دەزانی کێوەکە زۆر دورەو درەنگ دەگەڕێتەوە.. ئێوە بخەون ئەگەر هاتەوە هەڵتاندەسێنێتو شیرەکەتان پێ دەدات.. بە خوا ئێمەیش برسیمانەو دەی مەڕەکان لێرە نینو لەگەڵ خۆی بردنی بۆ کەژ..

باوك: بە ساقەویم بڕوا گیان.. بڕۆ سەعیەکەت بکە.. ئێمەش چاوەڕوانی ئەحمەد دەکەین..

ئەحمەد بە مەڕەکانەوە خۆی کرد بە ماڵداو خێرا دەستی کرد بە دۆشینی مەڕەکانو بە دەم خۆیەوە دەیوت: (لا حول ولا قوة الاّ بالله) ئێستا دایكو باوکم لە برساندا مردون.. چیم کر خوایە گیان بۆ وا دورکەوتمەوە.. خوایە بمبەخشە ئێستا دڵیان لێم ئێشاوە.

بڕوا: بابەگیان هاتیتەوە.. بەخێر بێیتەوە.. بابە گەورەو دایە گەورەم زۆر بانگیان لێ کردیو داوای شیریان دەکرد..

ئەحمەد: کوڕم بە خوا هەر خەمی ئەوانم بو (دەگری).. ئەی کوان با شیرەکەیان بۆ بەرم.. هەر خەویان لێ نەکەوتبێت باشە..

ئەحمەد: باوکە، دایکە گیان.. هاتمەوە.. فەرمون شیرەکە بخۆن..

بەڵام دایكو باوكی خەویان لێ كەوتبو.. لە جێی خۆیدا وشك بو.. بە پێوە وەستا لەبەر دەمیاندا.. لە جێی خۆی نەدەجولاو شیرەكەشی بە دەستەوە بو.. بڕیاری دا نابێت كەس لەم شیرە بخواتەوە تا دایە گەورەو باوە گەورە هەڵنەسنو لێی نەخۆنەوە..

باوەڕ: باوكە ئێمەش تینوو برسیمانە.. ئەی كەی شیرەكە بخۆینەوە.. منداڵەكانی لە برساندا دەگریانو دایكم بە زۆر كردونیە خەو..

ئەحمەد: ئافەرین ژن.. خوا وێنەت زۆر بكات.. بەڵكو ماوەیەكی تر دایكو باوكم هەستنو شیرەكە بخۆنەوە..و دوای ئەوان دەیدەم بە ئێوەش..

بەڵام دایكو باوكی لە خەوێكی قوڵدا بونو تا بەرەبەیان بە خەبەر نەهاتنەوەو (ئەحمەد)یش هەر بە پێوە وەستابو لەبەردەمیاندا تا هەستان یەكسەرو شیرەكەیان دەرخوارد بدات..

بەرەبەیان خەبەریان بویەوە دەبینن ئەحمەد هەر بە پێوەیەو وتیان ئەحمەد گیان بۆ ئەمشەو خۆتت كوشتوە، بۆ وا بە خەبەری خۆ قاچەكانت تەزیوە بە ساقەت بم.. كە كوڕێكی ڕاساڵێ..

دای بە دەمیانەوەو تێریان لێ خوارد..و پاشان دای بە دەمی منداڵەكانیەوە..

ئەحمەد بە باسەكەی بویەوەو ڕوی كردە پەروەردگارو وتی: ئەی پەروەردگارم من ئەو كارەم لەبەر خاتری تۆ كردوەو دەی ئەگەر ئەو كارەت لێ وەرگرتومو بە دڵسۆزی لەبەر خاتری تۆ كردومە دەی لەم ئەشكەوتە ڕزگارمان بكەو ئەم دەرگایەمان بۆ بكەرەوەو لەم بەردە زلە ڕزگارمان بكە..

ئەحمەد لە قسەكەی نەبویەوەو بەردەكە چركەیەكی كۆدو ترازاو دەرەوە دەركەوت بەڵام هەر مرۆڤی نەدەكێشا..

(محمد) دەی خوایە.. هەزاران سوپاس بۆ تۆ.. بەردەكە جولا برایان سەیر كەن..

(ئەحمەد) ئەی تۆ محمد چ كارێكی چاكەت كردوە كە لە هەمو كارەكانی ترت دڵت پێی خۆش بێت.. باسی بكە بەڵكو خوا بەزەیی بێتەوە پێماندا..

محمد هاتە قسەو وتی: من کوڕێکی گەنج بومو زۆر جوانو پێکەوتو بوم، زۆر دەوڵەمەندیش بوم.. ژنم نەهێنابو.. حەزم لە کچی مامم دەکردو خەریك بو شێت دەبوم بۆی..

بەڵام بە نیاز نەبومو جەوم لەبار نەبو تا بیهێنم.. بەڵام شەوو ڕۆژ لە خەیاڵمدا بو.. باوەڕ ناکەم ئەوەندەی من ئەو کچەم خۆش دەویست کەس هیچ کچێکی ئەوەندە خۆش ویستبێت..

ڕۆژێکیان گەیشتم پێیو هەندێ قسەی خۆشم بۆ کردو خستمە پێکەنین بەڵام زۆر شەرمنو بە حەیاو حورمەت بو تا بڵێی ڕەوشت بەرز بو..

بۆیە داوام لێکرد کاری خراپەم لەگەڵدا بکات.. بەڵام ئەو زۆر پێی ناخۆش بو.. لێم توڕە بو.. وتی جارێکی تر قسەی وام لەگەڵدا بکەیت بە باوکمو مامم دەڵێم بۆت..

منیش ناچار داوای لێبوردنم لێکردو زۆر ترسام بۆ باوکی بگێڕێتەوە بۆیە پەیمانم دایە جارێکی تر شتی وای پێ نەڵێمو ئەو هەڵەیە دوبارە ناکەمەوەو زۆر داوای لێبوردنم لێ کرد.

ڕۆژان چونو ڕۆژان هاتن.. من هەر نەمتوانی ئەو کچە بخوازم تا ئەوەبو گرانیەك دروست بو ماڵی مامم زۆر دەست کورت بون..

ئەو کچەی مامم بۆ پێویستیەك هات بۆ ماڵمان تا پارەیەکی پێ بدەمو بیدەن بە بژێوی چەند ڕۆژێکی ژیانیان..

بەڵام من (١٠٠) قات پارەم لێ ڕاداو (١٢٠) دیناری ئاڵتونم پێدا، زۆر خۆشحاڵ بو.. زۆر سوپاسی کردمو هەستا بڕوات..

وتم دانیشە کچێ قسەم ماوە لەگەڵت من ئەو پارەیەم هەروا پێ نەداویت.. بەڵکو لە بەرامبەریدا داواکاریەکم هەیە..

کچەکەی مامم بە شەرمێکەوە وتی چیە فەرمو؟ وتم: دەبێت کاری سیکسیم لەگەڵدا بکەیتو ئەگەر ڕەدی بکەیتەوە ئەوا من ئەو پارە زۆرەت پێ نادەمو لێت دەسەنمەوە..

کچەکەش ئەوەندە هەژارو نەدار بون پارەکەی ڕەد نەکردەوەو سەرێکی لەقاندو ڕەزامەندی دەربڕی.

منیش لە خۆشیاندا خەریك بو گەشکە بکەم.. و بۆیە زۆر سوپاسم کردبو شوێنێکمان دەستنیشان کرد بۆ بەیەکگەیشتنمان..

بەڵێ برایان لە کاتو شوێنی دیاریکراودا من زۆر زوتر ئامادەبوم چونکە تامەزرۆی ئەو ڕۆژە بوم، بەڵام کچەکەی مامم زۆر بە نابەدڵی ئەو کارەی قبوڵ کردبو بۆیە درەنگ هات..

کاتێك ڕاکشاو خەریك بو لەگەڵی ئەو کارە بکەم.. لەرزی لێ هاتو هەر (لا الـه الاّ الله)ی دەکردو کە تەواو لێی نزیك بومەوە هاواری کرد بەسەرمدا وتی:

لە خوا بترسە ئامۆزا گیان.. خوا چاوی لێمانەو با شەرمی لێ بکەینو ئەو کارە نەکەین بە ناشەرعیو گوڵی کچێنیم هەڵمەوەرێنە بەم شێوە ناشیرینە بەڵکو ئارام بگرە تا بمخوازیتو بە حەڵاڵی لەگەڵمدا بیت..

هەر کە ئەو قسەیەم لێ بیست هەستامو جلەکانم لەبەر کردەوە بەجێم هێشتو پارەکانیشم بۆ بەجێ هێشتو ئەو کارەم نەکرد.

(محمد) وتی: دەی خوای پەروەردگار ئەگەر لەبەر خاتری تۆو لە ترسی سزای تۆ وازم لەو کارە خراپە هێنا دەی دەرومان لێ بکەرەوەو دەرگای ئەشکەوتەکەمان بۆ بکەرەوەو ڕزگارمان بکە..

ئەحمەد: الله اکبر، سەیر کەن بەردەکە چرکەیەکی تری کردو خەریکە لادەچێت بەڵام ئادەی با تاقیکەمەوە بزانم دەتوانم برۆ دەرەوە.. بە داخەوە ماویەتی.. دەی حبیب گیان تۆ چیت بەسەرهاوە بیگێڕەرەوە.

حەبیب دەستی کرد بە قسەکردنو وتی:

من کاتی خۆی کۆمەڵێك کرێکارم هەبو ڕۆژانە کاریان بۆ دەکردمو پاش چەند ڕۆژێك کارەکەیان تەواو کرد (بە جوانترین تەواوکردن)و هاتن بۆ لام تا کرێی ئەو ماوەیەیان پێ بدەم..

من هەموویانم بەناو دەناسی چونکە ئیشم زۆر هەبو، هەر بەوان دەمکرد کاتێك پارەکەم پێدان دەبینم یەکێك لە کرێکارەکان دیار نیەو نەهاتوە بۆ وەرگرتنی کرێکەی..

کاتێك هەواڵم پرسی هاوڕێکانی وتیان: زۆر بە پەلە کە لە کارەکەی بویەوە کوڕەکەی هات بە دوایداو ڕۆیشتو نەمانزانی بۆچی ڕۆیشت.

منیش وتم: ئەی نابێت هەقی ئەو (٢٠) ڕۆژەی بدەم بە یەکێکتانو ئێوە پێی بدەن؟

یەکێکیان وتی: نەوەڵا.. با لای خۆت بێت.. چونکە دێتەوە بۆ لاتو داوای دەکاتەوە بەڵام ئێمە لە یەکەوە دورین..

منیش پارەکەیم جیاکردەوەو خستمە تورەکەیەكو ماوەیەك هەڵم گرت بۆی بەڵام هەر نەهاتەوە کاتێك هەواڵم پرسی وتیان سەفەرێکی دوری کردوە..

(کاك حەبیب) لەسەر سەکۆکەیماڵەوە دانیشتوەو بیر دەکاتەوەو عومەری کوڕی لە پاڵیدا دانیشتوەو لێی دەپرسێت:

عمر: باوکە گیان ماوەیەکە زۆر دەچیت بە خەیاڵدا.. ئەوە بیر لە چی دەکەیتەوە؟

حەبیب: کوڕم، خەمت نەبێت.. شتێکی خراپ نیە شوکر، تەنها ئەوەیە نزیکەی (٣٠) دینارێکی ئاڵتونم لە لایە کە کرێی یەکێك لە کرێکارەکانەو ئەمانەتە لە لامو نەهاتەوە بە دەمیەوە..

عمر: باوکە گیان.. من پێشنیارێکم هەیە..

حەبیب: کوڕم چیە؟

عمر: بۆچی بۆی نادەیت بە چەند سەرێك حەیوان تا ئێمەش سودیان لێ وەربگرینو پارەکەی کاك جەمالیش زیاد بکات؟

حەبیب: وەڵڵاهی بۆچونێکی جوانەو منت لەو خەفەتە دەرکرد هەی ئافەرین کوڕی ژیرم، ڕاستە دەڵێن: (عەقڵ بە گەورەو بچوکی نیە) وا دەکەم کوڕی خۆم وا دەکەم انشاء الله..

حەبیب دەڵێت پارەکەی زۆر بو، کۆمەڵێك مەڕم پێ کڕیو لە ساڵی ئایندەدا مەڕەکان بەرەکەتیان تێکەوتو زانو هەر تێکەڵی مەڕو ماڵاتی خۆمم نەدەکردن..

ساڵان ڕۆیشتنو ساڵان چون ئەوەندە زۆر بون هەر لە حوشترو مەڕو بزن تا گەوڕم بۆ جیاکردنەوەو هەر لە پارەی خۆیان دو بەندەم بۆ کڕین،و ئیتر من هەقم بەسەریانەوە نەما..

پاش چەند ساڵێك ڕۆژێك عمری کوڕم بە هەڵەداوان هات بۆ لامو وتی:

عمر: باوکە.. باوکە..

حەبیب: بەڵێ کوڕم چی بوە؟ خۆ شتێك ڕوی نەداوە؟

عمر: نەخێر باوکە گیان بەڵام پیاوێك هاتوە بۆ ماڵمانو، چاوەڕوانی تۆ دەکات..

حەبیب: کوڕم نەتزانی بۆچی هاتوە؟

عمر: با.. پێی وتین.. دەڵێت چەند ساڵێك لەمەوبەر ئیشم بۆ باوکتان کردوەو بەڵام لە کاتی خۆیدا پارەکەیم وەرنەگرتوە..

حەبیب: ئەی هەزار سوپاس بۆ خوا.. ئیتر من لەو ڕاسپاردەیە ڕزگارم دەبێتو هەر لەوێدا سوژدەیەکی شوکری بۆ پەروەردگار بردو لەگەڵ عمردا بەرەو ماڵ گەڕانەوە.

حەبیب هاتەوەو کرێکارەکەی ناسیەوەو ئەملاولای ماچ کردو بەخێرهاتنی لێ کرد.. و فەرمانی دا ئادەی نان بێنن جارێ برسیمانە..

کرێکارەکە لە دڵی خۆیدا وتی: تۆ بڵێی لە بیری مابێت؟ تۆ بڵێی ملەجڕێی لێ نەکات؟ باوەڕ ناکەم چونکە حەبیب پیاوێکی لەخواترسو بڕوا بتەو بو.. ئەگەر نەگۆڕابێت.

حەبیب زنجیرەی خەیاڵەکەی کرێکارەکەی پچڕاندو لێی پرسی:

ئەرێ جمال بۆ خاتری خوا تۆ ئەرز قوتی دای ئاسمان هەڵی کێشای چیت لێ هات؟ بۆ تا ئێستا لەم ولاتەدا نەماویت؟..

کرێکار: ئێی کاك حەبیب مەپرسە چیم بەسەر هاتوە، هەر ئەو ڕۆژەی کە لێرە لە ماڵی ئێوە بوم کوڕەکەم هاتو وتی:مانگاکانمان نەهاتونەتەوەو گاوانەکە دەڵێت جەردە داویانەتە بەرو بردونیان بۆ ناو چیاکان..

حەبیب: ئێی دوای ئەوە..

کرێکار دەڵێت: شمشێرو تیروکەوانم هەڵگرتو دوایان کەوتمو بەناو درەختە چڕەکاندا دەڕۆیشتمو تاریك داهاتو منیش ڕاستیەکەی ترسم لێ نیشتو بڕیارم دا بگەڕێمەوە..

حەبیب: ئێ باشە چاکت کرد.

کرێکار: قوربان جەردەکان چواردەوریان لێ گرتمو بە زۆر بردمیان لەگەڵ خۆیان.. هەرچەندە هاوارم کرد بەڕەلام بکەنو ماڵو منداڵم هەیە.. وازم لێ بێنن مانگاکان بۆ خۆتان..

سەرکردەکەیان سمێڵ زلێك بو دەستی کرد بە پێکەنینو وتی: گاوانێکمان زۆر پێویستە کۆتو زنجیرە بکەن. ها، هەها، هەها..

ئیتر لەو ڕۆژە بە دوا من (٤) ساڵە لە لای ئەو ستەمکارانە کۆیلە کراومو خزمەتکاریان پێ دەکردم..

عمر: ئەی مامە گیان نەتدەتوانی ڕابکەیت؟

کرێکار: ڕۆڵە زۆر هەولَم دا بەلام هەڕەشەیان لێ کردم ئەگەر هەڵبێم ماڵەکەت بە منداڵەکانتەوە دەسوتێنین..

حەبیب: ئای کە دڵ ڕەقو خوانەناس بون.. ئەی چۆن ڕزگارت بو؟

کرێکار: لەناو یەکدا ناکۆکیان تێکەوتو سەرۆکەکەی خۆیانیان کوشتو منیش هەلم بۆ هەڵکەوتو یەکێکیان خۆشی دەویستمو وتی: ئێمە غەدرمان لە تۆ کردوە تۆ هەڵبێو ڕاکە ئەگەر هەواڵیان پرسیت دەڵێم گورگ خواردویەتی..

حەبیب: سوپاس بۆ خوا کە ڕزگارت بوە یاخوا بەخێر بێیتەوە..

کرێکار: جا بەچی دەچێ؟ هاتومەتەوە سەر ماڵو منداڵێکی هەژارو دەستو کورتو داماو، بە خوا ناچاریش هێناومی بۆ لات ئەگەر لەبیرت بێت چەند ڕۆژێك ئیشم بۆ کردویتو ئەگەر پارەکەیم پێ بدەیت خێرت دەگات.

حەبیب: ئەوە بەڕاستتە؟ خێرم دەگات؟

کرێکار: ئەرێ وەڵڵا وا بزانە بە دەستی دەمدەیتێو هی خۆتە.

حەبیب: ئەو پەچەیە دەبینی؟

کرێکار: بەڵێ زۆر باش دەیبینم.. حوشترو مەڕو بزنی زۆری تێدایە..

حەبیب: دەی ئەوە هەموی هی تۆیەو لەگەڵ خۆت بیبە.

کرێکار: واقی وڕماو وای زانی گاڵتەی پێ دەکات. وتی: توخوا هەر ئەوەم کەمە با تۆش کاك حەبیب گاڵتەم پێ بکەیت..

حەبیب: گاڵتەکردنی چی؟ بە خوا گاڵتەت پێ ناکەم.. ئەو هەمو حوشترو مەڕو بزنو خزمەتکارەکانیش هەموی هی تۆیە!

کرێکار: خەریکە تێك دەچم من (٣٠) دینارم لە لای تۆیە نەك ئەم هەمو مەڕ ماڵاتە!

حەبیب: من ئەو پارەیەی تۆم خستە کاسبیەوەو خوایش بەرەکەتی تێخستو لەم چەند ساڵە زۆر بونو منیش بە جیا دامناوەو تا خۆت دێیتەوە بۆیو ئەوا هاتیتەوەو فەرمو بیبەرەوە..

کرێکارەکەش هەموی دایەبەرو بردیەوەو یەك سەر وڵاخی لێ جێ نەهێشتو منیش زۆر خۆشحاڵ بوم..

دەی سا خوای پەروەردگارم ئەگەر ئەو کارەم لەبەر خاتری تۆو ڕەزامەندی تۆ کردوە خوایە گیان دەرویەکمان لێ بکەرەوەو دەرگای ئەم ئەشکەوتەمان بۆ بکەرەوەو ڕزگارمان بکە لەم زیندانە..

لەو کاتەدا بەردەکە بە تەواوی کەوت بە پشتاو لە چیاکەوە کەوتە خوارەوەو هەپڕون هەپڕون بو..

هەرسێکیان وەك شێت ئاگایان لە خۆیان نەمابو.. باوەشیان کرد بە یەکداو ئەملاولای یەکیان ماچ دەکردو لە خۆشیاندا هەرسێکیان پێکەوە سوژدەیەکی شوکریان برد بۆ پەروەردگاریان کە ڕزگاری کردن..

## پەندو ئامۆژگاریەکانی ئەم چیرۆکە

١ـ سەفەرو گەشتکردن بە تەنها باش نیەو لە فەرمودەکانی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) هاتوە کە فەرمویەتی: ((الراكب شيطان والراكبان شيطانان والثالث الركب)) واتە: سەفەر بە یەك کەسی لەگەڵ شەیتاندایەو بە دو کەسی لەگەڵ شەیتانداڵو بە سێ کەسی ئەوە گەشتو گەڕانە.

٢ـ دەبێ مرۆڤ زۆر وتو وریاو چوستو چالاك بێتو کە ویستی لە جێگەیەکدا شەو بمێنێتەوە با بە تەواوی سەیری ئەو ناوە بکاتو حەزەر بکات لە زۆر شت.

نابینی ئەم سێ کەسە بیریان لەوە نەکردەوە کە دەرگای ئەم ئەشکەوتە زۆر تەسکەو چیایەکی بەرزی لەبەردەمدابو.. گومانی ئەوە دەکرا کە بەردو تەلان بەربێتەوەو یان لێیان بدات یان دەمی ئەشکەوتەکە بگرێت.

٣ـ مرۆڤی موسڵمان ئەگەر چارەسەرە مادیەکانی هەمو تاقیکردەوەو سودیان نەبو بۆی دەبێ ڕو بکاتە پەروەردگارو چەکی دوعاو پاڕانەوە بەکاربێنێتو نابێت نائومێدیو بێ هیوایی بە هیچ جۆرێك سەری لێ بدات.

٤ـ لە کاتی ئاساییدا کردەوەی جوانو کاری چاکە ئەنجام بدە تا لە کاتە نائاساییو ترسناکەکاندا فریات بکەوێت.. وەك پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرمویەتی: ((اعرف ربك في الرخاء يعرفك في الشدة)) واتە: لە کاتی خۆشیدا خوا بناسە، ئەویش لە کاتی ناخۆشیدا تۆ دەناسێتو فریات دەکەوێت.

٥ـ دروستە مرۆڤ ئەگەر کردەوەیەکی جوانی هەبو، شانازی پێوە بکات، بەڵام هەرگیز نابێت بیکۆڕێنێتەوەو بیداتەوە لە ڕوی ئەو کەسەی کە چاکەکەی لەگەڵدا کردوە مەگەر لە یەك حاڵەتدا ئەویش ناڕەحەترین کات کە گیانی مرۆڤەکە لە مەترسی مردندا بێت، بەناوبردنی ئەو خزمەتە لێی ببورنو کاری بۆ ئاسان بکەنو ڕزگاری بکەن..

٦ـ بەم چیرۆکەدا دیارە چاکەکردن لەگەڵ دایكو باوك یەکێکە لە کردەوە زۆر گەورەکان بە تایبەت کاتێك کە پیر دەبنو کەساس دەکەون.

٧ـ دەبێ مرۆڤ دڵی دایكو باوکی پیری بە ساڵاچوی لە خێزانو منداڵەکانی بەلاوە گرنگتر بێت، لە خواردنو جلوبەرگدا پێش منداڵەکانی خۆی بخاتو بەڵام ستەمیش لە ماڵو منداڵەکەی نەکات.

٨ـ دروستە کوڕ هەر کچێکی خۆش بوێت لە دڵی خۆیدا بە مەرجێك پێی نەڵێتو داوای پەیوەندی لێ نەکاتو شەرەفو سومعەی نەهێنێتە خوارەوە بەڵکو بە شێوەیەکی شەرعیو پاك بچێتە داوای، یان هەر لە دڵی خۆیدا خۆشی بوێت..

دەگێڕنەوە عمری کوڕی عبدالعزیز (ڕەزای خوای لێ بێت) کەنیزەکێکی هەبوە زۆر زۆری خۆش ویستوە بەڵام نە قسەی لەگەڵ کردوەو نە خەڵوەشی لەگەڵدا کردوەو پێیان وتوە: گەورەم بۆ نایخوازیت؟ لە وەڵامدا وتویەتی: دەترسم بیهێنمو دواتر ئاوا خۆشم نەوێت.

٩ـ هەمیشە کەسە دەرون نزمو ڕوخاوەکان بۆ خاڵی لاوازو کاتی داماویو هەژاری خەڵکی دەگەڕێنو بۆ هێنانەدی مەرامەکانی خۆیان سودی لێ وەردەگرن.

بەڵام کەسە خواناسو دەرون بەرزەکان لەم کاتانەدا هەوڵ دەدەن چارەسەری دەردەکان بکەنو هاوکاری هەژاران بکەن.

١٠ـدەبێت بانگخوازان زۆر حەکیمو لێزان بن لە کاتی گۆڕینی خراپەو مونکەرو ناشەرعیدا.. دەبێت کاتی گونجاو هەڵبژێری بۆ بەرگریکردن لە خراپە.

نابینی ئەو خوشکە داوێن پاکە چۆن بە لێزانیو ژیری خۆی بواری نەدا بەو پیاوەی ئامۆزای کە توشی داوێن پیسی ببێتو کەچی دڵیشی زویر نەکردو پارەکەشی دەست کەوت.

١١ـ دەبێت موسڵمان هەمو کاتێكو لەگەڵ هەمو کەسێکدا دەوری مامۆستا ببینێتو نەهێڵێت تاوان بکەنو خوا بخاتەوە یادیان بە بە ئاگری دۆزەخ بیانترسێنێتو لەوانەیە ئەو وتەیەی ئەو وەك بومەلەرزەیەك کەیانی ئەو کەسە تاوانبارە بهەژێنێتو لەو گوناهە واز بهێنێت.

١٢ـ موسڵمان مەعصوم‌و بێ گوناه نیەو لەوانەیە شەیتان ڕۆژێك بەسەریدا زاڵ ببێت‌و گوناهێکی لە لا جوان بکات بەڵام دەبێت زۆر ئاگادار بێت‌و هەر کاتێك خوای گەورەو لەخواترسانیان خستەوە یادی دەبێت دەستبەجێ لەو گوناهە دەست هەڵبگرێت‌و زۆر مەمنونی ئەو کەسەیش بێت کە خوای خستەوە یادی.

١٣ـ موسڵمان دەبێت کرێی کرێکارو خزمەتکارەکانی لە جێی خۆیدا بدات‌و دروست نیە نەیانداتێ یان دوای بخات بەبێ هیچ بیانویەك وەك پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: ((أعطوا الأجير أجره قبل أن يجف عرقه)) واتە: کرێی کرێکار بدەن پێش ئەوەی ئارەقی نێوچەوانی وشك ببێتەوە.

١٤ـ موسڵمان زۆر خەمیەتی کە کرێی کرێکارێکی نەدات‌و زۆر حەز دەکات زو بێت‌و وەری بگرێت لێی.

١٥ـ دروست نیە ئەو بڕە پارەیەی کە دەبێت بدرێت بە کرێکار لە بەرامبەر هەر کارێکدا ڕابگیرێت‌و نەیدرێتێ‌و دروستیش نیە بۆ خاوەن کار ئەو پارەیە بخوات یان خەرجی بکات بۆ بەرژەوەندی خۆی.

١٦ـ ئەوپەڕی مانای دادپەوەری ڕاستەقینەیە کە مرۆڤ ئەگەر کرێکارێکی هەبو چەند ڕۆژێك کاری بۆ کرد بەڵام پارەکەی پێ نەدا، دوای چەند ساڵێك بە دە قات‌و زیاتر بیداتەوە چونکە بێگومان لەناو کاسپیدا زۆر دەبێت‌و زیاد دەکات..

١٧ـ قەرز کۆن دەبێت بەس نافەوتێ، بۆیە نابێت موسڵمان دەست لە قەرز هەڵبگرێت یان کرێی ئیشوکار، بەڵکو دوای چەندان ساڵیش دەبێ هەر داوای بکات‌و دەست لە مافی خۆی هەڵنەگرێت مەگەر بڕوات بۆ لای‌و لەبەر خوا لێی ببورێت‌و ئەوەش خێرێکی گەورەیە..

١٨ـ دەبێ خاوەن کار بە زیادەوە کرێی کرێکار بدات نەك لێی ببڕێت‌و کەمتری پێ بدات، بەڵکو ئەوەندە زیاتری پێ بدات کە کرێکارەکە وابزانێت گاڵتەی پێ دەکات.

## القصة الحادية والثلاثون

## تاب الكفل

عن ابن عمر (رضي الله عنه) قال: سمعت النبي (ﷺ) يحدث حديثاً لو سمعه الاّ مرة أو مرتين حتى عد سبع مرّات، ولكني سمعته اكثر من ذلك.

سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: ((كان الكفل من بني إسرائيل لا يتورع عن ذنب عمله، فأتته امرأة فأعطاها ستون دينار على أن يطأها، فلما قعد منها مقعد الرجل من امرأته أرعدت وبكت، فقال: ما يبكيك؟ أأكرهتك؟

قالت: لا ولكنه عمل ما عملته قط، وما حملني عليه الاّ الحاجة!

فقال: تفعلين انتِ هذا، وما فعلته قطٌّ؟ إذهبي فهي لك، وقال: والله لا أعصي الله أبداً، فمات من ليلته، فأصبح مكتوبا على بابه: قد غفر الله للكفل).[1]

واته: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: یەك جار تا دو جار تا حەوت جار لە پێغەمبەری خوام بیستوە (ﷺ) بەڵکو لەو جارانەش زیاتر بیستومە لێی کە فەرمویەتی:

(کیفل) پیاوێك بو لەناو بەنی ئیسرائیلدا کە لە گوناھ خۆی نەدەپاراستو ھەمو گوناھێکی دەکرد.

جارێك ئافرەتێك دێت بۆ لای (بە ھۆی ھەژاریو دەست کورتیەوە)و داوای پارەی لێ کرد کیفل (٦٠) دیناری ئاڵتونی پێدا لە بەرامبەریدا داوای لێکرد کاری ناشایستەی لەگەڵدا بکات..

ناچار ئافرەتەکەش ڕەزامەندی دەربڕی، کاتێك پیاوەکە لێی نزیك بویەوە (وەك چۆن پیاو لە ژنی خۆی نزیك دەبێتەوە).

---

١ رواه الترمذي في (صفة القيامة)، (٢٦٢٧)، وقال: حديث حسن واللفظ له ورواه (ابن حبان) في (صحيحه) والحاكم وقال: حديث صحيح الاسناد ولم يخرجاه) ووافقه الذهبي، ورواه احمد في المسند (٤٧٤٧).

ئافرەتەکە لەرزی لێ هاتو دەستی کرد بە گریانو (کیفل) پێی وت: ئەوە بۆچی دەگریت ئایا من زۆرم لێ کردویت؟

کچەکەش وتی: نا، بەڵام من تا ئێستا کاری ئاوام نەکردوە، بەڵکو نەبونیو دەست کورتی وای لێ کردوم ڕازی بم بەم کارە ناشایستەیە.

(کیفل) بیری کردەوەو وتی: تۆ تا ئێستا ئەم کارە حەرامو ناشایستەیەت نەکردوەو یەکەم جارتە کەچی پێت ناخۆشەو حەز ناکەی ئەو گوناهە بکەیت، دەلەرزیتو دەگریت؟

دەی بڕۆ پارەکەش بۆ خۆتو کاری وات لەگەڵ ناکەمو نەك هەر ئەوە بەڵکو سوێند بە خوا ئیتر لەمڕۆ بە دوا هەرگیز سەرپێچی خوا ناکەم..

هەر ئەو شەوە کۆچی دوای کرد.. بەیانی کاتێك لە خەو هەستا لە دەرکی حەوشەکەی نوسرابو: (بێگومان خوای گەورە لە کیفل خۆش بوە).

# چیرۆکی سیو یەکەم

# کیفل تەوبەی کرد

(کیفل) پیاوێکی قۆزو پێکەوتو بو.. کەسێکی زۆر عاشقو ژنانی بو.. لە هەر کوێ ژنێکی جوانی بکەوتایەتە بەرچاو.. خەوو خۆراکی لێ هەڵدەگیراو کون بە کون دەگەڕا ماڵی ئەو ژنە یان ئەو کچەی دەدۆزیەوەو پاشان داوای کاری خراپەو ناشایستەی لێ دەکرد..

لەو بوارەدا پسپۆڕ بوبو.. ئیتر بە ڕوی خۆشودەم بە پێکەنین بوایە ئافرەتە لاوازەکانی ڕازی دەکرد..

یان لەبەر ئەوەی (کیفل) پیاوێکی دەوڵەمەندو پارەدا بو.. بە پارە دەیخەڵەتاندنو ئەو کارە ناشایستەیەی پێ دەکردن چونکە لە هەمو سەردەمێکدا کەسانی مشەخۆرو ڕەوشت نزم سودیان لە هەژاریو دەستکورتی میللەت وەرگرتوەو حەزو ئارەزوە سەرکەشەکانی خۆیانیان پێ جێبەجێ کردون..

لەناو هۆزەکەیدا بە کەسێکی دور لە خواو داوێن پیس ناوبانگی دەرکردبو..

(هیلیا) تاقە کچی دایكو باوکی بو... زۆر ڕەوشت جوانو خواناس بو.. هەمیشە لە ماڵو لە دەرەوە ئیشوکاری ڕادەپەڕاندو ڕۆڵی لە کوڕێك زیاتری بۆ دەبینین..

جارێکیان بینی باوکەکەی سەری داخستوەو هەژاری چۆکی پێ داداوەو خەفەت دەخواتو چاوەکانی پڕ دەبن لە فرمێسك..

دایکیشی هاواری دەکرد بەسەریداو دەیوت: هیچمان نیە لێی بنێینو وا بڕوات لە برساندا دەمرین. پیاوەکە شتێك بکە.. سەری مانگیش کە دو ڕۆژی تر دەکات ئەگەر کرێی خانوەکە ئامادە نەکەم لە خانوەکە دەرمان دەکەنو شکاتیشمان لێ دەکەن. پیاوەکە: چاریشم نیە.. دەست دەبەم بۆ هەر کارێك نایەت بە دەستمەوە..

هیلیا: باوکە خەمت نەبێت من ماڵی باوکی کچێکی ڕەفیقم دەزانم وەزعیان باشە.. دەچم داوای قەرزیان لێ دەکەم..

باوك: كچم.. تۆ چوزانیت.. ماڵی كێیە ئەو ماڵە، ماڵێكی ڕەوشت بەرزو خواناس نەبن نەچیت ترسناكە.. تۆ كچێكی جوانو تازە پێگەیشتویت..

باوكە گیان من كچی خۆتم لێم مەترسن لەسەر ڕەوشتی بەرزو ئاكاری جوان پەروەردەتان كردوم.. هەرگیز ئابڕوی خۆمو ئێوەش نابەم (إنشاء الله).

هیلیا چو بۆ ماڵی سیلینی هاوڕێی كە هەردوكیان لەسەر ڕەوشتی بەرزو ئاینداری خاوێن پەروەردە بوبون بە بەردەوام سەردانی یەكیان دەكرد.

هیلیا: سیلین گیان، ئەمجارە بۆ كارێكی گرنگ هاتوم..

سیلین: چیە هیلیا داوای چاویشم بكەیت بۆت دەردەهێنم. تۆ هاوڕێیەكی زۆر دڵسۆزی منی.. فەرمو چیە بیڵێ ئەگەر بە من بكرێت هەی بەسەرچاو..

هیلیا: سیلین خۆت دەزانی ماڵی ئێمە بە زروفێكی زۆر هەژاریو ناڕەحەتیدا تێدەپەڕین.. تا ئێستا پێم نەوتویت بەڵام ئەگەر (٤٠) دینارم دەست نەكەوێت، خاوەن خانوەكەمان دو بەیانی دەرمان دەكات چونكە كرێكەیمان نیە..

سیلین: خەمت نەبێت قسە لەگەڵ باوكم دەكەمو ئەو پارەیەت بۆ دەست دەخەم، با باوكم بێتەوە.. ئێمە وەزعمان باشەو پارەمان هەیە..

هیلیا: بەڵام بە قەرز دوایی دەیدەینەوە..

سیلین: مشكلە نیە، خوا دەكا دەمانداتێ..

سیلیو باوكی پێكەوە دانیشتونو میوە دەخۆن..

سیلین: باوكە گیان كچێكی هاوڕێك هات بۆ ماڵمانو زۆر هەژارو دەست كورتنو كرێچین‌و خاوەن خانوەكەیان بەیانی دەریان دەكات ئەگەر كرێكی دو مانگ ئامادە نەبێت.. مانگی پێشویش قەرزارن..

كیفل: دەستێكی هێنا بە سمێڵە ڕەشەكەیداو وتی: چی چی، كچێكی هاوڕێت؟ ئێ ئێ با بێت، چارەی كێشەكەی دەكەین، چەندێكیان دەوێت؟

سیلین: باوكە گیان بۆ (٤٠) دینار هاتبو.. بمدەرێ ئەگەر هاتەوە دەیدەمێ..

کیفل: چی چی، تۆ پێی دەدەی؟ با بێت بزانم چۆن کچێکە.. کەی دەمانداتەوە؟!..

سیلین: باوکە گیان ئەو زۆر شەرمنەو ڕوی نایەت تۆ ببینێت..

کیفل: کچم عاقڵ بە.. (٤٠) دینار کەم نیە.. با خۆی ئێوارە بێت بۆ لام‌و پێی بدەم‌و قسەی تریشی لەگەڵ بکەم لەوانەیە هاوکاری تریشیان بکەم..

سیلیان لە نیازی باوکی تێنەگەیشت بۆیە پێی وت: زۆر چاکە ئێوارە دێت بۆ لات.

سیلین‌و هیلیا پێکەوە قسە دەکەن‌و لە ناکاو هیلیا هاواری لێ هەڵدەستێت:

هیلیا: ئاخر سیلین گیان من چۆن دێم بۆ لای باوکت‌و من کچێکم‌و تۆو دایکیشت دەڕۆن بۆ لای دوکتۆرو لە ماڵ نین ئەمە کەی دروستە؟ من ناوێرم!

سیلین: باوکە گیانی من وا نیە.. لە دەرگاکەوە لێی وەربگرەو بگەڕێرەوە..

هیلیا: باشە ناچارم دەبێت هەر ئەمڕۆ پارەکەم پێ بدات چونکە بەیانی کرێ خانو دەدەین.

کیفل زۆر بە هەڵەدەوان چاوەڕوانی کچەکە دەکات‌و جلی جوانی لەبەر کردوەو عاترو گوڵاوی لە خۆی دادەو سمێڵە ڕەشەکەی چەور کردوەو بریقە دەداتەوە..

کیفل: چی بو کچە نەهات.. خۆ من شێت بوم.. ئەوەندە سەیری بەر دەرگاکەم کرد، زو بێت باشە تا سیلین‌و دایکی نەگەڕاونەتەوە.. دەبێ چ کچێکی جوان‌و شۆخ‌و شەنگ بێت.. خۆ دیقم کرد.. نەهات..

دەدرێت لە دەرگا.. (تەق–تەق–تەق).

کیفل: ئەوە هاتم.. ئەوە هاتم.. بە چاوان.. تۆیت هیلیا، سڵاو بەخێر بێی، فەرمو وەرە ژورەوە..

هیلیا: قەیناکا لێرە دەوەستم..

کیفل: نا نا.. جوان نیە لەوێدا بوەستیت وەرە ژورەوە ماڵی خۆتە، شەرم مەکە.

هیلیا: بە ناچاری سەیری ئەملاو ئەولای دەکردو بە دەم ترس‌و لەرزەوە چوە ژورەوە..

کیفل: بەخێر بێی.. سیلین باسی گوزەرانی ئێوەی بۆ کردم.. زۆر نیگەران و دڵتەنگ بوم.. کچێ تا من وەستابم خۆتان بە هەژار مەزانن، کچی جوان..

هیلیا: سوپاست دەکەم مامە کیفل، سیلین باسی چاکی تۆی بۆ کردم..

کیفل: وتی پێویستتان بە (٤٠) دینارە وانیە؟

هیلیا: با.

کیفل: (٤٠) دینار چیە چەندت پێ خۆشە پێت دەدەم (٦٠) دینار باشە؟ فەرمو وەری بگرە.

هیلیا: زۆر زۆر سوپاس، ئەوە چاکی خۆتانە دەی با من بڕۆم.. خوا حافیز..

کیفل: بەلاّم من یەك داواکاریم هەیە تۆش بۆ منی بکە..

هیلیا: بەسەرچاو، جا چی بە من دەکرێت؟ تا بۆتی بکەم؟

کیفل: تۆ زۆر شتت پێ دەکرێت.. تۆ زۆر جوانیو چویتەتە دڵمو دەمەوێت ڕازی بیت پێکەوە بین.. خۆ ماڵ چۆڵەو هەر خۆمو خۆتین..

هیلیا: نا نا.. شی وا نابێت.. من پارەکەشم ناوێت.. من دەڕۆم. (پارەکەی دانایەوە).

کیفل: دەستی دەگرێتو دەڵێت: دانیشە پەلە مەکە، خۆ من بە زۆر ئەم کارەت پێ ناکەم.. ئەگەر خۆت ڕازی نەبیت من هەرگیز زۆرت لێ ناکەم بۆ کاری ئاوا بەلاّم ئەوەی تیایە یەك دینار لە من نابینی.. دە بڕۆ خواحافیزت..

هیلیا: بیری دایكو باوکە هەژارەکەی کردەوەو وەستاو ڕوی کردە خواو بە پەنهانی پێی وت: ئەی پەروەردگارم خۆت دەزانی من تۆم زۆر خۆش دەوێتو هەرگیز سەرپێچی تۆم نەکردوە بەلاّم وەزعی باوکم باش نیەو لە خانوەکە دەرمان دەکەن..خوایە من بەم پیاوە دەڵێم باشەو ئامادەی ئەو کارە ناشایستەیەم.. دەسا خوایە گیان داوات لێ دەکەم داوێنم بپارێزەو توشی زینای بۆگەن نەبم من تا ئێستا حورمەتی خۆم وەك چاو پاراستوە..

لەم قسانەدا بو کیفل دەستی گرتو وتی: وەرە ژورەوە گیانەکەم ڕاڕا مەبە.. خۆت لەو پارەیە مەکەو دڵی منیش مەشکێنە.. دەستی ڕاکێشتو بردیە ژورەوە..

هیلیا: چوە ژورەوەو دانیشتو کیفل وتی کچی چاك خۆ ناتخۆم.. نەترسی خۆشم دەوێیت (ئەمەی وت پەلاماری داو خستی)..

بەڵام هیلیا وەك بی ناوئاو دەلەرزیو بە کوڵ دەگریاو هەناسەبڕکەی بو..

کیفل: چوە دواوەو وتی: ئەوە بۆچی دەلەرزی یان بۆچی دەگریت؟ ئایا من بە زۆر ئەو کارەت لەگەڵدا دەکەم؟

هیلیا بە دەم گریانەوە وتی: نا.. تۆ زۆرت لێ نەکردوم.. من خۆم ڕازی بوم بێمە ژورەوە. بەڵام مام کیفل!

کیفل: بەڵام چی؟ کیفل بە قوربانت بێت!..

هیلیا: من هەرگیز کاری خراپەم نەکردوەو ڕەوشتو داوێنی خۆمم خاوێن ڕاگرتوەو ئەمە یەکەم جارمە.. هەرگیز بیرم لەوە نەکردۆتەوە سەرپێچی خوای پەروەردگار بکەمو کاری ناشایستە ئەنجام بدەم کە ڕەوشتو داوێنم پیس بکات..

کیفل: ئەی کەواتە بۆ ڕازی بویت؟ ئێستاش هەڵسە بڕۆرەوە؟

هیلیا: ناچاری، هەژاری وای لێ کردم.. دایكو باوکم تەنها منیان هەیەو دوای خوا کەس شك نابەن.. نان نیە لە ماڵەکەماندا بیخۆینو دو مانگێشە کرێمان نەداوە سبەینێ دەرمان دەکەنە سەر جادەو بەو سەرمایە بۆ کوێ بڕۆین.. ئەگینا من بدەن لە ملیشم داوێنی پاکم لەکەدار ناکەمو خوا لە خۆم نارەنجێنم بەڵام چی بکەم هەژاری ئاخ هەژاری...

وتەکانی هیلیا کاری کردە سەر دڵی دەرونی (کیفل)و بە هۆشی هێنایەوەو بیری کردەوەو وتی: هەستە خۆت کۆبکەرەوەو بڕۆرەوەو (٦٠) دینارەکەش بەرە بۆ خۆتانو داواشت لێ دەکەم لێم ببوریت..

هیلیا: زۆر سوپاست دەکەم.. زۆر مەمنونتم بێنە با دەستەکانت ماچ بکەم..

کیفل: نا نا.. پێویست ناکات.. من سوپاسی تۆ دەکەم.. تۆ منت لە دەریای گوناهباریو سەرپێچی پەروەردگار ڕزگار کرد.. تۆ منت بە ئاگا هێنایەوە..

هیلیا: من؟ من هیچم نەکردوە.. کە شایانی ئەوە بێت جەنابتان سوپاسم بکەن..

کیفل: تۆ یەکەم جارت بو.. بکەویتە داوی داوێن پیسیەوە.. زۆر پێت ناخۆش بو.. کەچی من سالآنێکی زۆر خەریکی ئەو کارە قێزەونەمو ڕۆژێك لە ڕۆژان بیرم لەوە نەکردەوە کە من خەریکی کارێکی خراپو ناشایستەم..

هیلیا: مامە کیفل گیان.. تەوبە دەکەیت؟ چەند خۆشحاڵو بەختەوەرم بەم بڕیارە گەورەیەت.. ئای خوایە گیان سوپاس بۆ تۆ.. کە باوکی هاوڕێ خۆشەویستەکەمت ڕێنمونی کرد..

کیفل: هیلیا گیان لەسەر دەستی تۆ بڕیار بێت لەم ساتەوەختە بەم لاوە، وەڵڵاهی هەرگیز سەرپێچی خوای پەروەردگارم ناکەم..

(استغفر الله العظيم) گوناه نەما من نەیکەم خوایە مەگەر ڕەحمی خۆت ئەگینا من شایانی لێبوردن نیم..

هیلیا: وا مەڵێ باوکی سیلین دەرگای تەوبە ئاوەڵایە بۆ هەمو بەندەیەكو ئەگەر گوناهیشت ئەوەندەی کەفی دەریاکان بێت داوای لێبوردن بکەیت خوا لێت دەبورێت..

کیفل: تۆ بچۆرەوە بۆ ماڵو ئاسودە بەو خۆم سەرتان لێ دەدەمو هاوکاریشتان دەکەمو ئاردو برنجو ڕۆنی یەك مانگتان بۆ دەهێنم خوات لەگەڵ.

سیلین هاتەوە دەبینێت باوکی دەستنوێژی گرتوەو خەریکی نوێژەو چاوەکانی سور هەڵگەڕاونو بە کوڵ دەگریو داوای لێبوردن دەکات لە خوای گەورە ! !

سیلین: دایە دایە.. ئەوە من چی دەبیستم باوکم نوێژی دەکات!.. داوای لێخۆشبون دەکات.. هەزار هەزار سوپاس بۆ تۆ خوایە گیان بە ڕاستی هیدایەت بە دەستی تۆیەو هەر کەست پێ خۆش بێت ڕێنمونی دەکەیت بۆ ڕێگای ڕاست..

کیفل: زۆر نەخۆشم.. ناساغم.. جێم بۆ داخەن.. مەرج بێت بمێنم چەندێ خراپەم کردوە سەد ئەوەندە چاکە بکەمو خوای گەورە بپەرستمو سەرپێچی نەکەم..

کچم ماڵی ئەو کچەی ڕەفیقت هەرچیان پێویست بو پێم بڵێ با هاوکاریان بکەمو یارمەتیان بدەم.

سیلین: بەسەرچاو، بەسەرچاو، باوکەگیان.. دەی بخەوە تۆ ماندویت (دایدەپۆشێت).

لە نیوەی شەودا هاواری لێ هەستاو دەیوت: ئازار زۆری بۆ هێناومو خەریکە دەمرم ئەگەر مردم گەردنی خەڵکی ئازا بکەن هەرچیم پێ دەڵێن چونکە ئەوان نازانن من تۆبەم کردوەو گەڕاومەتەوە بۆ لای خوا..

هەروا دەزانن من کیفلە خوانەناسە بەدڕەوشتەکەی جارانمو دەترسم کەسیان لە دوای جەنازەکەمەوە نەیەن بۆ سەر قەبرانو داوای لێخۆشبونم بۆ نەکەن..

سیلین: باوکە گیان گرنگ نیە.. خەڵکی بزانێ یان لە.. گرنگ ئەوەیە تۆ تەوبەت کردوە تەوبە..

باوکی بە دەم گیان دەرچونەوە دەیوت: لێم ببورە پەروەردگارم.. لێم ببورە پەروەردگارم)).و گیانی سپاردو مرد..

سیلین: دایە باوکم مرد.. باوکم مرد.. باوکە گیان.. باوکە گیان.. (گریا).

کۆمەڵێك لە پیاوانی گەڕەك بەو شەوە کۆبونەوەو بەرەو ماڵی کیفل ڕۆیشتن:

یەکەم: بە خوا خێر نیە بچین بە دەمیەوە.. گوناه نەما نەیکات..

دوەم: هەمو شتێکی قەیناکە بەڵام سودخۆرێکی سەیر بو..

سێیەم: تەماحی کردبو کچو ژنی ئەم شارە یان بە زۆر یان بە هێزی پارە بەدڕەوشتی لەگەڵ دەکرد (پەنا بە خوا).

چوارەم: کوڕە برایان وازی لێ بێنن.. کابرا مردوە.. خۆ هەرچۆنێ بوبێت بڕوادار بو.. خۆ کەسیش بە تاوانکردن کافر نابێت.. گوناحتان دەگات کێ دەڵێ تەوبەی نەکردبێت..

یەکەم: تەوبە.. تەوبەی چی.. بۆ ئاگای تەوبەی دەزانی؟!.. بەڵام ڕاستەکەی هەم بڕوادار بو.. هەم دراوسێشمانە بۆیە دەبێ بە دەمیەوە بچین‌و کفن‌و دفنی بکەین، خوا ڕەحمی قەبرەکەی پێ بکات.. آمین.

هەر چواریان هاتن‌و گەشتنە بەر دەرگاکەیان‌و چرایەکیان بە دەستەوە بو.. یەکێکیان وتی: بە خوا خێزان‌و منداڵەکانی زۆر چاك‌و خواناس بون ئادەی کاکە تۆ چراکەت پێیە بڕۆ پێشەوە تەقە بدە لە دەرگا ئەها لە ژورەوە دەگرین..

ئەو پیاوە بە چراکەیەکە دەڕواتە پێشەوە دەبینێت لە دەرگاکە شتێك نوسراوە هاوار دەکات ئەرێ برایان ئەوە چیە لە دەرگاکەیان نوسراوە؟

دوەم: نوسراوە (بێگومان خوا لە گوناهەکانی کیفل خۆش بو)!

یەکەم: چی چی؟ خوا لە گوناهی کیفل خۆش بوە؟ سەیرە..

چوارەم: تەق، تەق، تەق، دەدات لە دەرگاکە..

سیلین: مامە گیان بەخێر بێن فەرمون وەرنە ژورەوە باوکم مرد (دەگری).

چوارەم: کچم هەمومان دەمرین.. دوعای لێخۆشبونی بۆ بکە.. خوا لێی خۆش بێت..

یەکەم: شتێکی سەیر لە دەرگاکەتان نوسراوە..

سیلین: چی نوسراوە مامە گیان؟

دوەم: نوسراوە بێگومان خوا لە گوناهەکانی کیفل خۆش بو.

سیلین: الله.. دایە گیان، مژدەت لێ بێت، خوای گەورە تەوبەکەی باوکمی قبوڵ کردوە، ئەی سوپاس بۆ تۆ پەروەردگارم، چەند میهرەبانی..

دوەم: بۆ پێش مردنی تەوبەی کرد؟

سیلین: بەڵێ لە پێش خۆرئاوابوندا تەوبەی کردو گەڕایەوە بۆ لای خواو پەیمانیشی دا ئەگەر ما چەندێ گوناهی کردوە سەد ئەوەندە چاکە بکاتەوە تا خوا گوناهەکانی دەسڕێتەوە..

یەکەم: سبحان الله.. بۆ ئەوەی پاکی ئەو پیاوە بۆ خەڵکی دەربخات فریشتەی خۆی دەنێرێتو لە دەرگاکەی بنوسێت (خوا لە کیفل خۆش بوە).

چوارەم: خوای پەروەردگار چەند خۆشحاڵە بە تەوبەو گەڕانەوەی بەندەکانی بۆ سەر ڕێگەی چاکەو خواناسی..

یەکەم: سەیرکەن ئەو هەمو گوناهەی کردبو.. کەچی بەس لەبەر وئەوەی بە پاکیو لە دڵەوە گەڕایەوە بۆ لای خوا لێی خۆش بو..

دوەم: برایان با بڕۆم هەمو پیاوانی گەڕەك ئاگادار بکەم لەم کارە موعجیزەیەو لە تەوبەی کیفل.. چونکە ئەگەر بەمە نەزانن کەسیان لەگەڵی نایەن بۆ سەر قەبران..

زۆر باشە بڕۆ.. کارێکی زۆر باش دەکەیت.. زۆر پێویستە ئاگادار بن... کە خەڵکەکە هاتنو ئەو کەرامەتەیان بە کیفلەوە بینی زۆر خۆشحاڵ بونو لایەم لەو شارە بە دەم گریانو (لا اله الاّ الله)وە بەڕێیان کرد بۆ سەر قەبرانو ئەسپەردەی خاکیان کرد.

## پەندو ئامۆژگاریەکانی ئەم چیرۆکە

١ـ ئەگەر مەسەلەیەك زۆر گرنگ بێت.. دروستەو شتێکی چاکە ئەگەر دوبارەو سێ بارەو زیاتریش دوبارە بدرێتەوە بە گوێی خەڵکیدا تا لە بیریان نەچێتەوەو بەردەوام لە پێش چاویان دابێتو لە خەیاڵیاندا بمێنێتەوە..

٢ـ مرۆڤ هەرچەندە لە گوناهو سەرپێچی پەروەردگاریدا ڕۆبچێت.. نابێت خەڵکی لە ئامۆژگاری کردنو ڕێنمونی کردنی دەست هەڵبگرنو بیدەنە دەستی شەیتان..

بەڵکو هەردەم بۆ هەلێك بگەڕێن تا دەمیان بگات پێیو دو قسەی خێری بۆ بکەنو، بەرەو کاروانی خواناسی بیهێننەوە.

٣ـ هەژاری دەردێکی زۆر کوشندەیەو پەنا بە خوا زۆر جار وا لە خاوەنەکەی دەکات چەندات گوناهو خراپە قبوڵ بکات لە پێناوی پارەوە نانێکدا..

وەك دەبینین زۆر کەس پێی خۆش نیە بێتە پیاوی کەسو بەشداری گوناهی ئەو کەسە بکات بەڵام چونکە باوەڕەکەی لاوازە.. دەڵێت چی بکەم، مەجبورم بۆ مەعاشەکە دەیکەم!..

٤ـ ئەگەر مرۆڤ خۆی بگرێتو بە ئارام بێ لەسەر هەژاریو نەداری زۆر باشترە لەوەی لە دەرگای دەوڵەمەندەکان بدات چونکە ئەگەر خراپەکار بێت، خراپەیەکت پێ دەکات، ئەگەر خراپیش نەبێت درۆیەك دەکاتو دەڵێت: نیە لە دەستمدا!!..

٥ـ زۆر هۆکار هەیە بۆ خۆ دزینەوە لە گوناهو خراپەکاری وەك ئەوەی ئەو کچە داوێن پاکە چەکی گریانو لەرزینی بەکارهێنا، خوایش کردی بە هۆی ڕزگاربونی لەو تاوانە قێزەونە.

٦ـ ڕێنمونی کردنو بانگەوازکردنی خەڵکی تەنها بە ئایەتو فەرمودە هێنانەوە ناکرێت بەڵکو هۆکاری تر زۆرە بۆ ئەوەی سەرنجی خەڵکی بۆ لای پەیامە پیرۆزەکەت ڕابکێشی وەك چۆن ئەو کچە خواناسە بە هۆی گریانو لەرزینەوە ڕێنمونی کیفلی کردو بو بە هۆی تەوبەکردنی..

٧ـ مرۆڤ لەسەری پێویستە سود لە کەسانی خوار خۆیشی وەربگرێتو نابێت بە تەما بێت زاناو گەورەترین لەخواترسەکان بێنو ڕێنمونی بکەن بۆ کاری چاکەو خواناسی.

بەڵکو وەك کیفل ئاسا لە هەڵوێستەیەکی ئەو کچە کەم ئەزمونە، کەم زانستە، کەم تەمەنەو گەورەترین وانەی ژیان فێر بو کە جوان هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ پەروەردگارو بەندەکانیدا..

٨ـ موسڵمان کاری چاکەو شەونوێژو خواناسی بکات بە دزیەوەو، لەبەر ڕوپامایی‌و بینینی خەڵکی نەبێت..

خەمی چیە؟ کەسی چاكو خواناس خوای گەورە خۆی جاری چاکەی لەناو خەڵکدا بۆ دەدات.. بە بەرزو بەڕێز ناوزەدی دەکا، ئەی نەتبینی چۆن کیفل لە هەمو ژیانیدا ناوو شورەتی بە پیاو خراپو گوناهبار دەرکردبو بەلام ڕۆژێك پێش مردنی تەوبەی کردو گەڕایەوە بۆ لای خوا، کەس بەم کارەی نەزانی بەلام خوا لە دەرگای حەوشەکەیانی نوسی: ((خوای گەورە لە گوناهەکانی کیفل خۆش بو)).

## القصة الثانية والثلاثون

## آخر من يدخل الجنة

عن عبد الله بن مسعود (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ): (إني لأعلم آخر أهل النار خروجا منها، وآخر أهل الجنة دخولا الجنة: رجل يخرج من النار حبوا، فيقول الله تبارك وتعالى له: اذهب فادخل الجنة، فيأتيها، فَيُخَيَّلُ إليه أنها ملأى، فيرجع فيقول: يارب وجدتها ملأى ، فيقول الله تبارك وتعالى له: اذهب فادخل الجنة.

قال: فيأتيها، فَيُخَيَّلُ إليه أنها ملأى، فيرجع فيقول: يارب وجدتها ملأى ، فيقول الله تبارك وتعالى له: اذهب فادخل الجنة، قال: فيأتيها، فَيُخَيَّلُ إليه أنها ملأى، فيرجع فيقول: يارب وجدتها ملأى ، فيقول الله تبارك وتعالى: اذهب فادخل الجنة، قال: فيأتيها، فَيُخَيَّلُ إليه أنها ملأى، فيرجع فيقول: يارب وجدتها ملأى ، فيقول الله تبارك وتعالى: اذهب فادخل الجنة فإن لك مثل الدنيا وعشرة أمثالها، أو إن لك عشرة أمثال الدنيا.

فيقول: أتسخر بي أو تضحك بي وأنت الملك؟

قال ابن مسعود رأيت رسول الله (ﷺ) ضحك حتى بدت نواجذه، قال: فكان يقال: ذلك أدنى أهل الجنة منزلة).[١]

واتە: عبدالله ی کوڕی مسعود (ڕەزای خوای لێ بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: من ئاگاداری دواین کەسم کە لەناو ئاگری جەهەنەم دێتە دەرەوەو دواین کەسێك کە دەچێتە بەهەشتەوە.

پیاوێکە لەناو ئاگرەکە دێتە دەرەوە (سەر سمت دەدات) واتە دەکەوێتو بەسەر دەستی ڕادەکات بە ڕێگادا..

خوای گەورە پێی دەفەرموێت: بڕۆرە ناو بەهەشتەوە، ئەویش دەڕواتو کە سەیری دەکات وا دەزانێت پڕ بوەو کەسی تر ناگرێت، خێرا دەگەڕێتەوە دواوەو دەڵێت: ئەی پەروەردگارم بینیم پڕبوە لە خەڵكو کەسی تر ناگرێت.

---

١ رواه مسلم (٣٠٨)و (١٨٦).. صحيح قصص الرسول (١٦٤/٢).

دیسان خوای گەورە پێی دەفەرموێت: دەڵێم بڕۆرە ناو بەهەشتەوە، دوبارە دەڕواتو دیسان وا دەزانێت پڕ بوەو کەسی تر ناگرێت، دێتەوە دواوەو دەڵێت: ئەی پەروەردگارم پڕە لە خەڵكو کەسی تر ناگرێت.

دیسان خوای گەورە پێی دەفەرموێت: دەڵێم بڕۆرە ناو بەهەشتەوە، دیسان بەرەو بەهەشت دەڕواتو وا دەزانێت پڕ بوە لە خەڵكو کەسی تر ناگرێت، دێتەوە دواوەو دەڵێت: ئەی پەروەردگارم پڕە لە خەڵكو کەسی تر ناگرێت.

لەوێدا خوای گەورە پێی دەفەرموێت: بڕۆرە نێو بەهەشتەوەو ئەوەندەی هەمو دنیاو دە ئەوەندەی تریشت پێ دەدەم.

دەفەرموێت: بەندەکەش دەڵێت: دەڵێی گاڵتەم پێ دەکەیت؟ پێم پێ دەکەنیت لە کاتێکدا تۆ پادشایت؟

عبداللهی کوڕی مەسعود (ڕەزای خوای لێ بێت) دەفەرموێت: لە دوای گێڕانەوەی ئەم فەرمودەیە پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەندە پێکەنی تا دانەکانی دواوەی دەرکەوتن، دەفەرموێت: لەو ڕۆژەدا دەوترێت: ئەمە کەمترین پلەو مەقامی هەیە لە بەهەشتدا.

## چیرۆکی سیو دووەمین
## دواین کەس کە دەچێتە بەهەشت

دیمەنی ئاگرێکی گەورەو بڵێسەدار دەردەکەوێت کە گڕەکەی سەدان مەتر بە حەوادا دەچێتو کەس خۆی ناگرێت لە نزیکیەوە..

ئەوە پیاوێکە بە گڕەوە دێتە دەرەوەو خۆی لە زەویەکە لول دەکاتو ئاگرەکانی دەکوژێنێتەوەو لە خۆشی ئەوەی لە ناو ئاگرەکە ڕزگاری بوە.. هەر ناوەستێتو ڕادەکاتو دەکەوێتو لە خۆشیاندا لەسەر دەستەکانی دەڕواتو سەیری دواوەی دەکاتو بە دەمی خۆیەوە قسە دەکات..

سوتاو: ئای باوکە گیان.. جەهەنەم چەند سزایەکی سەخت بو.. خوایە سوپاس بۆ تۆ ئەمە منم.. لەناو دۆزەخ هاتمە دەرەوە.. (دەست دەدات لە دەموچاوی خۆی).

سوتاو: با ڕابکەم.. کەمێك دورکەومەوە.. خواردنو خەوو ئیسراحەتم هەموی سزاو ئێشو ئاگر بو..

ئەمە منم ڕزگارم بو لەو هەمو مارو ئەژدیهایانە.. کە ڕۆژانە دەیان جار دەیانگەستم..

سوتاو: لە بیرمە لە دنیا هاوڕێ چاکەکانم زۆر ئامۆژگاریان دەکردمو دەیانوت ئاگری دۆزەخ سەختە.. زۆر بە ئێشە تکایە گوناو مەکە.. سەرپێچی خوا مەکە.. بەڵام من گاڵتەم پێ دەکردنو دەموت: کورە بابە جەهەنەمی چی.. خوا گەورەیە نامانسوتێنێت (انشاء الله) با کەمێك ڕابوێرین.

سوتاو: (ئاخۆ ئێستا ئەو هاوڕێ چاکانەم لە کوێ بن؟ بێگومان ئێستە لەناو بەهەشتدان.. خۆزگەم پێیان.. خۆزگە منیش ئەو ڕێبازەی ئەوانم بگرتایە..).

خۆزگە بە قسەی هاوڕێ خراپەکانم نەکردایە.. فێری مەی خواردنەوەو تلیاكو هەرچی شتی خراپ بو کردمیان..

سوتاو: سەدان ساڵە لەناو ئاگردا دەسوتێمو سزا دەدرێم، نازانم چۆن ماوم؟ چۆن نەمردم؟! بەڵام وا دیارە مردن نەماوەو زەمەنی مردن بەسەرچو (قوڕ بەسەرم)..

سوتاو: ئەو ساڵە هاتن ناوی ئەوانیان خوێندەوە کە لە ژیانیاندا لەگەڵ باوەڕی ئیسلامەتیاندا یەك کردەوەی چاکیشیان کردبێت.. زۆر زۆری گرتەوە کەچی منی نەگبەتی نەگرتەوە قوڕ بەسەرم.

سوتاو: منیش چەند خراپ بوم.. دەی با یەك نوێژم بکردایە.. یان یەك ڕۆژی ڕەمەزان بەڕۆژو بومایە..

سوتاو: بەڵام هەر باش بو.. بیروباوەڕەکەم مابو.. هەر ئەوەش بو ڕزگارم بو.. بەس نەبو نەچومە سەر قسەی هاوڕێکانم.. کە ئێستا هیچ عەفویەك شمولیان ناکات.. چونکە (پەنا بە خوا) باوەڕیان بە خوا نەبو.. بە لاقرتێوە ناوی پێغەمبەرو قورئانیان دەبرد.. قوڕ بەسەریان..

سوتاو: هاڵاوێکی دۆزەخ پەلاماری دەداتەوەو ئەمیش تا پێی بکرێت ڕادەکاتولە دورەوە درەختو سەوزاییو کانیاوێکی جوانو ڕازاوە بەدی دەکات..

سوتاو: ئای خوایە.. چ گەرمامە.. خۆ سوتام.. هەرگیز سەر زەویم بەم شێوەیە نەدیوە خۆ خەریکە گڕ دەگرم.. خۆ لە تێنواندا کوێرایم داهات (یاللە).

سوتاو: سەیرێکی درەختو سەوزاییەکە دەکاتو هاوار دەکات خوایە بەس بمگەیەنە لای ئەو درەختە خۆشەو تێر ئاو بخۆمو لە سێبەرەکەیدا دابنیشم ئیتر هیچم ناوێت..

دەنگی فریشتەیەك دێت: باشە دەتگەیەنینە ئەوێ بە مەرجێك داوای لەوە زیاتر نەکەیت.

سوتاو: خوا ئەکا من دەگەمە ئەوێ، هیچی ترم ناوێ، من لەو ئاگرە بلێسەدارە ڕزگارم بوە.. (دەکەوێتەڕێ بەرەو سەوزاییەکە).

سوتاو: دەچێتە ژێر سێبەری دارەکەو هەناسەیەکی خۆشی هەڵدەمژێتو تێر تێر لە ئاوی کانیاوەکەی خواردەوە.. بە دەم خۆیەوە: ئەمە منم دوای سەدان ساڵ سزاو ئەشکەنجەو ئاگر لەم شوێنە خۆشەدام. سوپاس بۆ تۆ تەنها خوا..

من هەر لێرەداو لە ژێر ئەم دارو کانیاوەدا دەژیمو بەسمە لەمە زیاترم ناوێ..

بەیانیەك بە خەبەر هاتو گوێی لە دەنگی جریوەی چۆلەکەو ئاوازی بولبول بو زۆر دڵی خۆش بو. کامەران بوو.. سوپاسێکی خوای کردو سەیری ئەملاولای خۆی کرد..

سوتاو: ئەڵڵاهـ.. کە خەوی خۆشە.. ئەم شوێنە دلگیرە.. بەلام ئاخۆ دەبێ برا موسڵمانەکانم شوێنیان چۆن بێت.. کە بەردەوام لە مزگەوت نوێژیان بە کۆمەڵ دەکردو بۆ خوا بە ڕۆژو دەبون‌و گوناهیان نەدەکرد وەکو منی بەدبەخت..

لای کردەوە بە لایڕاستداو درەخت‌و ئاوو کانیاوێکی جوانتری بینی.. زۆر لەوەی خۆی گەورەترو فراوانترو ڕازاوەتر بو.. کەمێك بێدەنگ بو پاشان بە خۆی وت:

سوتاو: خوایە گیان.. هەرچەندە لە دنیا زۆر خراپ بوم‌و هاوارم تێ نەدەکردی‌و خۆشم نەدەویستی بەلام تۆ خوایەکی زۆر مەزنی زۆر لێبوردەی.. بەڵکو ڕێگام بدەن بگەمە ئەو جێگایە.. ئەو شوێنە زۆر خۆشترو چڕوپڕترە لێرە.. حەزم لێیەتی..

دەنگ: ئەی پەروەردگارت ئاگاداری نەکردیت لە داوای لەوە زیاتر مەکە؟

سوتاو: با.. با.. بەرەوەڵلا.. بەلام خۆم بۆ پێناگیرێت کە سەیری ئەو جێگایە دەکەم..

دەنگ: خوای پەروەردگارت ڕێگای پێدایت قەیناکات برۆ بۆ ئەو جێگایە.. ئەوە ماڵت بێت بەلام ئیتر چاوچنۆك مەبەو داوای زیاتر مەکە..

سوتاو: خوا ئەکا دەگەمە ئەوێ.. وەعد بێ داوای تر نەکەم.

سوتاو دەڕوات بۆ ئەو جێیەو لە خۆشیاندا لە هۆش خۆی دەچێت.. کە دەبینێ دیمەنی وا سەوزو جوان‌و کانیاوی سازگارو حەوزی پڕ لە ماسی‌و درەختی بەرز بە حەوادا چو.

پاش ئەوەی دێتەوە بە هۆشداو دەڵێت: ئەمە چیە؟ جوانترین هاوینەهەواری سەر زەوی ناگاتێ.. ئەمە لە دنیا دەستی پادشاکانیش نەدەکەوت.. کەچی من بومەتە خاوەنی.. سوژدەیەکی سوپاس بۆ خودا دەبات‌و دەچێت لە ئاوەکە دەست‌و دەم‌و چاوی دەشوات‌و دەست دەبات بۆ ماسیەکان‌و ماسیەك بە ئاسانی دێتە ناو دەستی..

سوتاو بە سەرسامیەوە: لە دنیادا بە تۆڕو بە قولاب دەمانگرتن کەچی وا لێرە خۆی دێتە ناو لەپم.. ئەمە بەهەشتی خوایەو من بە خۆم نەزانیوە..

بەیانیەك لە خەو هەڵدەسێتو بە دەم بایەشکدانێکی درێژەوە بە دەم خۆیەوە قسە دەکات:

سوتاو: نە برسیمەو نە تینومە. زۆر سەیرە دەست دەبات سێویێك لێ دەکاتەوەو دەیبات بۆ دەمی.. سەیری ئەملاولای خۆی دەکات.. چاوی هەڵدەتەقێ بە باخێکی زۆر خۆشدا کە لە پاڵ دیوارێکی گەورەیەداو زۆر خۆشترو جوانترە..

سوتاو: ئەوە چ باخێکە پەروەردگار؟ بۆ ئەوەندە چڕوپڕو خۆشە.. بۆ خاتری خوا لە هەمو سەر زەویدا شتی وام نەدیوە.. خوایە بەس ئەمجارە داوات لێ دەکەم کە ئەو باخەم پێ بدە.. ئیتر داوای هیچی تر ناکەم.. وەعد بێت وەعدبێت، وەعد..

وردە وردە بەرەو ئەو باخو کانیاوە خۆشە دەکەوێتەڕێ.. لە ژێر سێبەریدا درەختەکاندا دادەنیشێتو بۆ خۆی لێی ڕادەکشێت..

بەیانیەك بەناو باخەکەیدا هاتوچۆی دەکردو سەیرێکی دیوارەکەی کرد کە لە پشتیەوە بو بە دەم خۆیەوە وتی: تۆ بڵێی پشتی ئەم دیوارە چەند خۆش بێت..

ئای منیش کردەوەم ببوایەو وەك ئەو خەڵکە ئێستا لەناو ئەو بەهەشتەدا بومایە ئاخر من بە تەنها چی بکەم لێرە بۆ خاتری خوا.. نە هاوڕێیەك نە خزمێك نە هاوسەرێك، نە حۆریەك.. چۆڵو هۆڵ..

سوتاو: بەسە بەسە.. تێر نەخۆر.. لە بیرت چو ماوەیەك لەمەوبەر لەناو دۆزەخدا بویت؟! داوای لەمە زیاتر مەکە.. فرە کردەوەی جوانت هەیە؟ دانیشە بۆ خۆت! ئەو دیوی ئەو دیوارە جێی تی تێدا نەماوە.. هی پیاوچاكو خواناسەکانە..

دەنگی فریشتەکە دێتەوەو دەڵێ: ئەی بەندەی خوا بەهەشتی خوا زۆر فراوانەو تۆش باوەڕت بە خواو پێغەمبەرەکەی (محمد) هەبو، تۆش فەرمو لە لایەن خوا (ڕێگات پێ دراوە) بچیتە ناویەوە.. دەی خێرا هەستە بچۆرە بەهەشتەوە..

لە خۆشیاندا سوپاسی خوا دەکاتو بەرەو دەرگای بەهەشت دەڕواتو لەوێ بۆی دەکەنەوەو دەچێتە ژورەوە.. دەبینێت خەڵکێکی زۆر لە ژنانو پیاوانی لێیەو زۆر قەرەباڵغەو خەڵکی دێنو دەچنو دەخۆنەوە..

خێرا (سوتاو) پشتاوپشت دەگەڕێتەوە دواوەو دێتە دەرەوەو دەڵێت: خوایە.. خوایە گیان.. من دواکەوتوم.. پڕبوەو جێگەی منی تێدا نابێتەوە.. منی بەدبەخت. کەی شایانی ناو بەهەشتم..

دیسان خوای گەورە لە ڕێگەی دەنگی فریشتەکەوە پێی دەفەرموێت: زۆر قسە مەکەو من پێت دەڵێم بڕۆرە نێو بەهەشتەوە..

دوبارە (سوتاو) دەڕواتەوە ناو بەهەشتو زۆر دەگەڕێت بەناویدا بەڵام دەچێتە هەرکوێ ناوی کەسێکی لێ نوسراوە بۆیە دوبارە بە گریانو لە خۆدانەوە دێتەوە دەرەوەو دەڵێ:

ئەی پەروەردگارم بستێك زەوی لە بەهەشتدا نەماوە کە خاوەنی خۆی نەبێتو مەترێك زەوی بۆ من نەماوەتەوە.. (دەست دەکات بە گریان).

بۆ جاری سێیەم خوای گەورە فەرمانی پێ دەکاتەوە کە تۆ بە هەڵە حاڵی بویت بڕۆرە ناویەوە جێگای تۆش دەبێتەوە بەهەشت زۆر فراوانە دەی بڕۆ مەوەستە بەندەکەم.

دەڕواتەوە ناو بەهەشتو دەیەوێت سێوێك لێ بکاتەوە یەکێك دەڵێت: بە یارمەتیت ئەم باخە تا چاو بڕ بکات هی منە.. ئەو کانیاوو کۆشکانەش هەمو هی منن.. پەیوەندیان بە تۆوە نیە لێرەش دەست درێژی دەکەی؟

سوتاو: ئاخر برای موسڵمانم.. منیش وەك ئێوە ئەهلی قبلە بومو شایەتومانم هێناوە.. ڕاستە کردەوەی باشم نەبو.. بەڵام باوەڕم هەبو..

بەهەشتی: کە مادەم باوەڕت بوبێت هیوادارم انشاء الله تۆش وەك ئێمە کۆشكو باخو باخاتت بۆ دەربچێت.. تۆ تا ئێستا لە کوێ بویت؟

سوتاو: من سەدان ساڵە لەناو ئاگری دۆزەخدا دەسوتێمو خوای گەورە بەزەیی پێمدا هاتەوەو لەبەرئەوەی باوەڕدار بوم هێنامیە دەرەوەو وا دەبینم بەهەشت بۆ من نەماوە هەموی دراوە بە ئێوە! هەرچەندە مافی خۆتانەو پاداشتی خواناسیو لە خواترسانەکانتانەو من حەسودیتان پێ نابەم.. دەست دەکات بە گریانو پیاوەکەشدڵنەوایی دەکاتو پێی دەڵێت:

بەهەشتی: ئەی نازانی ڕەحمەتی خوا زۆر زۆر گەورەیەو انشاء الله تۆش دەگرێتەوە..

سوتاو: هانام بەو دەمەت.. بەڵام وا دیارە جێ نەماوە با بڕۆ دەرەوە..

دەڕواتە دەرەوەو دەڵێت:

ئەی پەروەردگارم بەهەشتی چی؟ بۆ کوێ بچم؟ تا چاو بڕ بکات هی یەك بڕوادارەو دیارە ئەوی تریشی هی ئەوانی ترە.. هیچ بۆ من نەماوەو پڕە لە خەڵك.. (دەست دەکاتەوە بە گریانو سوژدەیەك بۆ خوا دەبات)..

خوای گەورەیش دەفەرموێت ئەی بەندەکەم سەر هەڵبڕە..

سوتاو سەر هەڵدەبڕێت.

ئایا دەزانی من هیچم لێ کەم نابێتەوە ئەگەر چەند بدەم بە تۆ؟ دەی جوان گوێت لێ بێت؟

من دەمەوێ ئەوەندەی هەمو دنیاو دە ئەوەندەی تریشی لەسەر بێت بدەم بە تۆ لە بەهەشتدا..

سوتاو: ئەوەندەی هەمو دنیاو دە ئەوەندەی تریش؟

فریشتە: بەڵێ ئەوە کەمترین بەشی بەهەشتیەکانە کە خوا بە تۆی داوە..

سوتاو: ئەی پەروەردگارم.. سەدان ساڵە لەناو ئاگردا سزا دەدرێمو دەسوتێمو ئێستا منت ڕزگار کرد لەو سزایەو دڵت خۆش کردومو باخو کانیاوت پێ بەخشیوم..

بەڵام دە ئەوەندەی دنیام بدەیتێ؟ ناچێتە عەقڵمەوە.. ئەی خوای گەورە تکات لێ دەکەم گاڵتەم لەگەڵدا مەکە تۆ پاشای هەمو دنیای چۆن پێم پێ دەکەنیت؟

فریشتەکە: حاشا خوا گاڵتە بە کەس ناکات فـەرمو بـڕۆرە نـاو بەهەشـتەوەو زۆر قـسە مەکە..

دیمەنی عەبدوڵلای کوڕی مەسعود دەردەکەوێت (خوای لێ ڕازی بێت) دەردەکەوێت کـە فەرمودەکە بۆ کۆمەڵێك کەس دەگێڕێتەوەو لە دواییـدا کـە دەگاتـە سـەر وتـەی بەندەکـە وتی: بە پەروەردگاری: ئایا گاڵتەم پێ دەکەی کە تۆ پاشای هەمو جیهانی؟

عبدالله دەستی کرد بە پێکەنین تـا دانـەکانی دواوەی دەرکـەوتن‌و فـەرموی دەزانـن بـۆ پێکەنیم؟

چونکە پێغەمبەری خوام بینی لە پاش وتەی بەندەکـە ئەوەنـدە پێکـەنی تـا دانـەکانی دواوەی دەرکەوتن..

## پەندو ئامۆژگاریەكانی ئەم چیرۆكە

١ـ باسی بەهەشتو خۆشیەكانیو دۆزەخو سزاو ناڕەحەتیەكانی زۆر گرنگەو دەبێ مامۆستاو بانگخوازان گرنگی تایبەتی پێ بدەن چونكە بەهەشت بەری ڕەنجی چاكەكارو خواناسانەو خەڵكی زۆر حەز دەكەن كرێی كارەكانیان بزانن چەندە..

٢ـ هەروەها باسی ناڕەحەتیەكانی دۆزەخیش زۆر پێویستە تا هەمو تاكێكی موسڵمان ئەگەر لەبەر خۆشی بەهەشت كردەوەی چاك نەكەن با لە ترسی ئاگری دۆزەخ كردەوەی ناشیرین نەكەن.

٣ـ بە فەرمودەكەدا دیارە بەردەوام ڕۆژانەو ساڵانە.. بڕیاری لێبوردن بۆ دۆزەخیە داماوەكان (خوا بە دورمان بگرێت لێی) دەردەچێتو دیارە خوای گەورە زۆر مەبەستیەتی مافی كەس پێشێل نەكرێتو ئەوەی خاوەنی بیروباوەڕی پاكی ئیسلامیە بەڵام كردەوەی چاكەی نەكردوە، دوای ئەوەی لەسەر كەمتەرخەمیو سەرپێچیەكانی چەند ساڵێك سزا دەدرێت دەبێت پاداشتی ئەو بیروباوەڕەی بدرێتەوە دواتر تروسكایی باوەڕ ڕۆڵی خۆی دەبینێتو لێبوردن دەیگرێتەوە..

٤ـ ئەمەش بەڵگەیەكە لەسەر ئەوەی كە هەرگیز موسڵمان بە كوناهكردن كافر نابێتو بە هەتاهەتایی لە دۆزەخدا نامێنێتەوە.

٥ـ شتێكی ئاساییە مرۆڤ تا بیدرێتێ داوای زیاتر دەكاتو هەرگیز ناگاتە ئاستێك كە بڵێ ئیتر بەسمەو نامەوێتو ئەوەش سروشتی مرۆڤەو گوناهباری لەسەر نیە ئەگەر چاوچنۆكیو حەسوی بە دوادا نەیەت..

٦ـ مرۆڤ زۆر جار بە هەڵەدا دەچێت لە بیركردنەوەی شیكردنەوەی شتەكاندا بەڵام دەبێت مرۆڤ بڕوای بەوە هەبێت كە خوا زۆر شتی گەورە دەكات كە بە بیرو مێشكی تەسكی بەندەكاندا نەیەت..

٧ـ لە هەندێ كاتدا مرۆڤ دەتوانێت كارێك بە كەسێك دوبارەو سێ بارە بكاتەوە بەو هیوایەی بەو دوبارەكردنەوانە خۆی لە مەسەلەكە حاڵی ببێتو ڕاستیەكانی بۆ ڕون ببێتەوە.

٨ـ مرۆڤ نابێت کەسانێك دواکەوتنو کەوتنە ئەخیرەوە، ئیتر حیسابیان بۆ نەکرێتو بەشیان هەڵنەگیرێت بەڵکو ئەوانیش هۆیەك وا دوای خستون.

٩ـ مرۆڤ لە دو حاڵەتدا دەبێ ئاگای لە وشەکانی بێت چونکە لەسەر خۆی لە کاتی بیستنی هەواڵی خۆشو لەکاتی بیستنی هەواڵی ناخۆشداو شتێك نەڵێت کە دوای ئاسایی بونەوە لێی پەشیمان بێت.

١٠ـئەگەر ئەو کەسانەی لە خواری تۆوەنو لە کاتی ئاخافتندا وشەیەکیان وت کە سوکایەتی بو بە تۆ، تەقدیری ئەو زروفەیان بکەو لێیان تورە مەبە لەسەریو جاری وا هەیە قوتابی بە مامۆستاکەی دەڵێت: تۆ ڕقت لە منە! تۆ ئەو شتە نازانیت! تۆ فەرق دەکەیت! نابێ هەڵبچینو سزایان بدەین بەڵکو پەروەردگار لەو عەبدە تورە نەبو کە پێی وت گاڵتەم پێ دەکەیت.

١١ـ بەم فەرمودەیەدا دەردەکەوێت کە ئەگەر کەسێك بیروباوەڕی بە یەکتایی خوداو پێغەمبەرەکەی محمد (ﷺ) هەبو ئیتر ئەگەر کردەوەش نەکات کافر نابێتو ناچێتەوە بازنەی ئەو بێباوەڕانەی کە بە هەمیشەیی لە دۆزەخدا دەمێننەوەو پاش ساڵانێکی دورودرێژ (خوا پەنامان بدات) لە دۆزەخدا سزا دەدرێنو پاشان قەڵەمی لێبوردنی خوای (عز وجل) دەیانگرێتەوەو دێنە دەرەوە.

# القصة الثالثة والثلاثون

## عيسى والسارق

عن ابي هريرة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ): رأى عيسى ابن مريم رجلاً يسرق.

فقال له عيسى (عليه السلام) سرقتَ؟ قال: كلاّ والذي لا إله الاّ هو، فقال عيسى: ((آمنتُ بالله وكذَّبتُ نفسي)).[١]

واتە: ئەبو هوریرە (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرمو: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: جارێك عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) پیاوێکی بینی دزی دەکرد، پێی فەرمو: ئەوە دەڵێی دزی دەکەی؟

پیاوەکەش وتی: نا، سوێند بەو کەسەی هیچ خوایەك نیە جگە لە ئەو، عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) فەرموی: باوەڕ بە خوا دەکەمو دیارە چاوم درۆی کرد.

---

١ رواه البخاري (٣٤٤٤) ومسلم (٢٣٦٦) في كتاب صحيح قصص النبوي (٧٧).

# چیرۆکی سی‌و سێیەم

## عیساو دزەکە

پیاوێك لە سەردەمی عیسادا (سەلامی خوای لێ بێت) خەریکی دزی کردن بو، ڕۆژێك لە ڕۆژان چو بۆ دزی لە بۆیسانێك لە سەرەڕێگاکەی کە عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) ڕۆژانە هاتوچۆی لێوە دەکرد..

کە عیسا بینی بە ئەسپایی چو بەرەو ڕوی‌و پشت ملی گرت‌و هەڵیساندەوەو پێی فەرمو: ئەوە عەیب ناکەیت‌و لە خوا ناترسیت دەڵێی دزی دەکەیت؟

پیاوەکەش دەیزانی عیسا باوەڕی بە پەروەردگاری تاکانە هەبو ویستی بە شێوازێکی فێڵاوی عیسا تەفرە بدات بە جۆرێك کە وازی لێ بهێنێت‌و بڕوات..

وتی: نەخێر دزی ناکەم سوێند بەو خوایەی کە هیچ خوایەك نییە جگە لە ئەو..

سوێندەکە ئەوەندە گەورە بو لەسەر دڵ‌و دەرونی عیسا پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت)و خێرا لەو قسەیە پاشگەز بویەوەو بۆ ئەوەی پەروەردگار بەرز ڕاگرێت فەرموی: دەی کەواتە داوای لێبوردن دەکەم‌و من باوەڕم بە پەروەردگار هەیەو وا دیارە چاوم هەڵەی کردو گومانم پێ بردی‌و داوای لێبوردن دەکەم..

پیاوەکەش شەرم گرتی کە شمەکێکی بێ نرخی دنیایی ئەو سوێندە گەورە ترسناکەی خوارد بۆیە ڕای کرد بە دوای عیساداو پێی وت:

من خەجاڵەتم.. ئەو دزیەم کردو تۆ ڕاستت کردو مەرج بێت ئیتر دزی نەکەم‌و سوێنیش بۆ شتی ڕاست نەبێت نەیخۆم..

## پەندو ئامۆژگاریەکانی ئەم چیرۆکە

١ـ مامۆستاو بانگخوازان نابێت بێدەنگ بن لە ئاستی تاوانو هەڵەی قوتابیو شوێنکەوتوانیانو، گەورەترین گەندەڵی ئەخلاقیو ئیداری لەوەوە دروست دەبێت کە حیزبو فەرمانڕەواکان لێپرسینەوە لەگەڵ ئەندامەکانیان ناکەنو پەردەپۆشی تاوانەکانیان دەکەن، لە ترسی ئەوەی نەوەك زویر ببێتو ڕیزەکانیان بەجێ بهێڵێت.

٢ـ گەر یەکێك هەڵەیەکی کرد، وا بە هێزو سودبەخشە کە گەرماوگەرم پێی بڵێیتو ئامۆژگاری بکەیتو سەرزەنشتی بکەیت بەڵام ئاگات لە دەرونی بێتو زویری مەکە بەڵکو لە ڕێگەی پرسیارەوە زانیاری پێ بدرکێنە نەك تاوانباری بکەیت بە دزی بەڵکو وەك عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) بڵێ: ئەوە دزی دەکەیت!.

٣ـ ئەگەر کەسێکمان بینی کارێك هەڵەی دەکرد.. خێرا نابێ هەمو دنیای لێ تێبکەیەنین، بەڵکو جارێ با لە نزیکەوەو لەگەڵ خۆیدا تاوتوێی بکەین لەوانەیە کارەکەی هەڵە نەبێتو خۆی بۆمان ڕون بکاتەوە..

٤ـ تا بۆمان دەکرێت ناوی خوای گەورە زۆر بە گەورەو مەزنو گران ڕابگرینو لەبەر چاوی خەڵکیش ئەو گەورەییەی ڕابگەیەنین.. ئەگەر کەسێك سوێندی خوارد با باوەڕی پێ بکەین مادەم بەڵگەمان نیە بە دەستەوە لەسەر تاوانبارکردنی.

٥ـ با گەورەترین ئاستی کۆمەڵایەتی یان سیاسی یان زانستیت هەبێت دەبێت خاوەنی خۆ بە بچوك زانین بیتو زۆر ئاسایی بێت لە لات کە هەق لە لای تۆ نەبو دانی پێدا بنێو بڵێ من هەڵە بوم! من لێم تێکچو! تۆ ڕاستت کرد..

نابینی پێغەمبەران هەرگیز بە هەڵەدا ناچن کەچی لەبەر گەورەیی سوێندەکە خۆی بردە ڕیزی ئەوانەی کە لێیان تێکچوەو بە هەڵەدا چون.

٦ـ ئەگەر بە چاوی خۆیشت تاوانێکت دیو خاوەنەکەی دەیوت من نەمکردوە.. ئەو کاتە لێی بوەستەو تاوانباری مەکە تا بەڵگەی نوێت دەکەوێتە چنگ..

# القصة الرابعة والثلاثون
# زارعٌ في الجنة

عن ابي هريرة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ): ((ان رجلاً من أهل الجنة، إستأذن ربَّه في الزرع، فقال له: ألسْتُ فيما شِئْتَ؟

قال: بلى ولكن احبُّ ان أزرع! !.. فبذر، فبادَرَ الطرق نباته واستواؤه واستحصاده، فكان أمثال الجبال، فيقول الله:

دونك يا ابن آدم، فإنه لايشبعك شيء)).[١]

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: پیاوێك لە بەهەشتیەكان.. داوای لە خوای گەورە كرد كە ڕێگای بدات (زەوی بكێڵێت)و كشتوكاڵ بكات.

خوای گەورەیش پێی دەفەموێت: ئایا هەرچی بتەوێت بۆت ئامادە نەكراوە؟

پیاوەكەش وتی: بەڵێ.. بەلام من پێم خۆشەو حەزم لێیە كشتوكاڵ بكەم..

(زەوی كێڵا)و تۆی كرد، یەكسەر گەورە بو بالای وەك بالای چیاكان بەرز بو كاتی ڕنینەوەشی هات..

خوایش پێی فەرمو:

دە واز بێنە ئەی ئادەمیزاد، تۆ هیچ تێرت ناكات.

---

١ رواه البخاري (٢٣٤٨)، من صحيح قصص النبوي (لا: ٣٩).

# چیرۆکی سیو چوارەم
# جوتیارەکەی بەهەشت

(سید مصطفی) پیاوێك بو.. خواناسو پیاوچاك بو.. بە کاری کشتوکاڵو باخەوانیەوە خەریك بو..

بەختەوەرترین کاتی ئەو ساتانە بو لەناو بۆیستانو کشتوکاڵەکەیدا هاتوچۆی دەکردو ئاوی دەدێرانو پاچەکۆڵەی دەکردو بژاری دەکرد.. بەو هۆیەوە ژیانی ماڵو منداڵەکەی مسۆگەر کردبو..

ئەم پیاوە لەسەر بیروباوەڕی پاكو کردەوەی جوان تەمەن بەسەر دەباتو دەگەڕێتەوە بۆ دیوانی خواو خوایش پاداشتی ماندوبونو کردەوەی جوانی ژیانی دنیای دەداتەوەو لێی ڕازی دەبێتو دەیخاتە بەهەشتەوە..

(سید مصطفی) لە بەهەشتدایەو خەریکە سێوو ترێ لە باخەکانی بەهەشت لێدەکاتەوەو بە دەم خۆیەوە قسە دەکات:

سید: یادی ئەو ڕۆژانەی دنیا دەکەمەوە کە زەویم دەکێڵاو تۆوم تێدا دەچاندو پاشان گەورە دەبو بەروبومەکەیم لێ دەکردەوەو دەمفرۆشت زۆر خۆش بو چێژم لێ وەردەگرت.. ئای دنیا..

سەید بە هاوڕێکەی دەڵێت: تۆ بڵێی.. ناشیرین نەبێ ئەگەر داوا لە خوای گەورە بکەم ڕێگام بدات لەناو بەهەشتدا زەوی بکێڵمو کشتەکاڵ بکەم..

هاوڕێ: ئەوە بەڕاستتە سید گیان!.. ئێمە لە دنیا کردمانو خۆمان ماندو کرد تا لێرە ئیسراحەت بکەینو هەر بخۆینو بخەوینو ڕابوێرین، ئەمە بەهەشتە.

سید: دەزانم ئەمە بەهەشتەو سوپاسی خوا دەکەین لەسەر ئەم نیعمەتە مەزنە.. بەڵام بە خوا لە خوا داوا دەکەم بەڵکو ڕێگام بدات بە کێڵانی زەویو چاندنی تۆو..

هاوڕێکەی: کەیفی خۆتە داوا بکە لێی.

سید: ئەی پەروەردگارم ئەگەر ڕێگەم بدەیت حەز دەکەم لە بەهەشتدا زەوی بکێڵم‌و تۆو بچێنم‌و کشتوکاڵ بکەم..

دەنگێك لە لایەن خوداوە پێی دەڵێت: بۆ هەرچی دڵت بۆی لێ بدات‌و حەزی لێ بکەیت لە هەمو سەوزەو میوەجاتەکان نەمخستۆتە بەردەستت؟

سید: بەڵێ، ئەی پەروەردگارم.. زۆر زۆر سوپاست دەکەم.. بەڵام لە دنیا بەردەوام کردومەو ئێستا بیری دەکەمەوەو حەز دەکەم بیکەم..

دەنگەکە: دەی بۆت هەیە چیت پێ خۆشە بیکە..

سید دەست دەکات بە کێڵانی زەوی‌و هەمو بەهەشتیەکان بەسەرسوڕمانەوە سەیری دەکەن‌و هەندێکیان دەڵێن ئەم پیاوە تێکچوەو هەندێکی تریش دەیانوت: ئەمە بەهەشتە چی دڵ حەزی لێ بکات تیایەتی‌و ئێ ئەویش حەزی لە کاری کشتوکاڵی‌و جوتیاریە زۆر ئاساییە..

بەیانی لە خەو هەڵدەسێت‌و بە دەم خۆیەوە دەڵێت: ئای کە خەو خۆشە چونکە لێرە لەبەر ماندویەتی ناخەوین.. بەڵکو بە حەزی خۆمان‌و بۆ خۆشی دو سێ سەعاتێك دەخەوین..

با بڕۆم سەردانی زەویەکەم بکەم بزانم براژێك شتێکی پێویست نیە؟ (بە خەیاڵی خۆی وای زانی ئەمە دنیایە)..

بەڵام هەر کە زەوی‌و کشتوکاڵەکەی بینی چاوی پەڕیە تەوقی سەری چی بینی؟ یاالله..

سید: ئەرێ بۆ خاتری خوا ئەمە چیە خۆ دەڵێی عەمودن‌و چون بە ئاسماندا، ئەوسا لە دنیا ئەگەر سەوزەو میوەجاتمان کەمێ بەرز ببوایە ئەمانوت: ماشاء الله شاخی کردوەو چوە بە ئاسماندا..

بەڵام لێرە هەر بە ڕاستی ئەوەندەی شاخێك بەرز بوە.. ئەی ئەو هەمو خەیارو تەماتەو کولەکەیە چیە گرتویەتی؟ خۆ بەشی هەمو بەهەشتیەکان دەکات، پەنجا لۆری لێ پڕ کە..

سید: پەروەردگارم من تێ ناگەم زەراعەتەکەم بۆ وا بەرزو گەورە بوە ئەی ئەو هەموە بەروبومە چیە؟

دەنگی فریشتەیەك دێتو پەیامی خوای پێ دەگەیەنێتو دەڵێت: ئەی وا دەزانی میوەی بەهەشت وەك میوەی دنیا بچوكو کەمو بێتامە؟

سید: (بە شەرمێکەوە) بۆم هەیە بیانفرۆشم؟

دەنگی فریشتە: ئێی ئادەمیزاد بەچی تێر دەخۆیت، بە هیچ تێر نابیت!!

## پەندو ئامۆژگاریەکانی ئەم چیرۆکە

١ـ لە بەهەشتدا هەمو داواکاریو خواستەکانی ئادەمیزاد دێتەدیو هەرچی بوێت بۆی سازدەکەنو بێ دڵی ناکرێت، بەڵام داواکاریەکانی بەهەشت ڕۆتینیە ئەگینا داوای هەرچی بکەیت خوای گەورە لەوە زیاتری پێ داویت..

هەیە داوای فڕۆکە دەکات! دەی مرۆڤ لە بەهەشتدا پێویستی زۆری بە هەنگاونانو ڕێگەبڕین نیەو دەتوانێت بۆ کوێ بچێت بچێت.[١]

٢ـ وتەی خودا کە دەفەرموێت بە بەهەشتیەکە: ئایا هەرچیت ویستبێت بۆت ئامادە نەکراوە؟ وا دیارە ئەهلی بەهەشت زۆر لە سەدەی بیستو یەکی مرۆڤەکان پێشکەوتوتر بنو تەکنەلۆژیای بەهەشت لە لوتکەدایەو هەرگیز بیرو مێشکی مرۆڤ پەی پێ نابات ئەگەر (٢١) سەدەی تریش مرۆڤەکان لە داهێناندا پێشتر بکەون.

٣ـ مرۆڤ لە بەهەشتدا وەك مندالێ لێ دێت کە ماڵەوە هەمو شتێکیان بۆ فەراهەم هێناوەو پێویستی بە هیچ نیە کەچی بە باوکی بڵێ حەز دەکەم چلورە بفرۆشم! یان کرێکاری بکەم..

وا دیارە باوك چەندی پێ ناخۆشەو خێرا بە منداڵەکەی دەڵێ: گیانەکەم لەچیت کەمە؟ تا دەتەوێت کاسپی بکەیت؟..

٤ـ کابرای ناو بەهەشت وای گومان برد زەراعەتکردنی ناو بەهەشت وەك زەراعەتکردنی جارانی سەر زەوی وایە،بەڵام کە بینی تەماتەو خەیارەکانی لە عەمودی کارەکان بەرزتر بون (یان وەك فەرمودەکە باسی کرد وەك بەرزی چیاکان بەرز بونو

---

١ خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَفِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ ٱلْأَنفُسُ وَتَلَذُّ ٱلْأَعْيُنُ وَأَنتُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ واتە: لەناو بەهەشتدا چی نەفس پێی خۆش بێتو چاو حەزی لێ بکات ئامادە کراوەو ئێوەی (ئەی دەستەی باوەڕ) بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە.

پێگەیشتن، بۆی دەرکەوت کە دیارە ژیانی ناو بەهەشت زۆر لە ژیانی سەر زەوی خۆشترو بە پیتترو پێشکەوتوترە..

٥- دیارە خوای گەورە دەرونی مرۆڤەکان زۆر چاك دەناسێت بۆیە پێی فەرمو ئێی مرۆڤ هەرچەندت پێ بدرێت هەرگیز تێر ناخۆیتو حەز دەکەیت زیاترت هەبێت..

کەواتە ئەم حەزە حەڵاڵەو حەرام نیە ئەگەر لە ڕێگای حەڵاڵەوە دەستی خۆی بخات.

# القصة الخامسة والثلاثون

## لِمَن الوَلَد

عن ابي هريرة (رضي الله عنه) ان رسول الله (ﷺ) قال: ((بينما مرأتـان معهمـا إبناهمـا، جاء الذئب بابن احداهما، فقالت: هذه لصاحبتها: انما ذهب بابنك أنتِ.

وقالت الاخرى: إنما ذهب بابنك، فتحاكما الى داود فتقضى به للكبرى.

فخرجتا على سليمان بن داود (عليه السلام) فأخبرتـاه، فقـال: إئتـوني بالـسكين أشـقه بينكما، فقالت الصغرى: لا، يرحمك الله، هو إبنها، فقضى به للضغرى)).[١]

قال ابو هريرة (رضي الله عنه): والله ان سمعت بالسكين قط الاّ يومئذٍ، مـا كنـا نقولـه الاّ المديّة.

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێت) لە پێغەمبەری خواوە دەگێڕێتـەوە (ﷺ) کـە فەرمویەتی:

دو ژن پێکەوە بونو یەکی منداڵێکیان (کۆرپەیان) بە بەرەوە بو لە ناکاو گورگێك پەیدا بو کردی بە یەکێك لە منداڵەکاندا فڕاندی..

ژنە گەورەکەیان منداڵەکەی گرت بە باوەشەوەو وتی: ئەمە کوڕەکـەی منـەو گورگەکـە کوڕەکەی تۆی خوارد.

ئەو ژنەکەش وتی: نا نا، ئەوەی تۆی برد.. سەرەنجام دادیان بردە لای داود پێغەمبـەر (سەلامی خوای لێ بێت)و ئەویش حوکمی وا کـرد لـە نێوانیانـدا کـە منداڵەکـەی دا بـە ژنـە گەورەکەیان.

کـە چـونە دەرەوە دایـان بـە لای سـلیمان پێغەمبـەرداو مەسـەلەکەیان بـۆ گێڕایـەوە، ئەویش فەرموی: چەقۆیەکم بۆ بهێنن تا بیکەم بە دو کەرتەوەو یەکی لەتێکی بەرن.

---

١ اخرجه البخاري من صحيح كتاب الانبياء، كتاب من القصص النبوي (٢٧٦).

ژنە بچوکەکەیان هاواری وردو وتی: نا، ڕەحمەتی خوات لێ بێت، شتی وا مەکە ئەوە منداڵە هی ئەوە بیدەرەوە بە ئەو.

سولەیمانیش فەرموی: دەی کەواتە منداڵی بچوکەکەیانەو دای بە بچوکەکەیان..

ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێت) وتی سوێند بە خوا تا ئەو ساتەی پێغەمبەر ئەم بەسەرهاتەی گێڕایەوە کەس وشەی(سکین) بەکارنەدەهێنا بۆ چەقۆ بەڵکو پێی دەوترا (مدیّة) واتە یەکەمین کەس بو بەکاری بێنێت.

# چیرۆکی سیو پێنجەم

## کوڕەکە هی کامیانە؟

جارێکیان لە ڕێگا دو ئافرەت دەگەن بە یەك کە هەردوکیان بۆ شارەکەی خۆیان دەگەڕانەوە..

یەکی منداڵێکیان کۆرپەیان بە باوەشەوە بو.. کاتێك گەیشتن بە یەك سڵاوو چاكو چۆنیان کردو بون بە هاوڕێ، لە ڕێگادا ماندو بونو لە ژێر سێبەری دارێکدا لایانداو دانیشتنو لەسەر کانیەك دەستو دەمو چاویان شۆرد.

گەورە: ئاه.. هیلاك بوین.. وەك جاران توانای ڕێگەم نەماوە..

بچوك: جا خۆ من گەورەیش نیم کەچی زو ماندو دەبم (لەبەر دڵی ئەو وا دەڵێت).

گەورە: کورە من لە ماڵ (١٠٠) ئیشم هەیە.. بەڵام کوڕەکەم ماڵی لە شار بو زۆر بیرم دەکردو حەزم دەکرد سەری لێ بدەم.. بەڵام بۆم نەدەکراو، دواجار خۆی هاتو لەگەڵ خۆی بردمی بۆ ماڵی خۆیان. سێ ڕۆژ لەوێ بوم.

بچوك: منیش کچەکەم لەگەڵ مێردەکەیدا هەندێ وردە گلەییان لە یەکتر هەبو هەندێ قسەم بۆ هەردوکیان کردو کەمێك باش بون بەس ماویانە..

گەورە: ئەی بۆچی لەگەڵ خۆت نەتهێنان بۆ شارەکەی خۆمان تا پێغەمبەرانی خوا داودو سولەیمان (سەلامی خوایان لێ بێت) هەندێ ئامۆژگاری خێریان بۆ بکردنایە بە خوا گەوهەر لە دەمیان دەردەچێت..

بچوك: ڕاستەکەی بە خوا سولەیمان لەگەڵ ئەوەشدا کە پادشایە بەڵام ئەوەندە تەوازوعو بێ فیزی تێدایە.. دادەنیشێتو کێشەی ئەمو ئەو چارەسەر دەکات، جاربەجارێك دێت بۆ ماڵمانو قسەی خۆشمان لەگەڵ دەکات..

گەورە: ئەی وایە کچێ، پێغەمبەرانو پیاوانی خودا ڕەوشتی بەرزو جوانیان ناگۆڕێت کاتێك پلەوپایەی بەرز وەردەگرنو هەروەك جاران خاکین.. خاکی.

گەورە: لە خۆیان بایی نابن.. ئێمە دەچین بۆ لای.. دەرگاوانەکان دەست نادەنە ڕێگەمانو تا لای عەرشەکەی ناوەستین...

بچوك: لەگەڵ هەمواندا وایە خەمت نەبێت.. ئەوانە سولالەی پێغەمبەرانن..

گەورە: ڕاستەکەی پادشاییو پلەوپایە کیبرو هەواو خۆبەزلزانی نایە بە لایاندا.. ئەها منداڵەکانمان پێکەوە یاری دەکەن.. چەند جوانن..

بچوك: ئەها.. دادەگیان.. ڕاکە منداڵەکان.. فریاکەوە.. گورگ هات بۆیان.. گورگ..

گەورە: کوا.. کوا.. خوایە ڕۆڵەکەم بپارێزە.. ڕا دەکات بەرەو منداڵەکان.. بەڵام گورگەکە فرسەت دەهێنێتو منداڵێکیان دەفڕێنێتو دەیخوات..

بچوکەکەش بە بەردو بە دار شوێنی دەکەوێت.. بەڵام بێ سود بو هەر بردیو بردی..

کاتێك هاتەوە دەبینێت.. یەکێك لە مناڵەکان نەماوە.. بەڵام ژنە گەورەکە منداڵێکی توند بە خۆیەوە گوشتوە..

بەڵام ژنە گەورەکە کردی بە منداڵی ژنە بچوکەکەداو وتی: ئەمە منداڵەکەی منە ماوەو منداڵەکەی تۆ توخوا دادەگیان گورگەکە فڕاندی.. سەبرو ئارام بگرەو باری خودایە ! !

بچوك: ڕازیم بە بەشی خوداو بە ئارام دەبم لەسەر هەمو ئەو ڕوداوانەی بەسەرم دێنی.. دەست دەکات بە گریان..

گەورە: دایکەکەم مەگری.. خوا ئەوانی ترت بۆ بهێڵێت.. (منداڵەکە ئەشارێتەوەو توند بە سنگیەوە دەیگوشێتو ناوێرێت لا بکاتەوە بە لای ژنە بچوکەکەدا، لە ترسی ئەوەی جوان سەیری نەکاتو نەیناسێتەوە).

گەورە: دەی من زۆر بە پەلەم من دەبێ بڕۆم زۆرمان پێچو، (دەیەوێ بڕوات).

بچوك: تێناگەم بۆ وا پەشۆکاوی؟ ئەی بۆچی وا بە پەلەی؟ خۆ تۆ وتت بە کەمێ دانیشینو ئیسراحەت بکەین.. ئێستا چی ڕوویداوە لێت؟ خۆ شکور منداڵی تۆ ساغەو خەمت نیە..

گەورە: پەشۆکان؟ پەشۆکانی چی؟ ماڵەوە چاوەڕوانمان دەکەن دەی با بڕۆین.

بچوك: لە خوا بەزیاد بێت بەس نەبو منداڵەکەی تۆشی نەفڕاند.. (دەست دەبات یاریەکی بۆ دەکاتو ئەویش پێ دەکەنێ)، یەکسەر بە پێکەنینەکەیدا دەیناسێتەوە.

بچوك: وەی بە قوربانت بم ڕێك لە پێکەنینی منداڵەمەی من دەچێت..

گەورە: منداڵەکەی تۆش وا پێئەکەنی؟

بچوك: ئادەی توخوا بمدەرێ با تێر ماچی بکەمو بۆیشت هەڵگرمو تۆ ناتوانیتو تەمەنت کردوەو بارەکەشت قورسە..

گەورە: (بە شڵەژانەوە) نا نا.. قەیناکات.. سوپاست دەکەم.. خۆم هەڵی دەگرم.. چۆنەبێ تۆ ئەو کارەشت بەسەرهاتوەو منداڵش بۆ من هەڵبگری؟ هەرگیز نایەڵم..

بچوك: ئاخر دادەگیان.. وا بزانم ئەو منداڵەکەی منە بە تۆ.. من پێکەنینو جلوبەرگو شێوەی منداڵی خۆم دەناسمەوە..

گەورە: چی چی چی؟ بۆ وادەزانی من منداڵەکەی تۆم کردوە بە هی خۆم؟

بچوك: ئێ ئەگەر هی من نەبو.. خۆ نایکەم بە هی خۆم.. بمدەرێ با سەیرێکی بکەم.. شەقم برد.. دەست دەبات بۆ منداڵەکەی.

گەورە: دەکێشێت بە دەستیداو تورە دەبێتو دەڵێت سەرز ئەرز قسە بکات من ئەم منداڵە هی منەو نایدەم بە کەس.. تێگەیشتی..

بچوك: خوشکە گیان بۆ خۆت تورە دەکەی.. با ئەم مەسەلەیە وەك دو دەستە خوشك چارەسەر بکەینو نەگاتە شکاتو دادگا..

گەورە: دادگای ناوێ دایکەکەم، منداڵی خۆمە، چ شەڕێکە پێم دەگێڕی..

بچوك: ئەوە بەڕاستە.. بۆ من کوێرم یان مسمەعیلم.. منداڵی خۆم ناناسمەوە.. ئەم بەیانیە.. کچەکەم ئەو قاتانەی بۆ کڕی..

گەورە: دەی دەی سیناریویەك دروست بکە.. بابە بڕۆ شکاتم لێ بکە خوایە کرد تا تا لای داود پێغەمبەر نەدەوەستایت..

پێکـەوە لـە خزمـەت داود پێغەمبـەردا دانیـشتونو مەسـەلەکەیان (بـە شـێوەی دەم جولانەوەو بێدەنگ) بۆ باس کردو ئەویش سەری بۆ دەلەقاندن.

داود: خوشکەکانم.. ئێستا ئەم مندالە لە لای ئەم ژنەیە..و تۆش دەلێـی منـدالی منـەو داوای دەکەیت..

بچوك: بەلێ ئەی پێغەمبەری خوا.. مندالی منە.. مندالەکـەی ئـەو گورگەکـە فڕانـدی.. من منالی خۆم دەناسمەوە..

گەورە: نەخێر ئەمە مندالەکەی منەو جەنابی حاکم مندالەکەی ئەو گورگ خواردیو من مندالی خۆم بە کەس نادەم.

داود: کەمێك بیری کردەوە پاشان بە ژنە بچوکەکەیانی فەرمو: ئێستا مندالەکـە لـە لای ئەم ژنەیەو تۆش داوای دەکەیت من بە چ بەلگەیەك لێی بسەنم بۆت..

بچوك: گەورەم.. خوا ئاگادارە.. ئەو مندالە هی منەو من شێوەو جلوبەرگو پێکـەنینو گریانی دەناسمەوە.

گەورە: بۆ لات وایە منالی ئێمە جلی لەبەردا نیە یان پێناکەنێت.

داود: کچم ئەمانە بەلگە نین.. تۆ ئەم مندالەت ناکەوێ.. پاشان ڕووی کردە گەورەکـەو پێی وت: سوێند دەخۆیت کە مندالی خۆتە؟

گەورەکە: بەلێ بە پەروەردگاری پاکانە مندالی خۆمە!!

داود (سەلامی خوای لێ بێت) حوکمی دەرکرد کە بدرێت بە گەورەکە.. گەورەکـەش زۆر سوپاسی داود پێغەمبەری کردو مەمنونی بو.. مندالەکەی هەلگرتو بردی..

بچوك: گەورەم ئەی پێغەمبەری خوا.. خوا ئاگادارە مندالی منە.. بەلام (الحکم لله) مـن لە حزوری پێغەمبەری خودا (داود) هیچ قسەیەکم نیەو لە دنیا ڕازیم بەو حوکمـە بـەلام لـە قیامەتدا ئەو مافـەم دەوێتو دەبێـت حـەقی ئـەو سـوێندە درۆیـەی لێ بکرێتـەوە بـە دەم گریانەوە هەستاو چوە دەرەوە (بە دەم خۆیەوە) هەرگیز لێی خۆش نابم..

لە دەرەوە ژنە بچوکەکە بە دوای ژنە گەورەکەدا ڕای کردو لێی دەپاڕایەوە کە منداڵەکەی بداتەوە بەڵام گەورەکە هەر لایشی لێ نەکردەوە.. لە خۆی دوری دەخستەوە..

تا ئەوە بو لە دورەوە سولەیمان پێغەمبەر هەستی کرد.. کە شتێکی غەریب لەم مەسەلەیەی ئەو دو ژنەدا هەیە.. بانگی کردن بۆ لای و داوای لێ کردن مەسەلەکەیان بۆ بگێڕێتەوەو حوکمی باوکیشی لێ پرسین..

بە بێدەنگی قسەکانی بۆ دەگێڕنەوەو ئەویش نەرم نەرم گوێ دەگرێت بۆیان.

(لە ناکاودا دەنگ بەرز دەبێتەوە) سولەیمان: بە دارودەستەکانی دەفەرموێت:

ئادەی چەقۆیەکی تیژم بۆ بهێنن، کە مو بکات..

پاسەوان: بەسەرچاو گەورەم، هەر ئێستا...

ژنەکان دەڕوانن بە یەکداو نازانن مەسەلە چیەو بە ترسەوە چاویان ئەبلەق دەبێت..

گەورەکە: گەورەم ئەی پێغەمبەری خوا چەقۆ چ پەیوەندی هەیە بەم مەسەلەی منو هاورێکەمەوە..

بچوك: گەورەم من بە حوکمی باوکی بەڕێزتان ڕازی بوم.. چی بکەم.. بەڵام چەقۆت بۆچیە، خۆ کەسمان سەر نابڕێت؟

پاسەوان چەقۆیەکی تیژی هێناو دایە دەستی سولەیمان پاشا (سەلامی خوای لێ بێت)و ئەویش وتی: ئەم منداڵە هی کامتانە ڕاستم پێ بڵێن.. چونکە پاشی کەمێك بەم چەقۆیە هەمو شتێکم بۆ دەردەکەوێت، پەلە مەکەن..

هەردو ژنەکە دوبارە منداڵەکە بە هی خۆیان دەدەنە قەڵەمو کەسیان واز لەو مافە ناهێنن.

سولەیمان (سەلامی خوای لێ بێت) فەرموی: من نازانم ئەم منداڵە هی کامتانەو کەسیشتان نایەوێت وازی لێ بهێنێت، بەڵام منداڵەکە یەك دایکی هەیە.. و ئەویەکە سۆزو خۆشەویستی لە سنور بە دەری بۆی هەیە.. کامتان ئا بەو جۆرە..

گەورە: من من گەورەم..

بچوك: من من گەورەم..

سولەیمان فەرموی: وا دیارە لەگەڵ ئێوەدا قسەی خۆش فایدەی نیە..

پاسەوان تەختەیەکم بۆ بێنە با منداڵەکەی لەسەر پاڵ بخەم.. پاسەوان تەختەیەکی گەورەو پانی بۆ هێنا..

ژنەکان زۆر سەرسامن‌و نازانن پادشا چی دەکات‌و ئەم منداڵە چی لێ دەکات..

سولەیمان: چەقۆکە دەخاتە سەر ملی‌و دەفەرموێت: ئێستا دەیکەم بە دو کەرتی یەکسانەوەو یەکی لەتێکیتان پێ دەدەم.

گەورە: گەورەم پاشامان.. منالی منە بۆ باوەڕم پێ ناکەن؟ بە خوا بیکەی بە دە کەرتیشەوە هەر منداڵ منەو دەمەوێتەوە..

بچوك: گەورەم هەر بە ڕاستیتە دەی‌کەی بە دو کەرتەوە؟

پاشا: بەڵێ کچی خۆم.. نازانم هی کامتانە.. خەریکە مێشکم تێك دەدەن‌و دادوەریم بیر دەبەنەوە.. بۆیە دەبێ هەر ئێستا سەری بڕم..

چەقۆکە بەرز دەکاتەوەو دەیخاتە سەر پێستی ملی منداڵەکەو لەو کاتەدا ژنە بچوکەکە پەلاماری دەستی سولەیمان دەدات‌و چەقۆکەی لێ دەسەنێت..

سولەیمان خۆی تورە دەکات‌و دەڵێت: ئەوە تۆ نازانیت لە دیوانی کێدایت عەرشی سولەیمان نابینی؟

بچوك: با گەورەم دەبینم..تۆ پێغەمبەری خوایت‌و پاشا وڵاتیشیت.

سولەیمان: بەڵام بۆچی چەقۆیەکەت لە دەست سەندم‌و ئاوا خۆت شپرزە کردوە؟

بچوك: گەورەم.. شێت دەبم ئەو منداڵە سەربڕیت.. ئەو جەرگو هەناوی منە.. ئەوەندەی هەمو دنیا خۆشم دەوێ..

گەورە: منداڵی منەو ئەو خۆشی دەوێت! !

بچوك: گەورەم سەری مەبڕە.. ئەگەر منداڵی منیش بێت بۆ ئەو من نامەوێت توخوا سەری مەبڕە..

سولەیمان فەرموی: وەرە کچی خۆم منداڵەکەت بەرەوە.. هی تۆیە.. من ئەوەم بۆیە کۆد تا بزانم کامتان زیاتر ناڕەحەت دەبن ئەوەتان دایکی ئەو منداڵەیە..

بە گەورەکەشی فەرمو: کچی خۆم.. لە ژیانتدا ڕاستگۆ بەو دور کەوەرەوە لە درۆ چونکە خوای پەروەردگار زۆر ڕقی لە درۆیە، دەی هەستە داوای لێبوردن لە خوشکەکەت بکە..

گەورەکە: بەڵێ من درۆم کرد.. گورگەکە منداڵەکەی منی خوارد، بەڵام بڕۆمەوە بۆ ماڵو منداڵەکەم پێ نەمابێت مێردەکەم سەرم هەڵدەکەنێتو دەڵێ کەمتەرخی خۆت بوە.. تەڵاقم دەداتو منداڵەکانی ترم لێ دەسەنێت.

سولەیمان: کچم.. من خۆم هاوسەرەکەت بانگ دەکەم بۆ کۆشكو قسەی لەگەڵ دەکەم بێ خەم بە هیچت پێ ناڵێت..

گەورە: زۆر زۆر سوپاست دەکەم گەورەم.. (ڕو دەکاتە ژنە بچوکەکە)و پێی دەڵێت زۆر داوای لێبوردنت لێ دەکەم... بە خوا منداڵەکە هی تۆ بو.. توخوا گەردنم ئازاد بکە..

بچوك: گەردنت ئازاد بێت خوشکی بڕوادارم.. بەڵام داوات لێ دەکەم هەرگیز سوێند بە درۆ مەخۆ ناوی خوا زۆر گەورەیە.. (هەڵدەسێت دەست دەکاتە ملی)و پاشان پێی دەڵێت: خۆتان خۆش بن..و خوا منداڵەکانی ترت بۆ بهێڵێتو ئەو منداڵەشت ببێتە زەخیرەی ڕۆژی دواییت..

هەردوکیان هەڵدەسنو دەچنە دەرەوە.. و سولەیمانیش سوپاسی خوا دەکات لەسەر ئەو بیرۆکە جوانەی (چەقۆکە) کە خستیە مێشکیو گرفتێکی گەورەی پێ چارەسەر کرد..

## پەندو چامۆژگاریەکانی ئەم چیرۆکە

١ـ ئافرەت لە چیرۆکەکانی پێغەمبەرماندا (ﷺ) ڕۆڵێکی گەورەو ئاشکرایان هەیەو هیچ عەیبە نیە ئەگەر ئافرەت لەناو تەمسیلیەکاندا دەربکەوێتو ئەو بیرۆکەیە خێزانە مسوڵمانەکان خۆیان دروستیان کردوە کە عونسوری خوشکان لە تەمسیلو شانۆگەریەکاندا کەمن یان نین..

بەڵام خۆ دەبێ هەبن، ئەی ئەگەر نەبن کێ ڕۆڵی ئاسیاو ئافرەتانی صحابیو ڕابعەی عەدەوی ببینێت؟ خۆ نابێت لە میسرەوە یان لە ئێرانەوە ئەکتەری ئافرەت قەرز بکەین.

بەڵام زۆر گرنگە پابەند بن بە بالاپۆشیو دور بێ لە پرۆڤەی تێکەڵیو لەگەڵ کوڕاندا مەگەر دەورەکەی لەگەڵ ئەو کەسەدا هەبێتو ناچاری کۆیان بکاتەوە ئەوەش نابێت بە هیچ جۆر خەڵوە دروست ببێت..

٢ـ دەبێ عونسوری ئاژەڵ لە تەمسیلی ئیسلامدا هەبێتو پرۆڤەیان پێ بکرێت لەسەر بینینی ڕۆڵەکانیان لەو فیلمانەدا.. ئەوەتا بۆ جاری تر لە دوای بەسەرهاتی یوسف جارێکی تر گورگ ڕۆڵی خۆی بینیەوە لە چیرۆکی پێغەمبەردا (ﷺ).

٣ـ لەوانەیە توشی کەسانێك ببیت لە ژیاندا کە بیانەوێت بە ئاشکرا ناهەقیت پێ بکەن.. و مافی ڕەوات لێ زەوت بکەن بەڵام تۆش وەك ئەو خوشکە بچوکەیان دو ڕێگا بەکاربهێنە.

یەکەم ڕێگای دان نان بەوەی کە ئەو ڕاست دەکاتو تا ئەوەندەی بەڵگەکانت دەکەوێتە دەستو پاشان بە بەڵگەوە مافی خۆت بسەلمێنە..

دوەم: ئەگەر بەرامبەرەکەت زۆر گیربو.. قسە سودی نەبو لەگەڵی، هەرگیز دەست مەدە ئێخەی بەڵکو برۆ دادگا ئاگادار بکە با دەوڵەت ئەو مافەت بۆ دەست بخات.

٤ـ زۆربەی ناکۆکیو سکاڵاکان درۆ دروستی دەکاتو ئەگەر ڕاستگۆیی لەناو هەر گەلێکدا بڵاوبێتەوە، دادگاو گرتوخانەکانی ئەو وڵاتە چۆڵ دەبن.نابینی ئەو دایکە بە تەمەنەیان ئەگەر ڕاستی بکردایەو بیگوتایە منداڵەکەی تۆ ماوە کێشەکە هەر لەوێدا تەواو دەبوو چارەسەر دەکرا..

٥ـ لەم چیرۆکەدا بەزەیی دایك دەردەخات کە تا چ ئەندازەیەك بە سۆزو میهرەبانە بەرامبەر کۆرپەکەی، هەرکە چەقۆکەی بینی خستیانە سەر ملی کوڕەکەی هاوارو ناڵەی دایکایەتی دەرکەوتو ڕازی بو منداڵەکەی لای خۆی نەبێت بەڵام سەری نەبڕن!.

ئەمە نمونەی دایکی ڕاستەقینەیە، نەك ئەو دایکانەی لە بچوکترین ناکۆکیدا لەگەڵ هاوسەرەکەی هەمو منداڵەکان بەجێ دێڵێ یان پاش جیابونەوە، پەنا بە خوا شەرم دەکات بڵێ فلان کەس منداڵی منەو هەواڵی ناپرسێت، ئیتر یان لەبەر عەیبە بێت یان لە ترسی هاوسەرەکەی دوەمی

٦ـ بۆ زانایانی ئیسلامی هەیە کە هەڵسێت بە دوبارە پیاچونەوەی فەتوای زانایەکی پێش خۆی ئەگەر بۆی دەرکەوت فەتواکە نەیپێکاوە، ئیتر با باوکیشی بێت وەك سولەیمان، یان لە خۆی گەورەترو ناودارتر بێت.

٧ـ بۆ هیچ زانایەکی ئیسلامی جوان نیەو ناشایستەیە کە لە لای خەڵکیدا هەستێ بە زەمکردنو تانەدان لە زانستو زانیاریو فەتوادانەکانی زاناکانی هاوڕێی..

نابینی سولەیمان (سەلامی خوای لێ بێت) نەیوت ئەم فەتوایەی باوکم هەڵەیە وەرن با من فەتوای تەواوو دروستتان بۆ بدەم!.

٨ـ (ابن حجر) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە دوای ئەم چیرۆکەوە فەرموی: ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دادوەریو چارەسەرکردنی کێشەکان ژیریو لێزانیو وردبینی مەسەلەکەی پێویستەو هیچ پەیوەندی بە تەمەنو خوێندەواریو پلەوپایەوە نیە..

٩ـ ڕێزی گەورەو گران دابنرێت بۆ باوكو هەرگیز بچوك نەکرێتەوەو لە پلەو مەقامی کەم نەکرێتەوە لە لایەن منداڵەکانیەوەو بەردەوام وەك سومبولی بنەماڵەکە سەیر بکرێتو کوڕ هەرچەندە پایە بەرز بێت چەپکە گوڵی دەستی باوكو دایکیەتی

نابینی سولەیمان (سەلامی خوای لێ بێت) پاشایەکی مەزنەو باوکیشی پلەوپایەیەکی وەك ئەوی نیە کەچی بانگی نەکرد تا بیهێنێتو بیشکێنێتو پێی بڵێ ئەمە چ فەتوایەکە داوتە! یان چ حوکمێکت دەرکردوە؟!!

نەك هەر ئەوە بەڵکو فەتوای بەسەر فەتوای باوکیدا نەدا بەڵکو لە ڕێگەی فێڵێکی حەڵاڵەوە کێشەکەی چارەسەر کرد.

١٠ـ بۆ زانایان یان فەرمانڕەواو دادوەران دروستە كە بـۆ دۆزینـەوەی ڕاسـتی مەسـەلەكەو ئاشكراكردنی تاوانبارو بێتاوان، هەندێ ڕێگا بگرنە بەر كە فێڵكردن، یان نواندنی شێوە تەمسیلیەك.

١١ـ جوان وایە بۆ مرۆڤ كە شتومەك یان منـداڵی زۆر تێكـەڵی شـتومەكو منـداڵی كەسـانی هاوڕێی نەكات، چونكە ئەوە دەبێتە هۆی ئەوەی كە كێشە دروست بكـاتو خـەڵكی تـر داوای خاوەندارێتی ئەو شتەی ئەو بكەنو لەگەڵ شمەكەكانی ئەواندا تێكەڵ دەبێت.

نابینی ئەو دو ژنە كۆرپەكانیان لە پاڵ یەكتردا دانابو.. دەی با یـەكێكیان بیهێنایـە بـۆ سەر كانیەكە لەگەڵ خۆیو لەوێ دای بنایە..

١٢ـ بەم چیرۆكەدا دیارە لەو سەردەمەدا جلوبەرگ زۆر سـادە بـوەو بـە نارەحـەت مـرۆڤ منداڵی خۆی لە منداڵی تر جیاكردۆتەوە.. ئەگینا ئەمڕۆ بوایە بـە فانیلـە سـورەكە یـان قاتە پەمەییەكەدا جیادەكرانەوە.

١٣ـ دەبـێ دادوەر زۆر ئاگـای لـە خـۆی بـێ لـە فـەتواو حوكمدانـدا.. چـونكە وادەبێـت یەكێكیان زۆرزانترو بە تەمەنترو قسەزانترەو قەناعـەتت پـێ دەكـات كـە فـەتوا بـە لای ئەودا بدەیتو بچیت بە هەڵەدا..

وەك چۆن ژنە گەورەكە بـە گریـانو قـسەی لـوس قەناعـەتی بـە داود كـرد كـە بـە ژنـە بچوكەكە بڵێ ئەوە منداڵی خۆیەتیو تۆ بەڵگەت پێ نیە وازی لێ بێنە بۆی.

١٤ـ ئەم چیرۆكە بەڵگەیە لەسەر پلەوپایـەی ژن لـە پەیامـەكانی پـەروەردگاردا دەتـوانێ خۆی سكاڵای خۆی بـەرز بكاتـەوە چـونكە ئەگـەر ژن بـە بـچوك یـان بـێ بایـەخ سـەیر بكردایە، داودو سولەیمان (سەلامی خوایـان لێ بێـت) دەیـانوت: بـڕۆن بـا مێردەكانتـان سكاڵا تۆمار بكەن..

١٥ـ مرۆڤ دەبێ لە كاتی ئاخاوتندا زۆر ژیرو وریا بێ، پیتەكانی لـە جێـی خۆیـان دابنـێو لەوانەیە لابردنی یەك پیت یان زیـادكردنی ببێتـە هـۆی تـوڕەكردنی دادوەرو حوكمەكـە دژی تۆ بدات..

نابینی ژنە بچوكەكە چەند ژیرانە (پیتی واو)ی بەكارهێنا لەگەڵ سولەیمانداو پێـی وت: (لا ویرحمك الله)، ئەگەر ئەو واوە نەبوایە كارەساتێك ڕووی دەداو دەبو بە (لا یرحمـك الله) واتە خوا ڕەحمت پێ نەكات.

# القصة السادسة والثلاثون

## موسى يضرب ملك الموت!

عن ابي هريرة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ): جاء ملك الموت الى موسى (عليه السلام) فقال له:

أجب ربك: قال: فلطم موسى (عليه السلام) عين الملك الموت ففقأها، قال: فرجع الملك الى الله تعالى فقال:

إنك أرسلتني الى عبد لك لا يريد الموت وقد فقأ عيني، قال: فردَّ الله اليه عينه، وقال:

إرجع الى عبدي فقل: الحياة تريدْ.. فان كنت تريد الحياة فضع يدك على منبت ثورٍ فما توارت يدك من شعرة فانك تعيش بها سنة..

قال: ثم مَهْ؟! قال: ثمَّ الموت!!

قال: فالآن من قريب، رب أمتني من الارض المقدسة رمية بحجر.

قال رسول الله (ﷺ): ((والله لو إني عنده، لأرأيتكم قبره الى جانب الطريق عند الكثيب الأحمر)).[1]

واتە: ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: بەرپرسی مردن (عەزرائیل) (سەلامی خوای لێ بێت) هات بۆ لای موسا (سەلامی خوای لێ بێت)و پێی وت:

وەڵامی فەرمانی پەروەردگارت بدەرەوە، واتە کاتی گیان کێشانت هاتوە.

دەفەرموێت: موسا یەك بۆکزی دا بە ناو چاوی فریشتەی مەرگو چاوێکی کوێر کرد، دەفەرموێت: فریشتەی مەرگ گەڕایەوە بۆ لای خوای گەورەو وتی:

تۆ منت نارد بۆ لای بەندەکەت بەڵام ئەو حەز ناکات بمرێتو چاوێکی دەرهێنام.

---

١ رواه البخاري ومسلم من صحيح قصص النبوي، ص (٤٥٩).

دەفەرموێت: خوای گەورە چاوەکەی بۆ گێڕایەوە.. پێی فەرمو: بگەڕێرەوە بۆ لای بەندەکەم (موسا)و پێی بڵێ: حەز دەکەیت بژیت.. ئەگەر حەز بە ژیان دەکەیت دەست بهێنە بەسەر پشتی گایەکداو دەستت بەری هەر مویەك کەوت بە پێی موەکان ئەوەندە ساڵ دەژیت..

و کاتێك فریشتەی مەرگ هاتەوە خزمەت موسا پێغەمبەرو ئەو قسانەی پێ وت:

موسایش (سەلامی خوای لێ بێت) فەرموی: ئەی دوای ئەوە چیم بەسەر دێت؟

فریشتەی مەرگ فەرموی: پاش ئەوە دەبێت بمریت!

موسا (سەلامی خوای لێ بێت) فەرموی: دەی کەواتە با ئێستا بێتو با زوتر بێت.. ئەی پەروەردگارم لە نزیکم زەوی پیرۆز (الارض المقدسة)[1] گیانم بکێشە بە ئەندازەی کەسێك بەرد بگرێت واتە دوری بەردە دەستێك.

لە دوای ئەم فەرمودەیەوە پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرموی: سوێند بە خوا ئەگەر من لەوێ بومایە (واتە لە فەلەستین) جێگا گۆڕەکەیم پێ نیشان دەدان کە لە نزیك تەپۆلکەیەکی لمی سورەوەیە..

---

١ واتە لە نزیك (قدس) لە فەلەستین.

## پەندو ئامۆژگاریەکانی ئەم چیرۆکە

١ـ مردن کارەساتێکی زۆر دڵتەزێنە.. ناڕەحەتیەکە.. گەشتێکە بە وشە دەرنابڕێت.. بۆیە زۆر پێویستە هەمیشە لە یادماندا بێتو بیکەینە هۆیەك بۆ باوەش نەکردن بە دنیادا..

بەردەوام ئامۆژگاریێکی گەورەو گرانبەها بێت بۆ خۆمانو کەسوکارو هاوڕێکانمان وەك پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرمویەتی: ((کفی بالموت واعظاً یا عمر))..

٢ـ ئەو کارەی موسا پێغەمبەر کردی (سەلامی خوای لێ بێت) لەگەڵ فریشتەی مەرگدا مرۆڤەکان پێیان بکرایە هەمویان دەیانکرد..

چونکە هیچ کەس حەز ناکات ڕوبەڕوی مردنو گۆڕی تەنگوتار ببێتەوەو هەر هۆی ئەوەشە کە خوا بەزەیی بە فریشتەی مەرگ هاتەوە لە لایەكو مرۆڤەکانیش لە لایەکی ترەوە لە کاتی گیان دەرچوندا (ملك الموت) نابینن.

٣ـ هەندێ لە زاناکان لە ناویاندا (ابن حزیمە) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) پێی وایە کە موسا (سەلامی خوای لێ بێت) هەر گوێی لێ بو یەکێك پێی وت: (وەڵامی پەروەردگارت بدەرەوە واتە ئێستا دەتکوژم!!).

ئەویش وای زانی مرۆڤەو هاتوە بیکوژێت، ئەم زوتر لێی هاتە دەستو بۆکزێکی لێداو بەری چاوی کەوتو چاوی تەقاند.. بە بەڵگەی ئەوەی کە دوایی زانی (ملك الموت)ەو لە شێوەی ئادەمیزاددا هاتوە بۆ لای داوای لێبوردنی لێکردو فەرموی گیان کێشانی لێکرد..

٤ـ بەوەی کە خوای گەورە (جل جلالە) لۆمەی پێغەمبەرەکەی نەکرد لەسەر ئەو کارەی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە باش دەیزانی پێغەمبەرەکەی ڕقی لە مردن نیەو حەزی لە ژیانو ڕابواردنی دنیایی نیە..

بۆیە سەرزەنشتی نەکرد بەڵکو بە (ملك الموت)ی فەرمو ئەوە چاوەکەتە چاکی دەکەمەوەو بڕۆ بۆ لایو عەرزی بکە ئەگەر حەزی لە ژیانە با تەمەنی درێژ بکەینەوە..

٥ـ هیچ کەس لە موسڵمانان نابێت خەفەت بخۆن کە تەڵەموی سپی دەکەوێتە سەرو ریشیانو بەرەو پیربونو مردن دەڕۆن.. چونکە ئەم سەر زەویە هۆڵی تاقیکردنەوەی خواییەو ڕۆژێك دێت قوتابیانی سەر زەوی وەرەقەی پرسیارەکان بدەنە دەستی (فریشتەی مەرگ)و ئەویش لە ڕێگەی کرداری مردنەوە لە هۆڵەکە دەیانکاتە دەرەوە..

٦ـ لە کاتی هەڵسوکەوتکردندا لەگەڵ خەڵکی زانستی دەرونناسی پێمان دەڵێ: نابێت خێرا هەڵبشاخێین بەو کەسانەدا کە فەرمانمان جێبەجێ ناکەن یان هەڵەمان بەرامبەر دەکەن..

بەڵکو دەبێت بە قسەی خۆشو قەناعەت پێکەر بیانخەینە سەر ڕێگەی ڕاستو دروستو بەبێ ئەوەی زویریان بکەین..

نابینی خوای (عز وجل) لە دوای سکالای (ملك الموت) لە دەستی پێغەمبەرەکەی (سەلامی خوای لێ بێت)و لۆمەو سەرزەنشتی نەکرد..

٧ـ ئەگەر خەڵکی هەڵەیەکیان لێ وەشایەوەو کارێکی وایان کرد کە بۆنی داواکاریەکی لێ دەهات..

تۆ دەتوانی بۆ چارەسەری ئەو هەڵەیە یان ئەو کێشەیە.. داواکارەکەی بۆ جێبەجێ بکە..

نابینی خوای گەورە فەرموی: ئەگەر حەز دەکات زیاتر بژیو جارێ نەمرێت با بڕوات دەست بێنێ بەسەر موەکانی پشتی گایەکداو دەستی بەری چەند تەڵ مو کەوت ئەوەندە ساڵ مۆڵەتی ژیانی پێ دەدەم.

٨ـ موسا (سەلامی خوای لێ بێت) بۆ ئەوەی بیسەلمێنێت کە ئەو کارەی لەبەر ئەوە نەکردوە کە ڕقی لە مردنەو حەزی لە ژیانە..

چونکە ئەگەر خەڵکی ئاوا لە پێغەمبەران تێبگەن، زۆر ترسناکە چونکە ئاشکراترین پەیامی پێغەمبەران ئەوەیە کە هانی خەڵکی بدەن دڵ بە دنیا خۆش نەکەنو لە مردنیش

نەترسن‌و بەڵكو وەك پردێك سەیری بكەن كە بە هۆیەوە دەگەنە حزوری خوای خۆشەویستیان (عز وجل).

٩ـ دیارە پێغەمبەرمان كە ئەم چیرۆكانەمان بۆ دەگێڕێتەوە.. زۆر زۆر دڵنیایە كە وشە بە وشەی لە لایەن خواوە خراوەتە مێشكی‌و لە خۆیەوەو نایڵێت بەڵكو ئەوەش جۆرێكە لە نیگای خوایی ئەگینا محمدێكی نەخوێندەوار لە چ زانكۆیەكی دنیا هونەری چیرۆك فێر بوە؟.. ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە بە ڕاستی پێغەمبەری خوا بوەو زەرەیەك گومان لەناو دڵەكاندا ناهێڵێتەوە.

١٠ـ لەوەی كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە كۆتایی چیرۆكەكەدا فەرموی: ئەگەر ئێستا لە (بیت المقدس) بومایە گۆڕەكەی موسام پێ پیشان دەدان!.

بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە پێغەمبەر (ﷺ) زۆر بە دڵنیایی تەواوەوە باوەڕی بەوە هەبوە كە ئەم چیرۆكانە ڕاستی‌و مەلموسن‌و هەڵقولاوی هیچ ئەندێشەیەك نین‌و دروست نەكراون.

# القصة السابعة والثلاثون

## الغنيُّ المتجاوز

عن ابي هريرة (رضي الله عنه) عن رسول الله (ﷺ) قال: ((إنَّ رجلاً لم يعمل خيراً قط وكان يداين الناس فيقول لرسوله: خذ ما تيسّر واترك ما عَسُرَ لعل الله تعالى ان يتجاوز عنَّا.

فلما هلك قال الله (عز وجل) له: هل عملتَ خيراً قطُّ؟ قال: لا، الا إنه كان لي غلام وأنا أدين الناس فاذا بعثتُهُ ليتقاضى.

قلتُ له: خذ ما تيسر ماترك ما عَسُرَ لعل الله يتجاوز عنَّا قال الله تعالى: قد تجاوزت عنكَ)).[1]

واتە: ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێت) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی:

پیاوێك هەبو (لە ئومەتەکانی پێش ئیسلام)دا یەك کاری چاکەی لە ژیاندا ئەنجام نەدابو.

ئەم پیاوە پارەی بە قەرز دەدا بە هەژارانو بە بریکارەکانی خۆی دەوت (کاتێك بچونایە بۆ وەرگرتنەوەی قەرزەکان) چی لە دەستدا بو وەری بگرەو چەندێکیشی پێ نەدرایەوە چاوپۆشی لێ بکە بەڵکو خوایش (لە ڕۆژی قیامەتدا) چاوپۆشی لە ئێمە بکات..

لە پاش مردنی خوای (عز وجل) پێی فەرمو: ئایا (ئەی بەندەکەم) تۆ لە هەمو ژیانتدا کاری خێرو چاکەت کردوە؟.

پیاوەکەش لە وەڵامدا وتی: پێ بزانم نەمکردوە جگە لەوەی کە بە من کاریگەرم هەبو (خزمەتکار) پارەم بە قەرز دەدا بە خەڵکی (نەدارو هەژار)و بەو خزمەتکارەمم دەوت: کە دەچی پارەکان کۆ بکەیتەوە، چەندێکیان توانی بیدەنەوە لێیان وەربگرەو چەندێکیشیان

[1] حدیث صححه الالباني: لە کتێبی (٣٠ قصص بلسان محمد) لاپەڕە (٦١).

لە دەستدا نەبو چاوپۆشیان لێ بکە (واتە لێیان مەسەنە) بەڵکو خوای (عز وجل)یش لە ڕۆژی قیامەتدا چاوپۆشی لە ئێمە بکات..

خوای گەورەیش فەرمووی: دەی ئەوا ئێمەش چاوپۆشیمان لە هەمو گوناهەکانت کرد..

# چیرۆکی سیو حەوتەم

## دەوڵەمەندی لێبوردە

(احمد شاكر) پیاوێکی بازرگانی زۆر دەوڵەمەند بو.. سەروەتو سامانی ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر دەبو..

لەو سەردەمەشدا زۆرینەی کۆمەڵگەکە بە دەست هەژاریو نەداریەوە دەیاننالاندو گرانی بو..

ئەم پیاوە کاسبیو بازرگانی سەرقاڵی کردبو.. نەیدەپەرژایە سەر بەندایەتیو پەرستشو خواناسیو تەنها فەرزەکانی بەجێ دەهێنا.. ئیتر لە ژیانیدا خێری نەدەکرد بەو هەموە سامانەیەوە ! !

دو پیاوی هەژار پێکەوە قسە دەکەنو باسی ئەو پیاوە دەوڵەمەندە دەکەن..

یەکەم: دەنگو باسو وەزعو گوزەرانت کوە ؟

دوەم: گوزەرانم چی بێت بە خوا باوەڕ ناکەم کەسێك هەبێت لە من داماوترو هەژارتر بێت..

یەکەم: وا مەڵێ.. من پێویستم بە کۆڵێ پارەیە تا کچەکەم بەرم بۆ دەرەوەی وڵات، بەڵام کەس نیە ئەو برە پارە زۆرەم پێ بدات.. خەریکە سوێم دەبێتەوە سەیری ئەو کچە نەخۆشەم دەکەم..

دوەم: بەڵێ ئێمە کەسمان نەخۆش نین شوکر بۆ خوا، بەڵام دینارێك لە گیرفانماندا نیە، کارو کاسبیم نیە.. خەریکە مێشکم دەتەقێت..

یەکەم: خۆ تۆ جاران دەست ڕەنگین بویت.. وەستایەکی کارامە بویت؟.. بۆچی ئەمڕۆ دەستەوسانیت..

دوەم: پارەم نیە.. ئەو ئیشەی من بە پارەو دەستمایە دەکرێت..و کەسیش شك نابەم متمانەم پێ بکاتو ئەو هەموە پارەیەم بداتێ..و ئێ خۆ ناهەقیشیان نیە لە چی بیاندەمەوە ؟ !

یەکەم: من کەسێکی دەوڵەمەندی خزممان دەناسم لەوانەیە ئەو پارەیەت بداتێ. چونکە قەرز دەدات بە خەڵکیو دەستو دڵیشی باشە..

دوەم: ئەی خۆت بۆ داوای قەرزی لێ ناکەیست؟و پارەی لێ وەرناگریت بۆ نەخۆشەکەت؟

یەکەم: لە بەرنامەمدا هەبو بچم بۆ لای بەڵام ئەوەی ڕاستی بێت، دوایی نەمزانی ئایا دەتوانم بیدەمەوە یان نە.. هەر هۆی ئەوەش بوە کە نەچوم بۆ لای..

دوەم: دەی با بەیانی بچین بۆ لای.. بەڵکو قەرزمان پێ بداتو چارەسەری کێشەکانمانی پێ بکەین..

هەردوکیان دێن بۆ ماڵی (احمد شاکر)و یەکێك لە پیاوەکانی فەرمویان لێ دەکاتو دەیانهێنێتە دیوەخانو پێیان دەڵێت:

چاوەڕوان بن.. کەمێکی تر جەنابی کاك احمد دەگەڕێتەوەو دەتانبینێت.. بەڵام ئەگەر بۆ ئەوە هاتون گەورەم خێرتان پێ بکات، ئەوە حەز دەکەم چاوەڕوان نەکەن.. چونکە پێ بزانم لە ژیانیدا خێری نەکردوە..

یەکەم: نا نا.. بۆ سواڵ نەهاتوین.. کەمێك کاری تایبەتمان پێیەتی..

هەردوکیان بە سەرسوڕمانەوە سەیری دیوەخان دەکەن کە شتی جوانو نایابو گرانبەهای تیا دانراوە..

کاك احمد دەگەڕێتەوە.. دێتە ژورەوە بۆ لایانو تەوقەیان لەگەڵ دەکاتو دادەنیشێت.. ڕودەکاتە یەکەمەکەیان..

احمد: ها.. کاك سعید بەخێر بێی. دەنگوباستان..

یەکەم: سوپاست دەکەم.. زۆر باشم.. دەژین..

احمد: ئا پێم بڵێ کچەکەت چۆنە؟ باش نەبو لە نەخۆشیەکەی؟

یەکەم: نە بە خوا.. وەك خۆی وایەو بگرە ڕۆژ بە ڕۆژ خراپتر دەبێتو لێرەش چارەسەری نیە..

احمد: ئەی بۆ نایبەی بۆ دەرەوەی ولآت؟ چۆن لێت نەپرسیوەتەوە..

یەکەم: کاك احمەد گیان.. قسە لە گیرفانی گەرمەوە دەکرێت بەلآم من ئەو پارەیەم نیەو کەسیش شك نابەم ئەو پارە زۆرەم بە قەرز بداتێ..

احمد: خوا دەبری دەکات إنشاء الله.. خەم مەخۆ.. ئێ ئەی تۆ دەنگوباست لەگەڵ پیشەکەتدا بەردەوامی..

یەکەم: کاك احمد بۆ نەتزانی تەفنیشی هێنا..زەرەرێکی گەورەی کردو ئێستا دەستەپاچەیە..

احمد: ئای.. بە داخەوە.. کە هەواڵێکی ناخۆشە..

پاش کەمێك احمد بانگی خزمەتکارەکەی دەکاتو پێی دەڵێت: ئاوەرە سامان بزانم ئەمڕۆ چیت کردوە..

سامان: گەورەم ڕۆیشتم قەرزەکانم کۆکردەوە.. بەلآم بە ڕاستی بێتاقەتیان کردم!.

احمد: بۆچی؟ هیچ بوە؟

سامان: یەکێکیان دەڵێت: (لە دەستمدا نیە لێم بوەستە تا مانگێکی تر!)و یەکێکی تر دەڵێت( قەرزەکە زۆرە لە هەندێکی خۆش ببن!)و یەکی تر دەڵێت: (لەو کاتە دیاریکراوەدا کە تۆ دێی پێم نیەو ئەگەر کەوتە دەستم خۆم دەیهێنم).. توخوا ئەگەر قەرز بدەیت بە کەس گەورەم..

احمد: وا مەڵێ سامان گیان.. ئێمە خێرو چاکەمان نیەو پارە بە خەڵکی نابەخشین.. ئەگەر قەرزیشیان پێ نەدەین تەواو خراپ دەبین و خۆپەرست دەردەچین..

دوەم: ئەی خوای گەورە سەد ئەوەندەی ترت پێ بدات.. کە مادەم دەستو دڵت ئەوەندە جوانە..

یەکەم: گەورەم ئێمە دەمانەوێت بڕۆین..

ئەحمەد: پەلە مەکەن.. (سامان بانگ دەکات).

سامان: بەڵێ گەورەم.. فەرمو لە خزمەتدام!.

احمد: بۆ دو شت بانگم کردی.. یەکەم: بزانە ئەم دو پیاوە بە چەندێ کاریان دەڕوات.. قەرزیان پێ بدەو ماوەیان بۆ دیاری بکە..

یەکەم: ئەوە بە ڕاستتە کاك احمد (پەلاماری دەدات دەستی ماچ بکات) بەڵام احمد نایەڵێو دەڵێت: گەورەم قەرزێکی زۆرمان دەوێ..

احمد: هەرچەندیان ویست بیاندەرێ..

سامان: بەسەرچاو گەورەم.. بەڵام نەمزانی داواکاری دوەمت چی بو؟..

احمد: ئاھ.. ڕاست دەکەی.. بڕیارم داوە لەمەولا هەر قەرزارێك لە دەستیدا نەبو بیداتەوە.. لێی بوەستەو تەنگی پێ هەڵمەژنە..

دوەم: هەر کەسێك وتی نیمە بتاندەمەوەو بۆت دەرکەوت ڕاست دەکات وازی لێ بێنەو بیبەخشە..

سامان: گەورەم بۆچی.. جا کەی مەجبورین ئەوە بکەین؟ احمد: سامان لە مەجبوریدا ئەوە ناکەم..

سامان: دەی کەواتە بۆ دەیکەیت؟

احمد: ئێمە لەمەولا ئاسانکاری لەگەڵ خەڵکی فەقیرو هەژاردا دەکەینو چاوپۆشیان لێ دەکەین.. بەڵکو خوای گەورەیش لە ڕۆژی قیامەتدا چاوپۆشیمان لێ بکاتو لێمان ببورێت..

لەوێدا دوەم هاتە قسەو وتی: گەورەم مژدەبێ لێت خوا لە ڕۆژی قیامەتدا چاوپۆشیت لێ دەکات..

احمد: تۆ ئەمە چوزانی؟.. خۆ لەو دونیاوە نەهاتویتەوە؟..

دوەم: گەورەم پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) فەرمویەتی: لەناو گەلانی پێشودا دەوڵەمەندێك هەبو.. هەرگیز خێرو چاکەی نەکردوە بەڵام هەمو جارێ بە خزمەتکارەکەی وتوە:

لەو قەرزارانە چاوپۆشی بکەن کە نیازیانە بیدەنەوە بیانبەخشن بەڵکو خوای گەورەیش لە قیامەتدا چاوپۆشی لە ئێمە بکاتو بمانبەخشێت.

کاتێك مرد خوای گەورە لێی پرسی: لە ژیانتدا چاکەت کردوە؟ ئەویش وتی: پێ بزانم نەخێر بەڵام ئەوەندەم هەبو کە بە خزمەتکارەکانم دەوت قەرز بدەن بە خەڵکیو پاشان چەندیان لە دەستدابو لێیان وەربگرنەوەو چیشیان نەتوانی بیدەنەوە چاوپۆشیان لێ بکەن..

خوایش پێی فەرمو: دەی مژدەت لێ بێت ئەوا ئێمەش لە تۆ خۆش بوینو چاوپۆشیمان لێ کردی..

کاك احمد: ئەڵڵا کە فەرمودەیەکی دڵخۆشکەرە، خۆزگە هەمو دەوڵەمەندەکان ئەم فەرمودەیەیان دەبیستو کاریان لەسەر دەکرد.. دەی مەرج بێ ئێوە شایەت بن لەمەولا.. نەك هەر قەرز بدەم بەڵکو سامان گیان کێ هەژارو دەست کورتە لیستێکم بۆ بکەرەوە با بتوانم هاوکاریان بکەم.

## پەندو ئامۆژگاریەكانی ئەم چیرۆكە

١ـ هەرگیز خێرو چاكەی نەكردوە، بەڵگە نیە لەسەر ئەوەی كە تەنها باوەڕدار بوەو كردەوەی نەبوە.. بەڵكو فەرزەكانی پەروەردگاری كردوە بەڵام خێری نەكردوە چونكە خێركردن بە زۆر نیەو بە ئارەزوی كەسەكەیە.

٢ـ قەرزدان بە خەڵكی كارێكی زۆر گەورەو خێرێكی مەزنەو بەڵام بە مەرجێك سودی نەخاتە سەرو تەنگ هەڵنەچنێت بە قەرزدارەكانو ناڕەحەتیان نەكات.

٣ـ خوای (عز وجل) لەگەڵ ئەوەشدا زۆر ئاگاداری نهێنیەكانی مرۆڤە كەچی لە ڕۆژی قیامەتدا پرسیار لە بەندەكانی دەكات: ((ئایا تا ئێستا خێرو چاكەیەكت كردوە؟)).

ئەمەش بۆ باوەڕداران جێگای دڵخۆشیەو فەزڵو میهرەبانی خوا دەردەخات بۆ ئەو بەندەیە، وەك پێی بڵێ وا نەزانی پێم نەزانیوی بەڵام لەبەر ئەو چاوپۆشیانەی دنیات لە قەرزارەكان لێت خۆش بوم..

٤ـ خوای (عز وجل) لە پەیامە پیرۆزەكەیدا هەمو هۆكارێكی بەكارهێناوە تا خەڵكانی دەوڵەمەندو پایەدار لابكەنەوە بە لای هەژارانداو كەمێك نەهامەتیەكانیان كەم بكەنەوە ئەگەر قەرزیشیان پێ دابن..

٥ـ ئەگەر مرۆڤ بیەوێت بزانێت بەچی خوا خۆشحاڵ دەكاتو لێی ڕازی دەبێتو چاوپۆشی لە هەڵەو تاوانەكانی دەكات..

با دەست بهێنێت بەسەری هەتیوانداو هاوكاریان بكاتو دڵی بێوەژنو پیرەپیاو خۆش بكات سەرجەم نەداران بەسەر بكاتەوە.

٦ـ دروستە مرۆڤ كارەكانی بداتە دەستی كەسانی ئەمینو دەستپاك تا بۆی ڕاپەڕێننو ئەركەكانی سەرشانی سوك بكەن..

٧ـ دروستە مرۆڤ بۆ جێبەجێ كردنی پێداویستیەكانی قـەرز بكـات بـە پێـچەوانەی هەنـدێ كەسی تێنەگەیشتووەوە كە وا دەزانن قەرزكردن نەنگیە پێی سوك دەبن یـان ترسـنۆكن دەترسن نەتوانن بیدەنەوە (نازانن كە خوای گەورە بژاردنی قەرزی بەنـدەكانی گرتۆتـە ئەستۆ ئەگەر مەبەستیان دانەوە بێت وەك پێغەمبـەر (ﷺ) دەفـەرموێت: ((ثـلاث حـق علی الله عونهم...... الدائن یرید الأداء))..

## القصة الثامنة والثلاثون

## سفرة الأصدقاء[1]

عن ابي سعيد الخدري (رضـي الله عنـه) قـال: (انطلـق نفر مـن أصحاب الـنبي (ﷺ) في سفرةٍ سافرها حتى نزلوا على حيّ من احياء العرب.

فاستضافوهم، فأبوا ان يضيفوهم فلدغ سيد ذلك الحيّ، فسعوا لـه بكـل شـيءٍ لا ينفعـه شيء.

فقلب بعضهم: لو أتيتم هؤلاء الرهط الذين نَزَلوا، لعلّه ان يكون عند بعضهم شيء.

فأتوهم فقالوا: ياأيُّها الرهط ان سيدنا لُدِغَ وسعِنا له بكل شيء لا ينفعـه فهـل عنـد أحـد منكم من شيء؟

فقال بعضهم: نعم والله اني لأرقي، ولكن والله لقد استـضفناكم فلـم تـضيفونا، فمـا بـراق لكم حتى تجعلوا لنا جعلاً.

فصالحوهم على قطيع من الغنم، فانطلق يتفلُ عليه، ويقرأ الحمد لله رب العالمين، فكانما نشط من عقال، فانطلق يمشي وما به قلبة.

قال: فأوفوهم جُعلهم الذي صالحوهم عليه، فقال بعـضهم: أقـسموا فقـال الـذي رقـى، لا تفعلوا حتى ناتي رسول الله (ﷺ) فنذكر له الذي كان، فنظر ما يأمرنا.

فقدموا على رسول الله (ﷺ) فذكروا له فقال: ومـا يـدريك إنهـا رقيـة فـضحك رسـول الله (ﷺ).[2]

واتە: ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێ بێت) دەفەرموێت دەستەیەك لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ)بـۆ گەشـتێك لـە مـاڵ دەرچـون.. تـا گەیـشتنە ناوچـەی یـەكێك لـە هـۆزە عەرەبەكان..

---

١ ئــەم چــیرۆكە پێغەمبــەرمان نەیگێڕاوەتــەوە بــەڵام لــە هــاوەڵان ڕوی داوەو لەبــەر گرنگــیو بەچێژیەكەی خستمە ڕیزی چیرۆكە تایبەتیەكانی پێغەمبەر (ﷺ)، (نوسەر).

٢ صحيح البخاري من كتاب (٣٠) قصة بلسان محمد (ص: ١٩) لعصام الشائع.

داوایان لێ کردن جێگایان بکەنەوەو میوانداریان بکەن.. بەڵام ئەو هۆزە ئامادە نەبون میوانداریان بکەن..

لەو کاتەدا گەورەی هۆزەکەی مار پێوەی دا.. خەڵکەکەش بە هەمو شێوەیەك هەوڵی چارەسەرکردنیان دا بەڵام بێ سود بو..

بۆیە لەناو خۆیاندا وتیان ئەگەر بڕۆن بۆ لای ئەو پیاوانەی کە لە نزیك هۆزەکەوە بەزیون، بەڵکو ئەوانە چارەسەرێکیان پێ بێت.

هاتن بۆ لای هاوەڵانو پێیان وتن: ئەی برادەران گەورەی هۆزەکەمان مار پێوەی داوەو هەمو شتێکمان لەگەڵدا کردو چارەسەری نیە.. ئەی ئێوە شتێکتان پێ نیە کە چارەسەری پێ بکەن بۆمان؟

یەکێکیان وتی: بەڵێ، سوێند بە خوا من دوعایەکم لە لایەو بۆی دەکەم بەڵام وەڵڵاهی ئێمە داوامان لێ کردن میوانداریمان بکەن، بەڵام ئێوە میوانداریتان نەکردین.

دەی سا منیش دوعاتان بۆ ناخوێنم تا پاداشتەکەیمان بۆ دیاری نەکەن.

ئەوانیش لەگەڵیان ڕێك کەوتن لەسەر یەك ڕان مەڕ! . ئەویش هات بۆ لای نەخۆشەکەو سورەتی فاتیحەی بەسەردا خوێندو پاشان تفی خۆی خستە سەر شوێنی گەستنی مارەکەو کابرا هەڵسایەوەو دەستی کرد بە گەڕان وەك بڵێی (بەتی بڕیوە)و یەك دەردو دای نەما..

دەڵێ: ئەوانیش ئەو بڕەی بۆیان دیاری کردبون پێیان دان. هەندێکیان وتیان با بەشی بکەین لەناو خۆماندا.. بەڵام ئەو هاوەڵەی دوعاکەی بۆ کردبو وتی: شتی وا نەکەن تا دەگەڕێینەوە بۆ لای پێغەمبەری خواو مەسەلەکەی بۆ دەگێڕینەوەو بزانین فەرمانی بە چیە؟!..

هاتنەوە خزمەت پێغەمبەری خواو ڕوداوەکەیان بۆ گێڕایەوەو ئەویش فەرموی: چۆنت زانی ئەوە دوعای چارەسەرە؟

پاشان پێی فەرمون: شتێکی باشتان کردوەو بەشی بکەنو بەشێکیش بۆ من دیاری بکەن لەگەڵ خۆتاندا..

و پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستی کرد بە پێکەنین..

# چیرۆکی سیو هەشتەم

# گەشتی هاوڕێیان

کۆمەڵێك هاوڕێو کۆبونەتەوە..و لەناو خۆیاندا قسە دەکەن..

یەکەم: لەم ماوەیەدا پێغمبەری خوا (ﷺ) نیازی دەرچونی نیە.. بۆ غەزا.. و هەمومان لە ماڵەوەیان.. برایان چۆنە بچین بۆ سەیران..

دوەم: منیش لەگەڵتام با بچین بۆ بیابانو لەوێ هەوایەکی پاك هەڵمژینو غەمێك بدەین بە با..

سێیەم: هەروەها منیش لە زوەوە نەچوم بۆ ڕاو بەڵکو ئەویش شتێك بکوژین..

چوارەم: ئەی چۆنە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاگادار بکەینو لەویش بانگ بکەین بۆ ئەم سەیرانە، چونکە بە ڕاستی دوژمنانی خوا خەفەتی زۆریان پێداوە با کەمێك لەو کەشوهەوا سازگارەدا مێشکی پیرۆزی بحەوێتەوە..

پێنجەم: من ئەمشەو دەچمە خزمەتیو قسەی لەگەڵ دەکەم بزانم لەگەڵمان دێت.

شەشەم: پرسی پێ بکە سەرەتا، بزانە پێی خۆشە ئێمەش بڕۆین؟ نەوەك ڕازی نەبێت، ئەو کاتە گوناهبار دەبین..

لە ڕۆژی داهاتودا.. بەڕێوەن لە دەشتو چیاکانداو بەڕێوە قسەی خۆش دەکەن..

یەکەم: ئای کە خۆش بو پێغەمبەری خوایش (ﷺ) ڕازی بوایەو لەگەڵماندا بوایە.. سەیرانەکەمان چەند خۆش دەبو..

چوارەم: کورە شوکری خوا بکەن بۆ ئێوەیش ڕازی بو.. هەوڵ بدەین زو بگەڕێینەوە بۆ مەدینە..

سێیەم: ئەوە کەروێشکێکە من دەچم بەڵکو ڕاوی بکەم.. بسم الله.. تیروکەوانەکەی ئامادە دەکاتو دەڕوات بۆی.. پاش کەمێك دێتەوە..

دوەم: کەروێشکەکەی هاوڕێت کوا؟

سێیەم: هەر نەمزانی چی لێ هات! خۆی کرد بە چ کونێکدا.. داوای لێبوردن دەکەم خوا نەیکردە نسیب..

(هەندێ.. نیشانە شکێنی دەکەن‌و پاشان هەندێ پێشبڕکێ دەکەن‌و پاشان هەندێ خورمایان پێیە دەست دەکەن بە خواردنی.

وردە وردە شەو داهات‌و دنیا تاریك بو.

یەکەم: برایان تازە مەدینە دورە ناتوانین بگەڕێینەوە.. ئا لە پشتی ئەم گردەوە دێیەك هەیە بەڵکو لە لای ئەوان لابدەین‌و ئەمشەو لەوێ بین انشاء اللهو بەیانی گەشتەکەمان درێژە پێ دەدەین.

دوەم: من ئەم دێیە بناسم.. کەمێك لەگەڵ میواندا ساردو سڕن با نەڕۆین.

یەکەم: چارمان نیە.. شەو لەم دەشتەدا دڕندە پەلامارمان دەدەن‌و دێکانی تریش زۆر دورە.. یەڵلا فەرمون با بڕۆین..

لە ڕێگا دەگەن بە دو پیاو بە خاکەناسەوە بەرەو ماڵ دەگەڕێنەوەو گوێدرێژێکیان داوەتە پێشی خۆیان‌و بە دەم خۆیانەوە قسە دەکەن.

یەکەم: ئەرێ برایان.. بە یارمەتیتان سلام علیکم..

جوتیار: وعلیك السلام.. ئا ئەمە لە کوێوە هاتون بەم درەنگ وەختە.

یەکەم: ئێمە کۆمەڵێك هاوڕێین.. هاتوین بۆ گەشت‌و سەیران‌و وا لێرە شەومان بەسەر هات‌و دەمانەوێت ئەمشەو لای ئێوە میوان بین ئەگەر میوانداریمان بکەن.

جوتیار٢: بە داخەوە.. ئەم دێیەی ئێمە جێی کەس ناکەنەوەو میوانداری غەریب‌و نەناس ناکەن.

یەکەم: بۆچی؟ لەبەرچی؟ ئەی ئێمە چی بکەین لەم بیابانە چۆڵ‌و هۆڵەدا..

جوتیار١: ئەوە کێشەی خۆتانە.. ئەم دێیەی ئێمە ماران گازە.. کاتی خۆی جێی میوانێکمان کردەوەو ڕێزی زۆرمان لێ گرت کەچی لە نیوەشەودا دزیەکی باشی لێ کردین‌و بۆی دەرچو.. هەر نازانین ئەرز قوتی دا یان ئاسمان.

دوەم: بەڵام ئێمە دز نین‌و زۆریش لە دزی دورکەوتوینەتەوە.. ئێمە هاوەڵی پێغەمبەری خواین.. لە هەمو ڕەوشتە ناشیرینەکان دوری خستوینەتەوە، فێری هەمو کارێکی چاکەی کردوین..

جوتیارەکان سەیرێکی یەکتر دەکەن‌و دەڵێن.. یاخوا بەخێر بێن ئێمە هەواڵی ئەو پیاوە چاکەمان بیستوە بەڵام قورەیشیەکان بە چاکە ناوی نابەن‌و دەڵێن عەقڵی گەنج‌و منداڵ‌و بەندەکانی تێك داوین..

یەکەم: بە پێچەوانەوە برای عەرەبم.. ئێمە لە دوای ئەوەی شوێنی ئاینی ئیسلام کەوتوین ژیری‌و عەقڵمان بۆ گەڕاوەتەوەو لە باتی ئەوەی بە دەستی خۆمان بت بتاشین‌و بیکەین بە خواو بیپەرستین..

دوەم: محمد هات‌و پێی وتین: ئەم دارو بەردە هیچ سودو زیان ناگەیەنن‌و دەبێ بەدیهێنەری ئەم بونەوەرە بپەرستن کە ناوی (الله)یە..

جوتیار ١: شتێکی ماقوڵە.. قورەیش ڕاستیان نەوتوە پێمان..

جوتیار ٢: ئەمە کەی قسەیە یانی بتە جوانەکەی من کە بە پارەیەکی زۆرم کڕیوە خوا نیە؟

دوەم: برای عەرەبم.. خوا ئەگەر خوا بێت‌و بەدیهێنەری هەمو بونەوەر بێت چۆن بە پارە دەیکڕی..

جوتیار ٢: ها.. ها.. وەڵا ڕاستەکەی.. ئای لە نەزانی ئێمە..

جوتیار ١: براکانم.. من دەزانم ئەمشەو ئێوە لەم دێیەی ئێمە جێتان نابێتەوەو کەس میواندارێتان لێ ناکات.. بەڵام وا دیارە ئێوە کۆمەڵێك پیاوچاکن.. وەرن من لەناو باخچەکەمدا ژورێکم هەیەو هەمو شتێکی لێیەو چرایشی لێیە.. دای بگیرسێنن‌و تا بەیانی لەوێ بن‌و زۆر گەرم‌و خۆشە..

جوتیار ٢: فیکرەیەکی جوانە با بیانبەین بۆ ناو باخەکە..و ئەوەش تەماتەو خەیارە لە بۆستانەکەم هێناومەتەوە ئەمشەو بیخۆن..

جوتیارەکە ئاگریان بۆ دەکەنەوەو چراکە دادەگیرسێننو پاشان پێش ئەوەی بڕۆن پێیان دەڵێن:

جوتیار: بە بێدەنگی لێرە بنو هاوار هاوار مەکەن نەوەك پێتان بزانن.. دوایی ئێمە سزا دەدەن کە میوانداریمان کردون..

یەکەم: خەمتان نەبێت.. ئەوەندە ماندوین.. یەکسەر خەومان لێ دەکەوێت.. نوزەمان نایەت..

جوتیارەکان: دەی زۆر باشە.. خواتان لەگەڵ.. دەڕۆنەوە..

لە نیوەی شەودا کۆمەڵێك کەسی لادێکە لەگەڵ دو جوتیارەکەدا دێنە سەریانو لە دەرگاکە دەدەن..

یەکەم: برایان تەقەی دەرگایە..

دوەم: خۆزگە کێ بێ بەم نیوە شەوە؟ تۆ بڵێی پێیان زانیبێن؟

سێیەم: لە کونی دەرگاکەوە سەیر دەکاتو دەڵێت: (٥، ٦) کەسن.. هاتونەتە سەرمان.. توش بوین..

یەکەم: کێیە؟

جوتیار: منم بیکەرەوە جوتیارەکەی هاوڕێتانم.

دوەم: ئەمە چیە.. خێرە؟ ئەم هەموەت هێناوەتە سەرمان..

جوتیار ١: بیکەنەوە برایان، نیازی خراپمان پێتان نیە.. کێشەیەکمان هەیە.. زۆر گەورەیە.. هانامان بۆ ئێوە هێناوە..

دورگاکە دەکەنەوەو سەیرێکی خەڵکەکە دەکەنو دەڵێن: فەرمون وەرنە ژورەوە.

جوتیار: وەختی ئەوە نیە.. کارەساتێکی گەورەمان لێ قەوماوەو بەڵکو ئێوە چارەسەرێکتان پێ بێت.

دوەم: چی بوە؟ بۆمان بگێڕنەوە...

جوتیار: گەورەی ئاوایيەکەمان مار پێوەی داوەو وەزعی زۆر خەتەرەو هەرچی چارەسەرە لەگەڵیدا بە کارمان هێنا کەچی سودی نەبو.. خەریکە دەمرێت..

دوەم: دەی ئێمە چیمان پێ دەکرێت بەڕێزان؟

جوتیار: ئەی پێغەمبەرەکەتان شتێکی فێر نەکردون تا بیخوێنن بەسەر نەخۆشدا تا چاك بێتەوە؟..

یەکەم: با.. من دوعایەکی چاك دەزانم کە بیخوێنم بەسەریدا (إنشاء الله) چاك دەبێتەوە...

جوتیار: دەی بۆ وەستاون با بڕۆین.. کاتەکە زۆر ناسکە ئێ من ژورم پێ نەداون لە باخەکەمدا؟

دوەم: ڕاست دەکات.. خێرە با بڕۆین.. گەورەکەیان ڕزگار بکەین لە مردن..

یەکەم: نا.. نا.. نایەم.. چونکە خەڵکی ئەم دێیە.. زۆر خراپ بون لەگەڵمانو جێگەیان نەکردینەوە..

جوتیار ١: بە قوربانت بم وەختی تۆڵەکردنەوە نیە کاتەکە زۆر ناسکە..

دوەم: قەیناکات برای موسڵمانم.. با بڕۆین چارەسەری بکەین.. ئەی پێغەمبەر فێری نەکردوین کە هەمو کەسمان خۆش بوێتو کینە لە دڵ نەبین..

یەکەم: با.. گیانم بە قوربانی بێ فێری هەمو چاکەیەکی کردوین.. بەڵام فێری ئەوەشی کردوین کە موسڵمان نابێ گێل بێتو ماف خوراو بێ..

جوتیار ١: چیتان دەوێ بۆتان دەکەین بەڵام زوکەن با بڕۆین..

دوەم: ئێوە میوانداریتان نەکردین.. بۆیە ئێمەش بە خۆڕایی دوعای شیفای پێدا ناخوێنین..

جوتیار ١: ئەی هەر زۆر باشە چیتان دەوێ پێتان دەدەین..

دوەم: (٥٠) مەڕمان دەوێت..

یەکەم: ئەوە تۆ دەزانی چی دەڵێی؟

دوەم: زۆر چاك دەزانم چی دەڵێم.. دەرسیان دادەدەم تا میوانداری جوان فێر ببنەوە..

جوتیار: (٥٠) کوڕە با (٦٠) بێتو بەڵام سەرۆکی هۆزەکەمان لە مردن ڕزگار بکەن..

دوەم: ئێمە ڕزگاری ناکەین لە مردن.. تەنها خوا دەتوانێت خەڵکی لە مردن ڕزگار بکات، دەی کوڕینە هەڵسن با بڕۆین..

سەرۆکی هۆز لەناو جێگەدا ڕاکشاوەو خەڵکەکە بە چواردەوریدا خڕ بونەتەوەو زۆر غەمبارنو هەندێکیان دەگرین..

هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) دێنە ژورەوە سڵاو دەکەن.. خەڵکەکە وەڵامیان دەدەنەوە..

یەکەم: سڵاو لە هەمو لاتان.. خەڵکینە ئێمە هاوەڵی محمدین (ﷺ) کە پێغەمبەری خوایەو لە مەدینە نیشتەجێیە..

ئەو محمدە کاتێك هات ئێمە بتمان دەپەرستو زوڵمو ستەممان لە یەکرتی دەکردو کچمان زیندەبەچاڵ دەکرد، بەڵام ئەو هاتو ڕزگاری کردینو خوای پەروەردگاری هەمو جیهانی پێ ناساندین..

و ئەو خوایەش قورئانی پیرۆزی بۆ ناردوین تا مرۆڤەکان بیخوێننو لێی تێبگەنو کردەوەی پێ بکەنو وا من ئەمرۆ دەیخوێنم بەسەر ئەم پیاوەدا کە گەورەی هۆزەکەتانە..و داوایش لە خوا دەکەم کە شیفای بدات إنشاء الله..

یەکەم: بە دەنگی بەرز (سورەتی فاتیحە) دەخوێنێت بەسەر پیاوەکەداو دەست دەهێنێت بەسەر جێگەگازی مارەکەدا..و پاشان کەمێك تف لە دەمی دەردێنێتو دەیدات لە شوێنی برینەکە...

پیاوەکە چاو دەکاتەوەو هەڵدەسێتەوەو بە ژورەکەدا لە خۆشیاندا ڕادەکاتو دەڵێت: ئێشم نەما.. ئێشم نەما.. چیتان لێ کردم؟

جوتیار: گەورەم ئەم بەڕێزانە لە شاری یەسریبەوە هاتونو قورئانیان بەسەردا خوێندیو چاك بویتەوە..

گەورە: هاوەڵانی محمدن؟

جوتیار: بەڵێ گەورەم..

گەورە: بە ڕاستی موبارەکن.. دەستپاکیو ڕەوشتبەرزی محمد لەناو قورەیشدا دەنگی داوەتەوە.. ئەی شەو لە کوێ بون..

جوتیار: ها.. ها.. دەترسێت...

جوتیار ٢: گەورەم ئەمشەو.. ڕێگەیان کەوتە ئەم دێیەی ئێمە.. بەڵام ئێمە لە ترسی فەرمانەکەی جەنابتان نەمانتوانی میوانداریان بکەین.. بەڵام لەناو باخەکەی مندا مانەوە..

گەورە: چی چی چی؟ لەناو ئەو باخە ساردو سڕەدا؟ و هاوەڵانی بەڕێزی (محمد)؟

یەکەم: ئێمە محمد (ﷺ) لەم ئاینە نوێیەدا فێری کردوین کە ڕێزی تەواوی میوان بگرینو لە باشترین شوێندا دایانبنێینو چاکترین خواردنیان پێ بدەین.

گەورە: ئەی ئێمەش لە ساتەوەختە بە دوا.. میوان دەخەینەوە سەر چاومانو هەر کەسێك پەنای بۆ ئەم دێیە هێنا پەنای بدەنو ڕێزی تەواوی لێ بگرن باشە؟

(هەمو دەڵێن: فەرمانی جەنابتانە گەورەم)

گەورە: دەی هاوەڵانی محمد: ئێوە فریشتە بون.. خوا بۆ منی ناردن.. ئادەی چیتان دەوێ با بتاندەمێ؟

جوتیار: گەورەم من وەعدی (٥٠) سەر مەڕم پێدابون ئەگەر جەنابتان چاك بکەنەوە.

یەکەم: مادەم وای لێ هات ئێمەش لەبەر خودا دوعامان پیاخوێندیو هیچمان ناوێ دەستتان خۆش بێت..

گەورە: زۆر سوپاس بۆ ئێوە.. بەڵام من خۆم پێم خۆشە خەڵاتتان بکەم.. کوڕینە بەیانی (٧٠) سەر مەڕ جیا بکەنەوەو پێیان بدەن.. و سڵاویشم بگەیەنن بە پێغەمبەرەکەتانو پێی بڵێن پەیامێکی زۆر مەزنی هێناوە لەگەڵ خۆیو خۆشحاڵ دەبین ڕۆژێك بگاتە ئەم هۆزەی ئێمەش..

(هاوەڵان (٧٠) سەر مەڕینا پێیەو بەرەو شاری مەدینە دەگەڕێنەوە لە ڕێگا لەناو خۆیاندا قسەیان دەکرد).

سێیەم: ((ان الله یرزق من یشاء بغیر حساب)) ئای سبحان الله من هەرچیم کرد تاقە کەروێشکێکم بۆ ڕاو نەکرا کەچی بوین بە خاوەنی (٧٠) سەر مەڕ! !

یەکەم: باشە براگیان.. خۆ ئێمەش هەمومان فاتیحەمان لەبەر بو.. بەڵام چۆن ئەمەت بۆ هات؟ سڵاوت لێ بێت..

دوەم: قورئان هەموی شیفایە.. شیفای دڵو دەرونە.. شیفای لەشی مرۆڤەکانە ئەی خوای گەورە نافەرموێت: ﴿ وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴾.[١]؟

یەکەم: دەی برایان با دانیشینو بە ئیسراحەت مەڕەکان لەناو خۆماندا بەش بکەین..

دوەم: تکاتان لێ دەکەم ئەوە بە ڕاستتانە.. من ڕازیم نیەو شتی وا ناکەم.

سێیەم: بۆچی؟ خۆ بە تەما نیت هەموی بەریت بۆ خۆت؟

دوەم: نا برای شیرینم هەرگیز.. بیر لە شتی وا ناکەمەوەو ئێمە دەستەیەك براینو لە خۆشیو ناخۆشیدا بەشدارین..

سێیەم: خۆ دەزانم.. من چاکت دەناسم، بەڵام ئەی بۆچی بەشی نەکەین؟

دوەم: بەشی ناکەین تا دەچینەوە خزمەت پێغەمبەری سەروەرمان (ﷺ)و مەسەلەکەی بۆ باس دەکەین تا بزانین کارێکی باشمان کردوەو دروستە ئەو مەڕانە ببەینو پارەی دوعاکردنەکە حەرام نیە..

سێیەم: وەڵڵاهی ڕاست دەکەیت.. باشە ئێمە بۆ ئەوەمان لەبیر نەبو؟.

چوارەم: ئێمە لە ژیانماندا هیچ کارێکمان نەکردوە تا پرسمان بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەکردبێت کە ئایا ئەوە دروستەو خوا پێی خۆشە یان نا؟ بەڵام ئەمە یەکەم جار بو شتی وامان نەهاتۆتە ڕێگە..

دوەم: (ڕوی کردە هاوەڵی چوارەم) ئەوا گەیشتینە نزیك مەدینەو تۆ مەڕەکان بەرەوە بۆ پەچەکەی خۆتانو دواتر وەرەوە با پێکەوە بچینە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ)و مەسەلەکەی بۆ ڕون بکەینەوە..

---

١ الاسراء (٨٢).

هەر چواریان خۆیان کرد بە مزگەوتەکەی پێغەمبەردا (ﷺ) یەکی دو ڕکات نوێژیان کردو پاشان چونە خزمەت پێغەمبەر (لەسەر چۆك دانیشتن).

پێغەمبەر دانیشتبو لە میحرابی مزگەوتداو بلالو عماری لەگەڵدا بون.

(هاوەڵی دوەم) چوە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) بەڵام لەبەر ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) لە چیرۆکدا دەرناخرێت (وئەهلی سوننەتو جەماعەت جورئەتی ئەوە ناکەن) بۆیە (عماری کوڕی یاسر وەلامی پرسیارەکان دەداتەوە.

عمار: پێغەمبەری خوا (ﷺ) لێتان دەپرسێت ئایا گەشتێکی خۆشتان بەسەر برد..

دوەم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا هەرچەندە بەبێ تۆ هیچ شتێك تامو لەزەتی نیە..

دوەم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) شتێکی سەیرمان بەسەر هات با ئەم بەڕێزە کە بەسەری خۆی هات بۆتی بگێڕێتەوە.

عمار: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت بۆم بگێڕنەوە زۆرر حەز بە بیستنی دەکەم.

دوەم: بە دەنگی نزم کە بینەر نابیستێ بۆی دەگێڕێتەوە لە ناکاودا عمار دەستی کرد بە پێکەنین وتی:

عمار: پێغەمبەری خوا بۆ ئەوە پێکەنی کە چۆن زانیت سورەتی فاتیحە شیفابەخشە؟! چونکە زۆر ڕاستە سورەتی فاتیحە بەو جۆرەیەو شیفابەخشە..

دوەم: ئەی لە بەرامبەردا (مەڕی) زۆرمان وەرگرتوە، دروستە بۆمان بیخۆین.. شتێکی ناڕەواو ناشەرعیمان نەکردوە؟

عمار: پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێتان دەفەرموێت نەخێر شتێکی ناڕەواتان نەکردوەو باشتان کردوەو پێتان حەڵاڵەو تەنانەت بەشێکیشی بۆ من دابنێن (بە پێکەنینەوە)..

دوەم: نەك بەشێك؟ گیانیشمان پێشکەشی پێغەمبەری خوا بێت (ﷺ).

## پەندو ئامۆژگاریەکانی ئەم چیرۆکە

١ـ شتێکی جوان‌و دروستە کە کۆمەڵێك هاوڕێ کۆببنەوەو بۆ گەشت‌و سەیران بەرەو کەژو کۆسارو دەشت‌و بیابانەکان بڕۆن‌و کەمێك لە جوانی سروشت بکۆڵنەوەو گەورەیی نەخشێنەرەکەیان بۆ دەربکەوێت.

٢ـ ئاستی هۆشیاری هاوەڵان دەردەخات کە لەو کاتەشدا سەیرانیان کردوەو لە ئیشوکاری ڕۆژانە دورکەوتونەتەوە.

٣ـ پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگری لە هاوەڵان نەکردوە لە چون بۆ سەیران‌و گەشتوگوزار،و بگرە هانی داون‌و لە پاش گەڕانەوەش هەواڵی گەشتەکەی پرسیون‌و خۆشی بەشداری دەستکەوتەکانیان کردوە.

٤ـ دروستە مرۆڤ لە سەفەرو گەشتوگوزاردا، بڕوات‌و داوای کۆمەکی‌و هاوکاری‌و میوانداری لە خەڵکی ئەو ناوچەیە بکات کە گەشتەکەیان بۆ کردوە، بە مەرجێك ئوتێل‌و چێشتخانەو شتی تری لێ نەبێت، ئەگەر لێی بو دەبێت نەفسی بەرز ڕابگرێت‌و داوای هیچ لە کەس نەکات.

٥ـ مرۆڤ دەبێت چاوەڕوانی ئەوەش بکات کە جاری وا هەیە داوای شتێك لە یەکێك بکات‌و ئەوان ڕەدی بکەنەوەو پێی نەدەن.. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە ئیتر وازبێنێت لە داوای شت کردن لە خەڵکی لە کاتی پێویستدا..

٦ـ ئەم چیرۆکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هاوەڵان زۆر لە مەدینە دورکەوتبونەوەو گەیشتبونە هۆزێك کە هێشتا ئیسلامیان پێ نەگەیشتوە بە دو بەڵگەدا:

یەکەم: ڕەفتاری وشك‌و ناشیرین لە کەسی موسڵمانی ئەو سەردەمە ناوەشێتەوە کە حیسابی هاوەڵانیان بۆ دەکرێت کە میوانداری کەس نەکەن..

دوەم: ئەم هۆزە هەواڵی پێغەمبەریان لێ نەپرسین‌و سیمای موسڵمانەتیان پێوە دیار نەبو.

٧ـ دروستە گەشتوگوزارو سەیران بۆ ناوچەی کافرو بێباوەڕان و خواردن و خواردنەوەی دەستیان جگە لە سەربڕاویان..

٨ـ دروستە لە کاتی نەبونی و پێویستیدا لەسەر دوعاکردن و قورئان خوێندن پارە وەربگیرێت بە مەرجێك نەکرێت بە کاسپی.

٩ـ دەبێت مرۆڤی موسڵمان هەمیشە لێبوردە بێت و هەوڵ بدات چاکە بکات لەگەڵ ئەو کەسانەی کە خراپەی لەگەڵدا دەکەن و بە وشکی لەگەڵی دەجوڵێنەوە و بەڵکو ئەو بە کردەوەی جوان و چاکەکردن سەرسامیان بکات و خەجاڵەتیان بۆ بهێڵێتەوە..

١٠ـ پێویستە موسڵمان لە هەمو کارو کردەوەیەکیدا هەڵوێستەیەك بکات و بڵێ ئاخوا ئەم کارەی من دەیکەم حەڵاڵە یان حەرامە، با بچم بە قورئان و سوننەتدا بیانکێشم بزانم دروستن بۆم تا بیانکەم..

١١ـ دەبێت سەرکردە نمونەیی بێت و لە هاوەڵ و فەرمانبەرەکانی بپرسێتەوە و هەواڵی گەشت و گەڕان و ئیشوکارەکانیان بپرسێت.

١٢ـ سەرکردە دەبێت دەم بە پێکەنین و ڕوخۆش بێت لەگەڵ ژێردەستەکانیداو بە جۆرێك ڕوی خۆش بێت کە بە ڕوداوە خۆشەکانیان پێبکەنێت..

١٣ـ سەرکردە دەبێت بۆ ئەوەی خەڵکی متمانە بە فەتواکانیان بکەن و وەری بگرن لێی بڵێ تەنانەت منیش ئامادەم لێی بخۆم واتە ئەوەندە حەڵاڵە..

١٤ـ لە کاتی بەڵاو ڕوداوی گەورەدا موسڵمان نابێ ڕقی کۆن بخوێنێتەوە و لەم حاڵەتی زەعف و لاوازیەی نەیارانیدا خۆشحاڵ و کەمتەرخەمی بکات لە هاوکاری کردنیاندا.

١٥ـ موسڵمان دەتوانێت لە بەرامبەر ئەو خزمەتکاریانەی پێشکەشی دەوڵەت یان سەرکردەکەی دەکات، داوای کرێ و پاداشت بکات بە تایبەتی ئەگەر ئەو حکومەتە لەگەڵ ئەودا باش نەبوبێت و گەمارۆی جێگاو خواردنی خستبوە سەر.

١٦ـ وەك ئەوەی لادێکە کردیان بەرامبەر بە هاوەڵان (ڕەزای خوایان لێ بێت).

# القصة التاسعة والثلاثون

## مێرولەكان بێتاوانن!!

عن ابي هريرة (رضي الله عنه) قال: سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: ((قرصَتْ نملة نبياً من الأنبياء، فامر بقرية النمل فأُحْرِقَتْ فأوحى الله إليه أن قَرَصَتْ نملة أحرقت أمة من الامم تسبِّح)).[1]

واتە: ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەفەرموێت: لە پێغەمبەری خوام بیستوە (ﷺ) فەرمویەتی: مێرولەیەك یەكێك لە پێغەمبەرانی گەستو ئەویش فەرمانی دەركرد یەك شارە مێرولەی تەواو بسوتێنن.

خوای گەورە نیگای بۆ پێغەمبەرەكەی كردو پێی فەرمو: تۆ یەك مێرولە گەستیتی كەچی یەك شارە مێرولەت سوتاند كە (تەسبیحاتی) خوایان دەكرد، واتە ڕەخنەو سەرزەنشتی كرد لەسەر تۆڵەسەندنەوەی چەندقات.

---

١ صحيح البخاري، لە كتێبی (٣٠ قصة بلسان محمد (ﷺ)).

## پەندو ئامۆژگاریەکانی ئەم چیرۆکە

١ـ تورەبون لە ئیسلامدا شتێکی خراپەو پێغەمبەرمان (ﷺ) ئامۆژگاری پیاواکی کردو فەرموی: (لا تغضب) واتە: هەرگیز تورە مەبە.

٢ـ ئەوپەڕی دادپەروەری پەروەردگارو بەزەیی هاتنەوەیەتی بە بچوکترین دروستکراویدا کە مێرولەیەو لەسەری هاتە جوابو ڕەخنەی لە پێغەمبەرە نازدارەکەی خۆی گرت لەسەر ئەو تەنها مێرولەیە..

٣ـ خوای گەورە لەسەر مێرولەیەك هاتە وەڵامو بە بەهانەی ئەوەی کە تۆ گەلێکت لەناو برد زیکرو یادی خوایان کردوە کەواتە نابێت هەرگیز ئەو کەسانەی کە یادی خوا دەکەنو تەسبیحاتی پەروەردگار دەکەن بە سوك سەیر بکەینو خراپەیان بەرامبەر بکەین..

٤ـ خۆشەویستترین کەس لە لای خودا توشی ئەشکەنجەو نارەحەتی دەبن وەك مرۆڤەکانی تر مێرولە دەیانگەزێتو مارو دوپشك پێوەیان دەداتو بەڵام پاداشتی خوایی بە چەندان قات چاوەڕوانیان دەکات..

# القصة الاربعون
# بركة الله

عن أبي هريرة (رضي الله عنه) عن النبي (ﷺ) قال: بينما أيوب يغتسل عريانا، خرَّ عليه رجل جراد من ذهب، فجعل يحثي في ثوبه فناداه ربّه: يا أيوب ألم اكن أغنيتك عما ترى؟

قال: بلى ياربِّ ولكن لا غِنى لي عن بركتكَ).[١]

واتە: ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێت) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی: لە کاتێکدا کە ئەیوب پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) بە ڕوتی خۆی دەشۆرد..و لەو کاتەدا وەك سوننەو کوللە ئاڵتون باری بەسەریداو ئەویش لە خۆشیاندا کۆی دەکردەوەو دەیکردە کراسەکە..

خوای گەورە بانگی کرد: ئەی ئەیوب ئەوە من دەوڵەمەندم نەکردوی‌و سامانم پێ نەداویت؟

ئەیوبیش لە وەڵامدا وتی: بەڵێ ئەی پەروەردگارن بەڵام کێ لە فەڕو بەرەکەتی تۆ تێر دەبێت..

---

١ صحيح، رواه البخاري، له كتێبی (٣٠ قصة بلسان محمد (ﷺ)).

## پەندو ئامۆژگاریەکانی ئەم چیرۆکە

١ـ لە ئیسلامدا دروستە مرۆڤ بە ڕوتی خۆی بشوات بە مەرجێك تەنها بێتو لەگەڵ خەڵکی تردا خۆی نەشوات واتە لە حەمامی گاگەلیدا نەبێتو ئەگەر بە ڕوتی دروست نەبوایە خەڵکی دەکەوتنە نارەحەتیەکی زۆرەوە.

٢ـ ئاڵتونو پارەی حەلاڵ، فەرو بەرەکەتی پەروەردگارەو بەندە بۆی هەیە چەندێك دەتوانێت لێی کۆبکاتەوەو پەیدای بکات بە حەلاڵی بە مەرجێك زەکاتی لێ دەربکاتو هاوکاری هەژارانی پێ بکات.

٣ـ لە ئیسلامدا موسڵمانی دەوڵەمەندی سوپاسگوزار باشترە لە موسڵمانی هەژارو دەست کورت، چونکە یەکەم توانای خێرکردنو دەستگرۆیی هەژارانو نەدارانی هەیە بەڵام دوەم تەنها پاداشتی ئارامیو خۆگری بۆ دەنوسرێت.

٤ـ پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێت) زۆر خۆیان بە بچوك زانیوەو تەوازوعیان بێ سنور بوەو خۆیان بە زل نەزانیوەو وەك پاشاو سەرکردەکان سەیری خۆیان نەکردوە، ئەوە ئەیوبە خۆی خۆی دەشواتو بە دەمدا ناکەوێتو خەڵکی بیشۆنو بیشێلن..

کەواتە ئەمڕۆ زۆرێ لە بەرپرسو سیاسەتمەدارەکان عەیبیان لێ دێت بچنە بازاڕو لەگەڵ خەڵکی بگەڕێنو شت بکڕنو خۆیان عەلاگە بگرن بە دەستەوەو بچنەوە بۆ ماڵەوە.

بەڵکو ئەگەر وا دەزانن لە سەیارەی جام تاریکدا نەبن نامێننو سوكو بێ نرخو ڕیسوا دەبن!! کە ئەمەش پێچەوانە هەدی ئاینی پیرۆزی ئیسلامە..

٥ـ ئەگەر خوا بیەوێت کەسێك دەوڵەمەند بکاتو ماڵو سامان ببارێنێت بەسەریدا دەیکاتو پێویستی بەوەش نیە کەسەکە کاسپی بکاتو بازرگان بێت.

٦ـ هەر کەسێك لە تاقیکردنەوەی خواییدا دەربچێتو بە سەبرو ئارامیەوە پێشوازی لە هەژاریو نەخۆشی بکات، ئەوا خوای گەورە لەش ساغیو ماڵو سامانی وەك لێزمە باران دەبارێنێت بەسەریدا..

## ئەم بەرهەمە پێشکەش بێت بە :

١ـ پێغەمبـەری ئیـسلام (محمـد) (ﷺ) کـە هۆکـار نـەما نەیگرێتـە بـەر بـۆ بەختەوەرکردنی مرۆڤایەتیو چیرۆکیش یەکێکە لەو هۆکارانە.

٢ـ پێشکەش بێت بە هەمو خوێنەرانی ئەم کتێبە.

٣ـ پێشکەش بێت بـە ئـەو کۆمەڵـە گەنجـە خوێنگەرمـەی کـە غیرەتـی ئیـسلامەتی دەیانبـات بـەرەو کـارێکی گـەورەی هونـەریو هەڵدەسـن بـە پێـشکەشکردنی زنجـیرە چیرۆکەکانی ئەم کتێبە لە شێوەی درامای تەلەفزیۆنیدا.

٤ـ پێشکەش بێت بە هـاوڕێو بـرای خۆشەویستم کـاك فـائق خـاوەنی کتێبخانـەی نارین لە هەولێر کە ئەرکی لە چاپدانی سەرجەم بەرهەمەکانی منی گرتۆتە ئەستۆ.

# ناوەڕۆك